

## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی


- **فەرهەنگی رێژگە**

- **نووسینی:** ئەمین گەردیگلانی
- **بابەت:** فەرهەنگ
- **پیتچنین:** مریەم شاسەنەم
- **بەرگ:** محەمەد هاشم
- **چاپ:** یەکەم ٢٠٠٩
- **ژمارەی سپاردن:** ٥٠٧
- **نرخ:** ٤٠٠٠ دینار
- **تیراژ:** ١٠٠٠
- **چاپخانە:** چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٣٥٧)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆک

# پێشەکی:

لەوەتا دەستم قەڵەمی گرتووە و پێم ناوەتە ڕێبازی نووسین و دنیای ئەدەبەوە، هەستم بە دەوڵەمەندی و گەورەیی زمانەکەمان کردووە و لەپاڵ ئەوەشدا خەم و پەرۆشی هەڵیچۆقاندووم کە ئەم زمانە پڕ لقوپۆپ و زیندووە بۆ ئەوەندە بێدەرەتان و لێقەوماوە، لە سەدان لاوە لێی دەپچڕن و دەمیان تێناوە. ئەوە بە جێی خۆی، نووسەرانی کەمتەرخەم و نادەرۆست و کوردی زمانی کوردی نەزانیش ئەوەندەی دیکە خەریکن بە قوڕیدا دەبەنە خوارێ و سەریان لە خۆیان و لە خەڵک شێواندووە و کەس خەتی کەس ناخوێنێتەوە و هەر کەس هەڵدەستێ دەڵێ ئەزم هەڵدەبەزم. ئەم هەموو نووسەر و شاعیرە قۆڕەدەماخ و سمێڵبابڕ و بەهەوایەشمان هەیە و خۆیان بە حافز و شکسپێر و مارکێز و پاپلۆ نێرۆدا و بۆرخێس و.. ناگۆڕنەوە، بەڵام ئەوەی بیری لێ ناکەنەوە، شێواز و یاسا و ڕێسای زمانی یەکگرتووە. هەموو بە ڕەبەی خۆیان دەیپێون و کەسیش بە دۆی خۆی ناڵێ ترشە. تا کەنگێ هەروا گێرەشێوێنی و کەس لەکەس لە گۆڕەپانی زمانەکەماندا ساز کەین. لەم شاییە تێکەولێکەیەدا هەر کەس بە هەوای خۆی هەڵپەڕێ و بیر لە تەکووزی و یەکدەنگی و یەکئاهەنگی نەکەینەوە.

لە زەمانی زەبر و زەنگ و دیکتاتۆریی سەددامدا کۆڕی زانیاری هەبوو و ئەو هەموو خزمەتەی بە زمان کرد، بەڵام ئەمڕۆ لەو بارودۆخە لەبار و خۆش و ئازادەدا، کۆڕ و لێژنەیەک نییە یاسایەک دانێ بۆ زمانی یەکگرتوو و چاپخانە و ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاڤۆکەکان ناچار کا پێڕەویی لێبکەن.

کورد یانی زمانی کوردی، جا ئێمە ئەگەر زمانەکەمان نەمێنێ ئیتر کێین و چیین؟ بوون و نەبوونمان جیاوازی چییە. کەوایە ئەم هەموو خەبات وماڵوێرانی و دەربەدەری و ئەنفال و کوشت و کوشتار و قەڵاچۆیە لەبەر چی بوو. ئەم هەموو خوێنە بۆ چی ڕژان؟ دیارە لە بەر زمانەکەمان. لەبەر ئەوەی کوردین. دەنا زۆر سانا لە زووەوە بووبووباینەتە عەرەب و عەجەم ئیتر هیچ گرفتێکمان نەدەما و وازمان لە کورد بوون دێنا و هیچ کەس نەدەبووە دژ و نەیارمان و خۆشمان و دوژمنانیشمان بە ئاسوودەیی دادەنیشتین.

هاوارە لە خۆمان گەلینە، ئەوی خۆمان بە خۆمانی دەکەین و لەو ماوەیەدا کردوومانە، هیچ دوژمنێک پێی نەکردووین. مریشک خۆی گڵ بە سەر خۆیدا نەکا، کەس پێیدا ناکا.

ئێمەش هەر واین. دەستمان کردووە بە گڵ بەسەر خۆدا کردن و خۆ لە نێو بردن. دەمار گرژی و تەعەسوبی چینایەتی و تایەفەگەری و ناوچەگەری وای کوێر کردووین چاومان نابینێ و چاومان بەرایی نادا جوانییەکانی یەکتر ببینین. هەر کەس هەڵدەستێ بە زاراوەی گوند و شارۆچکە و مەڵبەندەکەی خۆی دەنووسێ و هیچ کەس حازر نییە جوانی و باشییەکانی ئەویتر ببینێ. تۆ خودا گەلینە شوورەیی نییە لە سەدەی بیست و یەکدا هێشتا کورد زمانی یەکگرتووی خۆی نەناسیوە؟

تەنیا ئەوەندە تکا لە نووسەران و زمانەوانان و گەورە دەسەڵاتدارانی کورد دەکەم بۆ ماوەی یەک خولەک بیر بکەنەوە و لە خۆیان بپرسن کورد یانی چی؟ ئەم گێرەشێوێنی و دەمارگرژی و قۆڕەدەماخییە تا کەنگێ؟ با لە خۆمان بپرسین بەرپرسی ئەم ئاڵۆزییە کێیە؟ بۆ؟

بەم پێشەکییە توند و جینگزییانەیە ویستم تۆزێ کوڵوکۆی دەروونم هەڵڕێژم، چونکە خەمی زمانەکەمان بە جارێ ئاراوقارای لێ هەڵگرتووم و دەڵێی لەسەر پشکۆم. بە داخ و خەمەوە هەڵدەچۆقێم و خۆم دەخۆمەوە و گریانم بۆ داهاتووی زمان و فەرهەنگەکەمان دێ. من نە پسپۆڕی زمانم نە فەرهەنگنووس و شارەزای ئەو بوارە دژوارە. تەنیا وەک دڵسۆزێکی زمان و فەرهەنگی ڕەسەن و دەوڵەمەندی خۆمان قۆڵم هەڵماڵیوە و دەمهەوێ ئەوەی لە توانامدایە و لانیکەم بوونی لە نەبوونی باشترە بڵاوی بکەمەوە. وەک کەسێکی لادێیی و لەگەڵ سروشت و شاخ و داخ و جۆگەلە و کانی و زنار و زەندۆڵ و خڕ و شیوان و جاڕ و بوورە و بژوێن و مێرگ و زەنوێر و قاقڕ و کاتۆر گەورەبوو، بە بۆنی باران و گڵەسوورە و بەرامەی وەرزی بەهار و کزەی تۆفوبەندی زستان و قرچە و کۆڵەکۆڵی چلەی هاوین و هاژە و هووژی گێژەڵووکە و گژەبا و شەڕەبا و تەپوتۆزی پایز فرچکگرتوو، ئەوەی لە سروشت و زمانی خەڵکی ڕەشۆکی و جووتیار و پاڵە و سەپان و فەلا و شوانەوێڵان فێر بووم، بە پێی توانا و زانیاریی لاوازی خۆم لە گۆڕەپانی سینگی بەرینی کاغەزدا کۆیان کەمەوە و دەستیان بنێمە دەست یەک و گۆڤەند و دیلانێکی نەمرانەیان بۆ ساز کەم و هەموویان لە ژوانی گەرموگوڕی کتێبێکدا کۆ کەمەوە.

هیچ کارێک بێکەموکووڕی نییە و دڵنیام ئەم فەرهەنگۆکەی منیش هەروایە و ڕەنگە بێعەیب و خەوش نەبێ، بەڵام هەر ئەوەندەم لە دەست هاتووە و هیوادارم پسپۆڕان و زمانزانان و خاوەنڕایان هەڵەوپەڵەم بۆ ڕاست کەنەوە. بەو هیوایەی بتوانین تەواوی فەرهەنگ و وشەدان و قامووسەکان لە داهاتوودا کۆ کەینەوە و خەرمانێکی مەزن و دەوڵەمەندی لێ ساز کەین و سەر لەبەری زاراوە و بنزاراوەکانی زمانی کوردی لە خۆی بگرێ و ئێمەش ببینە خاوەنی فەرهەنگێکی غەنی و جێی متمانە. ئەگەرچی ئێستا کاتی ئەوە هاتووە لە هەموو لایەکەوە قۆڵ هەڵماڵین و بە هەرەوەزێکی بەرین و مەزن بناغەی فەرهەنگێکی وا دامەزرێنین و تەواوی

بکەین، بەڵام نازانم هۆی چییە و بۆ تا ئێستا ئەو کارە نەکراوە؟!
ئێستا کە ئەو هەلە نەڕەخساوە و نەلواوە لە سەر کارێکی ئاوا گەورە و پیرۆز کۆک بین و بە ئەنجامی بگەیەنین، لانی کەم دەتوانین هەرکام بەپێی توانا وشە و زاراوە و دەستەواژەکان کۆ کەینەوە و لە شوێنێکدا بیانپارێزین بۆ ڕۆژی خۆی.
منیش ئەوا بە پێی توانای خۆم وەسیەتەکەی مامۆستا هەژاری نەمرم لە گوێ گرتووە کە دەفەرمێ: «تۆش نەیڕژی من خۆم ئەیزانم ئەم بەرهەمە هەژارانەم کورت و کەمە و بۆیە نابێ تێر و پاراو دڵ ئاوی لێ بخواتەوە، لە وزە و هێزیدا نییە پەرسقی هەموو پرسێکت بداتەوە، زوانی کوردی زۆر لەوە دەوڵەمەندترە کە هەژارێکی وەکوو من تاک و تەنیا و ئاوارە لە نیشتمان و وەک پێویستە کوردی نەزان و تەرە لە وڵاتی بێگانە بتوانێ لە دە یەکێکی کۆ کاتەوە. حەزم دەکرد هەموو وشەی هەموو شێوەکانی کوردیم دەسکەوتایە و لە سەر ڕووپەڕی ئەم نامەم ڕابنایە؛ بەڵام بە حەز و ئارەزوو کار پێکنایە. ئەگەر باوەڕم پێ دەکەی من بەپێی هێز و توانای خوم هیچ درێخیم نەکردووە، ئەگەر خۆم لە پاڵە خۆمدا بە شەرمەزاری نەزانی و دەسکورتیم لە خزمەت کردن بە گەلی کوردم دەزانم، دەشزانم کە بێتاوانم و لەوە پترم لە دەس نایە. ناوی وشەدانەکەی خۆم ناوە: هەنبانەبۆرینە کە لە چیرۆکانا دەڵێن: هەرچیت بوێ دەستی تێخە دێتە چەنگت. جا ئەگەر بۆ وشێک گەڕیای و دەستت لە ژێر هەمانەبۆرەوە دەرچوو، تووڕە مەبە و تووڕی مەدە، هەوڵ بدە ئەوەی کە خۆت تووشی نەبووی، یان ئەوانەی کە ئەزانی لەوێدا نین، تۆ لە لاوە کۆیان کەوە و بیاننووسەوە. ئەوە خوایە، جارێکیتر من یا هەژارێکی دیکەی لە من چاتر و زاناتر لە چاپەکانی دواڕۆژدا بیانخاتە سەر.»
بۆیە منیش وەک ئاخێزگەیەک هەنبانەبۆرینەکەی مامۆستا هەژارم داناوە و ئەو وشانەی لە دووتوێی فەرهەنگەکەی ئەودا نەهاتوون و لە قەڵەم کەوتوون کۆم کردوونەتەوە و وەک مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەنزادە ناوی ناوە گوڵچنینەوە، منیش بە دوای هەژاری زانا و بەئەزموونـدا دەڕۆم و گوڵچنەوەی ئەو سەرپاڵە بەهێز و کارمەیەم؛ دڵنیاشم منیش گوڵچنەوەیەکی باش و وردبین نیم، ڕەنگە لەوە زیاتریشم پێ نەکرابێ و بۆ نەکرابێ، گەلێکی ترم گوڵوشە وەپاش دابێ و هەڵمنەگرتبێتەوە و بەجێمابێ. بۆیە ناوی ئەو فەرهەنگۆکەی خۆم ناوە «ڕێژگە» چونکە تەنیا جۆگەلەیەکی چووکەیە و دەیهەوێ بڕژێتە دەریای بەرینی فەرهەنگی هەنبانەبۆرینەوە.
بەو هیوایەی شیاوی ئەوە بێ تێکەڵ ئەو زەریا بەرینە بێ.

بۆکان ـ زستانی هەتاوی

نیشانەکانی نێو ئەم فەرهەنگە:

ف: لە شوێنێک کە شەرحی کوردی کۆتایی دێ و بۆ هاوواتا یان شەرحی فارسی هاتووە.

☜: ڕوانین بۆ وشەیەکی دیکەی هاومانای وشەکە.

(+) : بۆ وشەیەکە کە جگە لە مانای هەنبانەبۆرینە مانایەکی تری هەیە.

دانانی پیتەکان بە پێی ئەلفوبێی کوردی ڕۆنراون کە ئاوایە:

ئـــ ب، پ، ت، ج، چ، ح، خ، د، ر، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ک، گ، ل، م، ن، و، هـ ی



**ئابیده:** پەیکەرە، کۆتەڵ، هەیکەل.[ف]مجسمه، تندیس

**ئابێز:** جۆرێ کایەی مندالانە وەک شەشخان وایە و خانەی ئەم یارییە بازنەییە.[ف]نام یک بازی کودکان

**ئاپانتێز:** ریخۆڵە کوێرە.[ف]آپاندیس

**ئاپاندێز:** ڕیخۆڵە کوێرە.[ف]آپاندیس

**ئاپەر:** شێت، دین، دەلوو، خول.[ف]دیوانه

**ئاپنجی:** جۆرە عەبایەکی قەدیمی بوو.[ف]نوعی قبای قدیمی

**ئاتەران پاتەران:** پاتەران، وڕێنە، وڕاوە.[ف]هذیان

**ئاتەشەک:** ئاگرە، ئاورە، جۆرێ زیپکەیە لە دەم و چاو دێ و زنچکاوی لێ دەتکێ.[ف]نوعی جوش

**ئاتەگ:** (+) داوێنی زین کە لە سواریدا دەکەوێتە ژێر ڕانی سوار.[ف]قسمت پایین زین کە زیر ران سوارکار قرار می‌گیرد

**ئاتیوانن:** تاواندنەوە، ئاواندن، تواندنەوە.[ف]آب کردن

**ئاجزا:** جۆرێک مووروویی تەزبێحە، ئادزا.[ف]نوعی مهرەی تسبیح

**ئاچەر:** (+) هاچەر، ئامرازی پێچ کردنەوە.[ف]آچار

**ئاخاوتن:** ئاخافتن، قسە کردن.[ف]حرف زدن

**ئاخ‌تف:** تفی خەست، بەڵغەم.[ف]خلط سینه

**ئاخوڕاو:** حەوزی درێژاودرێژی هەڵبەستراو بۆ ئاو خواردنەوەی ماڵات.[ف]حوض طولانی برای آب خوردن احشام

**ئاخێزگە:** سەرچاوە، شوێنێ کە کار لەوێوە دەست پێدەکا.[ف]محل شروع کار

**ئاخێوەر:** وێژەر، قسەبێژ.[ف]سخنگو

**ئادار لەسەر پادار نەمان:** بریتی لە خاپوور بوون، تێک ڕووخان.[ف]ویران شدن

**ئادزا:** ☜ ئاجزا

**ئادگار:** ) روخسار، بیچم، دەموچاو، ) بەژن، باڵا، قەڵافەت.[ف]ا) اندام) چهرە، سیما.

**ئادە:** (+) دوڕگە، چزیرە.[ف]جزیره

**ئادیان:** ناوی هۆزێکە لە کوردستانی باکور.[ف]نام ایلی در کردستان شمالی

**ئادێنه:** مەزرای لەوەڕ خۆش، جاڕی پڕ گژ و گیا.ف مزرعەی پر از علف

**ئارا و قارا:** ئارام و ئۆقره، *(ئارا و قارای لێهەڵگیراوه.)* ف صبر و قرار

**ئارا:** (+) دوو تاڵی نێوەڕاستی تەون، گرێی نێوەڕاستی تەون.ف گره وسط قالی

**ئارا:** دوو تاڵی نێوەڕاستی تەون، گرێی نێوەڕاستی فەڕش.ف دوتا تار وسطی در قالیبافی

**ئاراسه کردن:** پێشکەش کردن، بۆ ناردن.ف فرستادن، تقدیم کردن

**ئاراسه:** ئاراسته، پێشکەش.ف ارسال، تقدیم

**ئاراگێڵ:** ئاواره، هەڵوەدا، قەلەندەر.ف قلندر

**ئارام لێبران:** ئارام لێ هەڵگیران.ف آرام وقرار نداشتن.

**ئارام لێبرین:** ئارام لێ هەڵگرتن.ف آرام وقرار از کسی گرفتن.

**ئارامگێڵ:** ئەسپی خۆشڕکێف، خۆشبەز.ف اسب بادپا

**ئاران:** (+) شوێنی بەرین و بەربڵاو، ساکەدەشت.ف دشت وسیع

**ئارتوون:** ئاگردان، ئاورگ، ئاگردانی حەمام، توون.ف تون گرمابه

**ئارتین:** بڵێسه، بڵێزه.ف زبانەی آتش

**ئارچەن:** ئاڕزەن، چەناگە.ف چانه

**ئارداڤ:** فێڵباز، گزیکار، گزەون.ف کلک باز

**ئاردال:** مێرگ، چینک.ف مرغزار

**ئاردەشێله:** ئارد و ئاو گرتنەوه بۆ درزی پەنجێره و چەسپاندنی کاغەز و پارچه و...ف آرد و آب شل

**ئاردەتوو:** توو شیرینی هاڕدراوه و تۆپەڵ کراو.ف آرد تووت

**ئاردی نێو دروو:** بریتی لە نابوود بوون و لەنێو چوون. *(کوڕه تازه وا لێیقەوما بوو به ئاردی نێو دروو.)* ف کنایه از نابود شدن

**ئارزاڵه:** ☜ ئازاڵه

**ئارزەن:** چەنه، ئارچەن، چەناگە.ف چانه

**ئارژین:** ☜ ئاژین

**ئارش:** مانا، واتا.ف معنی

**ئارشک:** قرقێنه، قرپه، قرپ.ف آروغ

**ئارڤانه:** وشتر، هوشتر، حوشتر.ف شتر

**ئارما:** دڵنیا، خاترجەم، ئارخەیان.ف خاطرجمع

**ئارماز:** ) گزمووله، گردیله قوڕ؛ ) گلۆڵه بەن و دەزوو.ف ) گلوله گل؛ ) گلوله نخ

**ئارمان:** ناوی کۆنی هەورامان.ف نام قدیم اورامان

**ئارن:** شەویلکه، شەویلاکه، یەسقانی ڕوومەت.ف فک

**ئاروان:** (+) تۆشەی سەفەر، نان و پێخۆری نێو ڕێ.ف توشەی سفر

**ئاروانلۆک:** ئاروانه، وشتری چوار ساڵه.ف آروانه

**ئارۆخته:** ڕماو، وێران، خاپوور، کاول.ف ویرانه

**ئارۆڵه:** مێوه وشتر، وشتری مێو.ف ماده شتر

**ئارۆن:** چیایەکه لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ڕەواندز.ف نام کوهی در شمال شرقی رواندز

**ئاروو:** پووک، گۆشتی دەوری ددان. ف لثه

**ئارووشە:** بزۆز، نەحەجماو، سەربزێو. ف شلوغ

**ئارووک:** میچ، بنەبان، ئاریگ. ف سقف

**ئاروین:** بە ئەزموون، تاقی کراوە. ف باتجربه

**ئارەپانە:** گۆترە، هەوەنتە، کۆترمە، ئەڵلاقۆیتاسی. ف تخمین

**ئارەقچین:** تەقیلە، کڵاوێک کە لە کەتانی سپی دروست دەکرێ و تەپڵی سەر دەگرێ. ف کلاه عرقچین

**ئارەقگیر:** (+) ژێرکراسی کەتانی کە لە ژێر جل و بەرگەوە لەبەر دەکرێ. ف عرقگیر

**ئارەمووک:** گامێشی قسر، گامێشی نەزۆک. ف گاومیش سترون

**ئارەنگ:** بەورشە، بریقەدار، پڕ ترووسکە. ف درخشان

**ئاریگ:** ئارووک، میچ، بنەبان، بنمیچ. ف سقف

**ئاز:** ) هێز، وزە، قەوەت، *(ئاز لە تێی نەماگە.)* ؛ ) سەخت، دژوار. ف ) نیرو، نا؛ ) دشوار، سخت

**ئازا:** (+) ساغ، سالم، بێ عەیب. ف سالم

**ئازارە باریکە:** دەردە باریکە، ئازاری سیل. ف سل

**ئازارە مریشک:** نەخۆشی مریشک کە ساڵی جارێک دێ و گەلێ مریشک دەمرێ. ف آنفلانزای مرغی.

**ئازاڵە:** (+) تەپاڵە، گەمرە. ف هر چیزی که از سرگین بدست آید، تەپالە

**ئازبێز:** جۆرێ کایەی منداڵانە وەک شەشخان وایە و خانەی ئەمە گردە. ف یک بازی کودکان

**ئازەو پێ هاتن:** هێز وەبەر هاتنەوە. *(نان خاس بخۆ تا ئاز بیێ ئەو پێت.)* ف نیرو گرفتن

**ئازەو:** ئازەب، عازەب، کچی جحێڵ. ف دختر جوان

**ئازەوانە:** ئازەبە، جوانەژۆ، جوانەزمە، زیپکەی دەم و چاوی جحێڵ، ئازەبەت. ف جوش عزبی

**ئازەوە:** ئازەوانە، ئازەبەت. ف جوش عزب

**ئازەوی:** ) جحێڵی، عازەبی؛ ) ئازەوانە، ئازەوە. ف ) جوانی؛ ) جوش عزب

**ئاژاژۆکە:** هاتنە خواری شتی ئاوەکی. *(ئەو چڵکاوە پیسە خێرا ئاژاژۆکەی دەکا.)* ف ریزش آب در سرازیری

**ئاژن ئاژن:** کون کون بە گوللە و دەرزی و ... هتد. ف سوراخ سوراخ

**ئاژنگ:** بادامە تاڵە. ف بادام تلخ

**ئاژیر:** وریا و ژیر، ئاقڵ و زانا. ف عاقل و دانا

**ئاژین:** (+) بەردانەوەی ئاو لە زەوی‌دا. *(شێلەگەکە هەڵبڕە با ئاوەکە لەو دەشتە ئاژین بێ.)* ف پخش کردن آب در مزرعه بەطور مساوی

**ئاسا:** (+) ئەووەختە، ئەوکاتە، ئەوسا. ف آنگاه

**ئاسارە زلە:** ئەستێرەی ڕۆژێ، ئەستێرەکە. ف ستارەی درخشان صبح

**ئاسارە:** ئەستێرە، هەسێرە، هەسارە، ستێر. ف ستاره

**ئاستار:** ئەستێرە، هەسارە، ستێر. ف ستاره

**ئاسمان قەڵێش:** باڵەخانەی زۆر بەرز و چەن نهۆم. ف آسمان خراش

**ئاسنڕفێن**: مەگناتیس.ف آهن‌ربا
**ئاسنی سارد کوتان**: بریتی لە کار و هەوڵی بێهووە.ف کنایە از زحمت بیهودە
**ئاسۆس**: چیایەکە لە نزیک شاری قەڵادزێ.ف کوهی در نزدیکی قەلادزە
**ئاسوودە بوون**: ڕەحەت بوون، بریتی لە ئاو هاتنەوە.ف انزال
**ئاسەڵا بوون**: لێ دەرهاتن، لێ بەدی هاتن.ف پدید آمدن
**ئاسەڵا بوون**: لێ دەرهاتن، لێ بەدیهاتن. *(کوڕ خاسێکی لێ ئاسەڵا بووگە.)* ف از کار درآمدە
**ئاسی**: وەڕەز، عێجز، عێذز، جاڕز، بێزار، عاجز. ف بیزار
**ئاسیاوگلێن**: ئاشگێڕ، ئەندازە ئاوێکی کە ئاشی پێ بگەڕێ. *(ئاسیاوگلێنێک ئاو وەدۆڵەکەدا تێتەخوارەو.)* ف آب آسیاب‌گردان
**ئاش بێ ئاو نانەوە**: بریتی لە کاری بێهوودە کردن.ف کنایە از کار بیهودە
**ئاشار**: حەشار، حاشار.ف مخفی‌گاە
**ئاشاردن**: وەشاردن، شاردنەوە، حەشاردان، داشاردن.ف مخفی کردن
**ئاشاریا**: شاراوە، ون، نادیار، پیوار.ف مخفی، گم
**ئاشاریاگ**: شاردراوە، بزر بوو، نادیار.ف پنهان شدە
**ئاشخاوەنار**: آش خاوەن ئارد، گەمەیەکی لاوانە.ف اسم یک بازی
**ئاشنایی سڕینەوە**: لە ئیستلاحی ئەدەبیاتدا بەو وێنە دەگوترێ کە لەمەوبەر نەبووبێتە سەنبول و هێما بۆ شتێک و بەڵکوو ئەو ئاشناییە لەگەڵ وشەکە لابردرێ.ف آشنایی‌زدایی
**ئاشۆڕە**: هەڵوەدا، ئاوارە، بەڕیدە.ف آوارە
**ئاشەڤ**: پەشۆکاو، شێواو.ف پریشان
**ئاشەکڵە**: ئاژاوەچی، ژۆڤار، ئاژاوەگێڕ، شەڕهەڵاییسێن، گێرەشێوێن.ف سخن‌چین، دوبە هم‌زن
**ئاشەوان ئاشەوان**: ئاش خاوەنار، گەمەیەکی لاوانی گوندنشینە.ف نوعی بازی
**ئاشی تس پێنانەوە**: بریتی لە تووشی گێرە و کێشە کردن و زۆر بۆ هێنان.ف کنایە از دردسر دادن زیاد
**ئاشی کرێوە**: بریتی لە خێرایی لە کار، بە دەستوبرد. *(هێندە ئازا و بە دەستوبردە دەڵێی ئاشی کرێوەیە.)* ف کنایە از سرعت زیاد در کار
**ئاشیت**: بەڵا، مسیبەت، ئاپۆر.ف آفات
**ئاشێرە کردن**: ئاماژە کردن. ئیشارە کردن ف اشارە کردن
**ئاشێرە**: ئاماژە، ئیشارە.ف اشارە
**ئاغا بە نۆکەر نەگرتن**: شاد بوون و هەست بە بەختەوەری کردن، ژیانی هەژارانە و بێخەم. *(لەگەڵ تەبیعەت هاودەمی/ شادی بە کەیفی، بێ خەمی/ ئاغاش بە نۆکەر ناگری/ وەک من لە داخا نامری «هەێمن».)* ف کنایە از زندگی شاد و فقیرانە
**ئاغاوات**: هۆز و بەرەی ئاغا و بەگان.ف ایل و تبار خان‌ها

**ئاڤار:** (+) هەمبەر، بەرانبەر.[ف] روبەرو، برابر

**ئاڤاندن:** تاواندنەوە، ئاواندن.[ف] آب کردن

**ئافرەتانە:** ژنانە، هەر شتێ تایبەتی ژن بێ.[ف] زنانه

**ئاڤرێ:** لادەر لە رێگە، لارێ، لەرێ کلابوو.[ف] منحرف

**ئاڤزێڵ:** هەسێڵ، ئەستێر، ئەستێرک، گۆلاوی بەرکانی.[ف] استخر

**ئاڤۆ:** فرمێسک، ئەسرین، رۆندک، ئەسر، ئەشک. [ف] سرشک

**ئافەتە:** بڵفەتە، تاعوون، چاوقوولکە.[ف] طاعون

**ئافەرۆز:** بێتین، ئاگردانی کوژاوە. *(ئاگردانێکی سارد و ئافەرۆز بوو.)* [ف] سردوبدون حرارت

**ئافەکەڵڵا:** ئافەرەم، بارەقەڵڵا، ئافەرین.[ف] بارک‌الله

**ئاڤیار:** هاوکار.[ف] همکار

**ئافیدە:** پاقژ، خاوێن، پاک.[ف] پاکیزه

**ئاکلە:** نەخۆشی سفلیس.[ف] بیماری سفلیس

**ئاکۆ:** ) ناوی چیایەکە لە کوردستان؛ ) ناوێکی کورانەیە.[ف] ) نام کوهی در کردستان؛ ) نامی پسرانه

**ئاکۆیی:** گۆترە، رەمەکی.[ف] تخمین بدون اندازه‌گیری

**ئاکە:** خراپ، نارەسەن.[ف] نااصیل.

**ئاکەس:** دەلاو، قەیاغ، سێسوو.[ف] اسم گیاهی باتلاقی

**ئاگر کەوتنەوە:** تەشەنە کردنی ئاور، سووتمانی گەورە.[ف] آتش‌سوزی

**ئاگر ملیچ:** خەزایی، باڵندەیەکی بەڵەکە بەقەد سیروو دەبێ.[ف] سارملخ خوار.

**ئاگر مەلووچ:** خەزایی، عەینەمەل.[ف] سار ملخ‌خوار

**ئاگر ورکردن:** ئاگر کردنەوە، ئاور هەڵکردن.[ف] آتش روشن کردن

**ئاگربەرەک:** بلۆق، پۆرگ.[ف] تاول

**ئاگربەس:** راوەستاندنی شەڕ و پێکدادان.[ف] آتش‌بس

**ئاگرورکردن:** ئاگر کردنەوە، ئاور هەڵکردن.[ف] آتش افروختن

**ئاگرە قلێ:** ئاور کردنەوەی منداڵان و هەڵسووران بە دەوریدا. *(ئاگرە قلێی خۆمانە/ گوو بە ریشی بێگانە.)* [ف] آتش روشن کردن بچه‌ها و پریدن بر رویش

**ئاگرە کەوڵ:** بریتی لە خۆشەویستیی لە رادەبەدەر. *(ئاگرە کەوڵی کورەکانییەتی.)* [ف] کنایه از دوست‌داشتن افراطی

**ئاگرە مەلوچک:** ☜ ئاگر مەلووچ

**ئاگرەقوولە:** گوڵئەستێرە، پەنگرەئەستێرە.[ف] کرم شبتاب

**ئاگرەقوون:** گوڵئەستێرە، گووئەستێرە.[ف] کرم‌شبتاب

**ئاگرەقوونە:** ☜ئاگرەقوولە

**ئاگری:** (+) ) ئاورین، ئاگرین؛ ) ژنی هەوەسباز. [ف] ) آتشین؛ ) زن بدکاره

**ئاگۆڕ و داگۆڕ:** ئاڵوگۆڕ، گۆڕینەوە.[ف] معاوضه

**ئاگوول:** فیڵ، دەهۆ، تەڵەکە، گزی.[ف] نیرنگ

**ئاگوولباز:** فێڵەباز، گزیکار، تەڵەکەباز، گزەوەن. ف کلکباز

**ئالا:** بژار، گیای هەرزەی نێو دەغڵ و بێستان هەڵکەندن. ف وجین

**ئالابووک:** ئاڵەبووک، پەڕۆی ڕەنگاوڕەنگ کە منداڵان لە بووکەباخەی دەپێچن. ف لباس عروسک

**ئالابێژ:** دابێژتنی شەکر و خاکەقەند بە پەڕۆی تەنک. ف بیختن ریزه قند با پارچه

**ئالاڤ:** کەرەسە، ئامراز، ئامێر. ف وسیله

**ئالاکەت:** بژارچن، ئامرازی بژار کردن. ف وسیلەی وجین کردن

**ئالاکەر:** ئەو کەسەی بژار دەکا، بژارچی. ف وجینگر

**ئالان کردن:** شەوچەلەی شەوانی زستان کەهەر کەس بەقەرای توانای خۆی دەکڕی و هەموو دانیشتوانی کۆڕەکە بە یەکەوە دەیانخوارد. ف شبچرەی شبهای زمستان کە هر کس بەاندازەی توان خود میخرید و با هم میخوردند

**ئاڵبۆیاغ:** سووراوی ژنان بۆ خۆ جوان کردن. ف سرخاب

**ئاڵقە:** (+) شتێکە بەدەست دەیچنن بە پەتی ڕەنگاوڕەنگ و مووروو لە ملی دەکەن. ف نوعی زیورآلات دەستباف زنانه

**ئاڵقەداغ:** جۆرێک داغی گوێچکەی ماڵاتە بۆئەوەی نەگۆڕدرێ، بەشێوەی بازنەییە. ف داغ کردن گوش بره به صورت گردی

**ئالکان:** تێک هاڵان. ف برهم پیچیدن

**ئالکاو:** شێواو، شڵەژاو. ف پریشان

**ئالنگار بوون:** لە دەوری شتێک کۆ بوونەوە بۆ خواردن، تێمرووکان، هووروژم کردنە سەر شتێک. ف حلقه زدن دور چیزی برای خوردن

**ئالۆری:** حالۆری، لات، بەتاڵپە، کەڵەگا. ف لات و ولگرد

**ئالۆزاندن:** ئالۆزکاندن، شێواندن. ف برهم زدن

**ئالۆزاو:** ئالۆسکا، ئالۆزکاو، شێواو. *(بەنەکە ئالۆزاوە.)* ف نخ برهم پیچیده

**ئالۆزکاندن:** ☜ ئالۆسکاندن

**ئالۆزکاو:** ئالۆزاو☜ ئالۆزاو

**ئالۆسکاندن:** ☜ ئالۆزکاندن

**ئالۆسکاو:** ☜ ئالۆزکاو

**ئالۆشە:** گەزەنە، گەزگەزک، گیایەکە لاسقەکەی دەخورێ. ف اسم گیاهی است

**ئالوگۆڕ:** جێگۆڕکێ و گواستنەوەی جێگا. ف تغییر مکان

**ئالووال بوونەوە:** بریتی لە بە شەرمدا کەوتن. ف خجل شدن

**ئاڵەبووک:** ☜ ئالابووک

**ئاڵەتە کێویلە:** گیایەکی گەڵا باریکە تامی تیژە و بۆ دۆکولیو دەبێ. ف اسم گیاهی است

**ئاڵەتی:** ئاڵەدین، تووڕە، قەڵس. ف کنایه از آدم عصبانی

**ئاڵەدین:** تووڕە، قەڵس، هێرس، ڕق هەستاو، ئاڵەتی. ف خشمگین

**ئاڵەکۆکە پرچنە:** جۆرێ ئاڵەکۆکە گەڵاکانی

تووکنە.ف گیاهی است شنگ مانند

**ئاڵەکۆکە مشکانە:** جۆرێ ئاڵەکۆکە بنەکەی درێژۆکەیە وەک مشک دەچێ.ف اسم گیاهی است

**ئاڵەکوڵ:** گاگلێنە، کرمێکی ژەهراوییە بەگیاوە دەنووسێ مالات بیخوا پێی دەمرێ.ف نوعی کرم سمی

**ئاڵیسکە:** زوقم، سیخوار، ئاڵشک.ف سرماریزه

**ئاڵیشت کردن:** گۆڕینەوە.ف معاوضه

**ئاڵیشت ولێشت:** ئاڵ و گۆڕ، گۆڕینەوە.ف معاوضه

**ئاڵیشت:** گۆڕان. *(قەڵەمەکەم وەل قەڵەمێکی ترا ئاڵیشت بوو.)* ف عوض

**ئالیەر:** ئانتێل.ف آنتن

**ئامورر قوفڵی:** ئامرازێکی کردنەوە و بەستنەوەی پێچ و مۆرەیە.ف آمبر قفلی

**ئامووردەست:** ئامرازێکی گرتنی پێچ و مۆرەیە وەکوو گاز وایە، بزمارپێچ.ف آمبردست

**ئامێرد:** مێردەزمە، پیرهەڤۆک، جنۆکەی پیاو ترسێن.ف غول بیابان

**ئاندرێشە:** گیایەکە وەکوو شنگ وایە.ف اسم گیاهی است

**ئانکۆ:** مانا، ئارش، واتا.ف معنی

**ئانگژا بوون:** ئاوقا بوون، بە گژدا چوون.ف گلاویز شدن

**ئاو بە ئاوردا کردن:** بریتی لە دامرکاندنی شەڕ و کێشە.ف کنایه از برطرف کردن جدال

**ئاو بە گونی سەگەوە دان:** بریتی لە کار کردن بۆ مرۆی سپڵە و پێنەزان.ف کنایه از کار کردن برای آدم سفله

**ئاو بە لێژدا هەڵگێران:** بریتی لە زوڵم و زۆر. *(ئەوە زاڵمێکە ئاو بە لێژدا هەڵدەگێرێ.)* ف کنایه از ظلم و ستم زیاد

**ئاو پا هاتن:** ئاوی پێ داهاتن. *(ئەو قەرە وسام وەپاوە، ئاو پام هات.)* ف سست شدن پا براثر ایستادن زیاد

**ئاو دەگون گەڕان:** بریتی لە بوونە پیاو، باڵغ بوونی لاو. *(کورە ئاوی دەگون گەڕاوە داوای ژن دەکا.)* ف کنایه از بالغ شدن جوان

**ئاو لە ئاوەڕۆ دەرکردن:** بێحەیایی و سەرەڕۆیی لە ڕادەبەدەر.ف بی‌حیایی بیش از حد.

**ئاو لە چاو هێنان:** بریتی لە زۆر ڕەش. *(کەوا و پاتۆڵێکی لەبەر دایە هێندە ڕەشە ئاو لە چاوی پیاو دێنێ.)* ف کنایه از بسیار سیاه

**ئاو لە دنگدا کوتان:** بریتی لە کاری بێهوودە کردن.ف آب در هاون کوبیدن

**ئاو لە گونان گەڕان:** بریتی لە بلوغ بوون، بوونە جحێڵ.ف کنایه از بالغ شدن

**ئاوار:** وشتری یەک ساڵە، کۆچەک.ف بچه شتر یک ساله

**ئاوارە:** (+) گەوهەر، بەردێکی بەنرخە.ف گوهر

**ئاواک:** بەهانە، پەڵپ، بیانوو، ورک.ف بهانه

**ئاواندن:** ☜ ئاڤاندن

**ئاواندۆڵ:** زندۆڵ، قووڵکە بەرد کە ئاوی تێدا کۆ دەبێتەوە.ف حفره‌ی سنگی که آب در آن جمع

شود

**ئاواندۆڵـە:** قووڵکـەیـەک کـە ئـاوی تێـدا کـۆ دەبێتەوە، زەندۆڵ.ف چالەای در میان سخره که آب در آن جمع می‌شود

**ئاوانە:** کرێی ئاو، حەقی ئاو.ف کرایەی آب

**ئاوبارە:** (+) دیوار کردن لەبەر ئاودا بۆئەوەی ئـاوەکـە زۆربـێ و بتـوانن بـۆ جێگـای بـەرزی بەرن.ف آب‌بند

**ئاوجـا:** هێـوەرژن، دوو ژن کـە هـەر کـام ژنـی برایەکن، براژنی مێرد.ف زن برادر شوهر

**ئاوجـاو:** گـەوج، حـەپـۆل، گـەمـژە، هـەپلـەگـون، هەقمەق، گەلحۆ.ف احمق

**ئاوجە:** هێوەرژن، ژنـی بـرای مێرد.ف زن‌برادر شوهر

**ئـاودەنگیلـە:** هـاودەنگیلـە، بریتـی لـە منـداڵی هاودەنگ و هـاوڕێ. *(بەشکوو خودا منداڵێکیان بداتێ و ببێتە ئاودەنگیلە بۆیان.)* ف همدم کوچولو

**ئاودیان:** ئەشکەوتێکە لە نزیک شاری ڕەواندز. ف نام غاری است

**ئاور کردنەوە:** ) بریتی لە هەڵاییساندنی فیتنـە، ) بریتی لەزۆرهێنان و یاخی بوون ) کچێک کە بۆ گرتنی دۆست شەرم و شکۆی نەمابێ.ف ) فتنـه بـەراه انـداختن؛ ) یـاغیگری، ) دختـری کـه بـرای عشق‌بازی ابا ندارد

**ئاور لێ بوونەوە:** بریتی لە تـووڕە بـوونی زۆر، *(هێندە تووڕەیە ئاوری لێ دەبێتـەوە.)* ف آتش بـه جان شدن

**ئاورگە:** کوانووی نێو دیوار.ف شومینه

**ئاورۆچکـە:** ئـاوری منـداڵان، ئـاوری چکۆڵـە.ف آتش روشن کردن بچەها

**ئاورە:** (+) نـەخۆشـییەکی نۆکە وشـکی دەکـا.ف آفت نخود

**ئاوری ژێر کا:** ئاگری بن کا، مایـە فیتنـە، سـەرە سۆدرە.ف کنایه از فتنه برانگیز

**ئاوڕێژ:** گیایەکە لـەنێو مێرگدا دەڕوێ لاسـقی لـووس و بـەرزە و نێـو هـەڵوڵـە.ف اسـم گیـاهی است

**ئاوزێم:** ) ئاوبڕان، کاتی کـەم بوونـەوەی ئـاو لـە هاوینـدا؛ ) چـۆمێ کـە هاوینـان وشـک دەکـا، ویشکەڕۆ.ف ) هنگام کم شدن آب در تابستان؛ ) رودخانەای که در تابستان می‌خشکد

**ئاوسان:** هـەڵچـوونی نرخ، گران بـوونی کاڵا.ف تورم

**ئاوسانە:** حەقایەت، خەبەرۆشک.ف افسانه

**ئاوشە:** شەونم، ئاونگ.ف شبنم

**ئاوقەرا:** هاواڵ، هاوتا، هەڤاڵ.ف رفیق

**ئاوکووف:** بەقەرا یەک، هاوکێش.ف هم‌وزن

**ئاوگەز:** میوەیەک کە لەنێو باردا ڕێک گوشـرابێ و لایەکی وەک ڕزیوی لـێهـاتبێ.ف میـوەای کـه در میان بار آسیب دیده باشد

**ئاوەخۆر:** چارەنووس، بەخت.ف سرنوشت

**ئاوەڕۆگە:** ئاوەڕۆ، ڕێگەی پێداڕۆیشتنی ئـاو.ف آبراه

**ئاوەژێ:** ) گیاندارێک کە لـە نێـو ئـاودا دەژی، ) ناوچەیەکە لـە نزیـک مـەرگـەی سـەر بـە شـاری قـەڵادزێ.ف ) آبـزی( نـام منطقـەای در نزدیکـی

مرگەی قلادزه

**ئاوەشەم:** ئەوجێگەی ئاوی ئاشی پێدا دەڕواتە دەرەوە.ف محل خروج آب از آسیاب

**ئاوەڵ منداڵ:** پزدانی ژن کە لەگەڵ منداڵەکە دێتە دەرێ.ف بچەدان

**ئاوەڵ:** (+) خڕ، شیو، گەڵی.ف دره

**ئاوەڵ:** (+) قەیاخ، دەڵاو، گیایەکە لەنێو ئاودا شین دەبێ.ف نوعی گیاه باتلاقی

**ئاوەڵدوانە:** جمک، دوو منال کە بە زگێک بووبێتن.ف دوقلو

**ئاوەڵمە:** دەڵەمە، هێلکەی بێ تێخوڵ کە مریشک دایدەنێ.ف دلمه

**ئاوەڵواتا:** وشەیەک کە دوو مانای هەبێ، هاومانا.ف مترادف

**ئاوەلەمە:** منال لەنێو زگی دایکدا بەرلە گووران.ف جنین

**ئاوەن:** ئاونگ، دەسکاونگ.ف هاون

**ئاوی بێلەغاو خواردنەوە:** بریتی لە ئازاد بوون و بێگیر و گرفتی لە ژیاندا و بە کەیفی خۆ ڕابواردن.ف کنایە از آزاد بودن و بدون قید و بند

**ئاوی پێ داهاتن:** ئاو پیا هاتن. *(هەموو ڕۆژێ لەبەر سەیری بتی ئەو بەژنوباڵایە/ لەسەر ڕێدا دەوەستم من هەتاکوو ئاوی پێم دایە «ئەحمەد هەردی» .)* ف ☜ ئاو پیا هاتن

**ئاوی چاو بردن:** بریتی لە جوانیی زۆر. *(هێندە جوانە ئاوی چاو دەبا.)* ف کنایە از بسیار زیبا

**ئاوی گوێ دادان:** پەند پێدان، نەسیحەت کردن. ف پند و اندرز دادن.

**ئاوێزە:** ) بانـدۆڵی سـەعـات ) شووشـەی شـەبـەنگـی دەوری چراوگڵـۆپ ) شـەبـەنـگ، مووشوور ف) پاندول، ) لوستر ) طیف

**ئاوێش:** دەوا، دەرمان.ف دارو

**ئاوێنە:** (+) ئامرازێکی مەکینەی خەیاتییە بەسەر ددانەدا دەکرێ و نووکی ددانە لە کونەکانیەوە دێتە دەرێ و پارچەکە ڕادەدا.ف صفحەی کارپیش‌بر

**ئاهۆن:** ئـەهـوەن، هـێمن، هێـدی، ئـارام، لەسەرەخۆ.ف آرام

**ئایەخ:** رەهەندی ئاو، کەرێز.ف کهریز

**ئایەختە:** ڕووت و قووت و بێبەرگ.ف عریان

**ئایەرە:** پێوانە، پێوەر، پەیمانە.ف پیمانه

**ئایەغ:** بەشی خراپ لە چاک جیا کردنەوە، ئەیاغ، شتی لە برەو کەوتوو.ف نامرغوب

**ئراز:** بوغز، ئوناق، گیرانی گەروو بەهۆی خەم و خەفەت.ف بغض

**ئرمس:** ئەسرین، ئەسر، هیستر، رۆندک، ئەشک، فرمێسک.ف اشک، سرشک

**ئریشت:** هێـرش، هـەڵمـەت، هۆمـەن. شـاڵاو، پەلامار.ف یورش

**ئزرەو:** دەردە باریکە، ئازارە باریکە، سیل.ف سل

**ئزرەودار:** سیلاوی، سیلدار.ف مسلول

**ئزمەت گرتن:** ڕێز گرتن، قەدر گرتن.ف احترام گذاشتن

**ئزمەت:** ڕێز، قەدر.ف احترام

**ئشکەف**: تەشتی هەویر تێدا شێلان، سوێنە.ف تشت سفالی مخصوص خمیر کردن آرد

**ئشکەفت**: ئەشکەوت.ف غار

**ئۆئەزیفە**: ئەو خۆراک و جل و بەرگ و کەلوپەلەی ماڵی زاوا بەر لە زەماوەند دەینێرن بۆ ماڵی بووک.ف مقادیری مواد غذایی و پوشاک کە داماد قبل از عروسی بە خانەی عروس می‌فرستد

**ئۆبەرە**: لێفە، ڕەحێف، پێخەف.ف لحاف

**ئورتا**: گەردەنە، بستوو، زینوو، ملەی کێو.ف گردنەی کوە.

**ئورسی**: کەوشی چەرمی.ف کفش چرمی.

**ئورغان**: لێفە، ڕەحێف، ئۆبەرە.ف لحاف

**ئۆرقم**: جووڵە، تەکان. جمە.ف جنبش

**ئۆزۆر**: ئازار، جەزرەبە، ئێش و ژان.ف درد و رنج

**ئوستوورە**: ئەفسانە و دیرۆکی لەمێژینە.ف اسطورە

**ئۆغر برین**: ناوی یارییەکی ئەسپ سواری بوو شوێنێکیان وەک چوارڕێ دادەنا و یەکی سەد هەنگاو دوور دەکەوتنەوە و دەبوو ڕاست و چەپ بە پڕتاو بێن تاکوو بزانن کامیان زووتر لە خاڵەکە تێدەپەڕێ، جاری وابوو بە یەکدا دەدران و سوار و ئەسپ لە بەین دەچوون.ف نوعی مسابقە اسب سواری

**ئولک**: چەپەر، تامان، تەیمان، پەرژین، درگا و دیواری لە شووڵ دروست کراو.ف پرچین

**ئوندا**: گوم، پیوار، بزر، ون.ف گم، ناپیدا

**ئووارە**: ) ئاوبارە، بەربەند بۆ کۆ کردنەوەی ئاو تاکوو زەویی بەرزی پێبدێرن) لێژاو، دژاو، زەوییەک کە ئاوی بۆ ناچێ، دێم.ف ) آب بند ) زمین دیم.

**ئووپشکن**: ئاوپرژێن، ئاوپژێن.ف آب‌پاشی.

**ئۆوتاڤ**: تاڤگە، سۆلاف، قەڵپەزە، ئاوهەڵدێر.ف آبشار

**ئۆوتمۆن**: هاویشتمان، خستمان، ئاویتمان.ف انداختیم

**ئۆوتن**: هاویشتن، ئاویشتن، فڕێ دان.ف انداختن

**ئوور**: ) هەور، ) سەروو، باڵا. ف) ابر ) بالا

**ئوورهەتن**: ) هاتنە سەر، وەسەر کەوتن؛ ) ڕوانی گیا، سەرهەڵدانی گیا و گژ؛ ) هەلاتنی خۆر؛ ٤) هەلاتنی هەویر؛ ٥) ماسین، پەنەمین.ف ) بالا آمدن؛ ) روئیدن گیاه؛ ) طلوع خورشید؛ ٤) بالا آمدن خمیر نان؛ ٥) باد کردن، آماسیدن

**ئوورزیاین**: ئاوا بوون، بۆ ئاوا بوونی خۆر دەگوترێ.ف فرو رفتن خورشید، غروب کردن.

**ئووسار**: هەوسار، ڕەشمە، ئەوسار.ف افسار، زمام

**ئوون**: بەهانە، بیانوو، ورک، پەڵپ.ف بهانە

**ئووە**: شەونم، ئاونگ، ئاوشە.ف شبنم

**ئووەڕوویت**: ئاوەڕووت، مریشک لە ئاوی کوڵاتوو خستن بۆئەوەی پەڕ و پۆکەی لێ بێتەوە.ف پر کندن مرغ سر بریده در آب جوش

**ئەبرەش**: ژن یان ئاژەڵێ کە تازە زابێ و شیری تێدا نەبێ.ف زن یا دام تازە زاییده و بی‌شیر

**ئەتوار لەق**: ئاکار ناحەز، بەد ڕەوشت.ف بد رفتار

**ئەتووخەتوو**: سەرکۆنە، سەرزەنشت، لۆمە. *(خاس کەی خراوکەی مەردم ئایەم ئەتووخەتوو کەن.)* ف سرزنش

**ئەجاب**: ☜ ئەجاو

**ئەجاو کردن**: شەرم کردن. *(لە خودا ئەجاو کە.)* ف شرم کردن

**ئەجاو**: شەرم، حەیا، فەدی. *(هەی بانووی بێعەیب پەردەی ئەجاو هەی/ هەی مەنیجەی دوخت ئەفراسیاو هەی.)* ف شرم، حیا

**ئەجاودار**: بەحەیا، بەشەرم، ئابڕوودار.ف باکرامت

**ئەجکاندن**: قڕ تێ خستن، تەفر و توونا کردن.ف از بین بردن

**ئەحمەد ڕاوکەر**: باڵدارێکی لاق درێژی پێ بە پەردەیە لە قەراغ ئاوان دەژی.ف گیلانشاه بزرگ

**ئەدگار**: ئادگار، بیچم، سەر و پۆتراک.ف چهره

**ئەرتەو**: بەهانە، پەڵپ، بیانوو.ف بهانه

**ئەرجن**: جۆرێ داری بێشەیە، وەک قەیسی وایە، بەڵام داری ئەو سەختترە.ف نوعی درخت جنگلی

**ئەرخەنناس**: زۆرزان و فێڵەباز، جادووباز، موقرباز. *(پیرێژن ئەرخەنناسن/ هەموو دەرکان دەناسن/ هەروەک شێنە دووکەڵێ/ هەموو دەرکان دەگەڕێ/ هەر من کێژێک ساز دەکەم/ ئەو بۆ کوڕەکەی پێدەڵێ «بەیتی کیژ و کوڕ».)* ف مکار، جادوگر، الخناس.

**ئەرخەوان سوور**: (+) سێڵاوی بەهاران کە هەڵدەستێ و لیڵ و مەیلەو سوورە. *(ئەرخەوان سووری بەهارە جەغەتووی فرمێسکم/ ئەوی سامانی دڵە بردی هەمووی فرمێسکم «بۆران»)* ف سیلاب بهاری که گل‌آلود است

**ئەردەڵان**: ) ناوی تیرە و تایفەیەکی بەناوبانگی کوردن لە سنە و دەوروبەری نیشتەجێن؛ ) ناوی کوڕانە.ف ) نام طایفه‌ای معروف در سنندج و اطراف آن؛ ) نام پسرانه

**ئەرژن**: ناوی دارێکە بەرێکی وەک بادام دەگرێ بۆ دەرمان دەبێ.ف نام درختی است

**ئەرڤا**: چوست و چالاک، گورجوگوڵ.ف چابک

**ئەرمان**: بەرەحم، دڵۆڤان. *(ئەڵڵا ئەرمان/ لەجێی نەرمان/ یان کا کۆن بێ / یان جێ خەرمان«فۆلکلۆر».)* ف مهربان

**ئەروو**: دۆست، ئاشنا، ناسیاو.ف آشنا

**ئەرەمک**: نەزۆک، نەزا.ف نازا

**ئەرێز**: پان و بەرین، هەراو.ف عریض

**ئەرین**: نەڕڕەشێر، شێری گەورەی بە یاڵ و بژ.ف شیر شرزه

**ئەرێنی**: پۆزەتیڤ، موسبەتف مثبت

**ئەزبووە**: ئەزبێ، ئەزبۆڵە، ناوی گیایەکە.ف ازبیه

**ئەزدا**: ناوی گیایەکی مەیلەو زەردە بۆ دەرمان دەبێ.ف نام گیاهی است

**ئەزرەبە**: جەزرەبە. ئازار.ف اذیت

**ئەزرەت**: ئارەزوو، حەزرەت، تاسە.ف اشتیاق

**ئەزمڕ**: چیایەکە لە باکووری شاری سلێمانی.ف

کوهی در شمال شهر سلیمانیه

**ئەزمێن:** ئاسمان، حەوا، ئەزمان، عاسمان.ف آسمان

**ئەزنیف:** یارییەکە وەک دۆمینە وایە، بە مۆرەی دۆمینە دەیکەن.ف نوعی بازی با مهرەی دومینو

**ئەژار:** خەرمان، شوێنی کۆ کردنەوەی دغڵ و دان.ف خرمن

**ئەژدەر:** ) ماری گەورە، حەزیا، هەژدیها، حەفی؛ ) ئالا.ف ) اژدها؛ ) پرچم، علم.

**ئەژگەڵ:** ) ئەژگەڵک؛ ) لات و ئاکار ناشیرین، خوێڕی و بێکارە.ف ) خس و خاشاک؛ ) آدم هرجایی و لات

**ئەژگەڵک:** چڕ و چیلکە، هەژگ و بژاڵ، هەژگەڵ. ف خس و خاشاک

**ئەژناس:** ناسیاو، دیوناس، ئاشنا، ئەروو.ف آشنا

**ئەژنۆ رووتە:** قامکی ناوەڕاست، دۆڵە درێژە.ف انگشت وسطی

**ئەژەسەرێ:** نیوەشەو، شەو درەنگان.ف نصف‌شب

**ئەژەسەرێ:** نیوەشەو، شەو زرینگانەوە.ف نیمەشب

**ئەساتیر:** ئەفسانە و نەزیلە و سەرگوریشتەی پاڵەوان و دێو و درنج و خوداکانی کەونارا.ف اساطیر

**ئەسارە:** ئەستێرە. ☜ ئاسارە

**ئەسپار:** بڕینی چڵ و پۆپی دار، قەمچ کردن.ف هرس کردن

**ئەسپڵ:** سپڵ، گورگ نەخۆرە.ف طحال

**ئەسپنگە بەنە:** جۆرێک شنگی گەڵا باریکە لە شنگی دیکە تام خۆشترە.ف نوعی شنگ

**ئەسپنگە ماینە:** شنگە مایانە، گیایەکە لەنێو مێرگ و وێنجەدا شین دەبێ شیرێکی ڕەشی هەیە لاسقەکەی دەخوری.ف نام گیاهی خوردنی

**ئەستۆبەند:** ملبەند، تۆق، گەردانە.ف گردنبند

**ئەستوند:** ئەستوون، کۆڵەکە، پاژەر، ئەستونگ. ف ستون

**ئەستەمبوڵی:** ) تەشتێکی چکۆڵەیە لە کاری بەنایی و قوڕەکاریدا مالاتی پێدەکێشن؛ ) چێشتی برینج و هێڕەڵماسی و گۆشت.ف ) ظرف کشیدن مالات در کار بنایی؛ ) غذای استامبولی

**ئەستەمبوار:** بواری دژوار، شوێنی پەڕینەوەی ئەستەم لە چۆم.ف محل دشوار در رودخانه برای گذر کردن

**ئەستێ:** (+) ئاوگەردان، کەوچکی گەورە.ف ملاقە بزرگ

**ئەستێرک:** شوقەلەت، هەرزاڵ، پێڕک.ف سکوی چوبی در خانە برای اثاثیە.

**ئەستیلکە:** گۆلاوی بەر کانی، ئەستێر، هەسێڵ، ئاڤژێڵ.ف استخر

**ئەستێوڵک:** ئەستوێڵک، ئاسنێکی درێژ و باریکە دەیخەنە سەر تەندوور و کوانوو کتری و قابلەمەی لەسەر دادەنێن بۆ کوڵاندن (کیژی

خەڵکی بۆمی ئاتۆمی دروست کرد و ئەتۆش/ هەر دەزانی ناوی ئەستێوڵک و دەرخۆنە و پنە «هـێمن») .ف میلـەای اسـت روی تنـور می‌اندازند.

**ئەسکوند:** چاڵ، قووڵک، کەند و لەند.ف چاله

**ئەسکە:** ئەوکاتە، ئەوساکە، ئەووەختە، ئاسا.ف آن زمان

**ئەسڵمەن:** عەسڵ، ئەسڵ، رەسەن، نەجیم. *(فرە ژنێکی ئەجاودار و ئەسڵمەنە.)* ف اصیل، نجیب

**ئەسلێرک:** ئامرازێکی دار تاشینە.ف وسیله‌ای برای تراشیدن چوب

**ئەسمەرە:** سەوزە، ڕەشئەسمەر، ڕەشتاڵە.ف سبزەرو، گندم‌گون

**ئەسە:** ☜ ئەسکە

**ئەسەح:** ڕاست و دروست. *(قسەکانی ئەسەح وایە.)* ف راست

**ئەسەدوا:** تکا، رەجا، خوایشت. *(ئەسەدوا دیرم ئی‌کارە ئەڕام ئەنجام بەی.)* ف خواهش

**ئەشکەپووز:** بریتی لە تەژەی ناقۆڵا، زەبەلاحی نابار، زلحۆرت.ف لندهور

**ئەغد گرتن:** ئەندازە گرتن. *(ئەغدی بگرە بزانە چەنی بەش کێگ.)* ف اندازه گرفتن

**ئەغد:** قاس، ئەندازە.ف اندازه

**ئەفاقە کردن:** ماریجە کردن، چارەسەر کردن.ف معالجه کردن

**ئەفاقە:** چارە، عیلاج، ماریجە. *(دەردێ گرتییە لای هیچ حەکیمێ ئەفاقەی نەوگ.)* ف علاج

**ئەفرەس:** ناوی دارێکە هەمیشە سەوزە.ف نام درختی است

**ئەقرەبا:** خزم و کەس و کار، تایەفە.ف قوم و خویش

**ئەقڵ:** (+) فام، ئاوەز، هیر.ف عقل، فهم

**ئەقڵدار:** عاقڵ، فامیدە، بە ئاوەز.ف عاقل، فهیم

**ئەقڵسووک:** شێتۆکە، نەفام، بێ‌مێشک.ف نادان

**ئەکوان:** زنجیرە چیا، کێوان.ف رشته‌کوه

**ئەگلەنجە:** شایی، گۆڤەند، حەپلە.ف رقص و پایکوبی

**ئەگەرمەگەر:** ئەگەرونەگەر، دووبەختەکی. *(هاتنیان ئەگەر مەگەرە.)* ف باید و شاید

**ئەگەرونەگەر:** ئەگەرمەگەر☜ ئەگەر مەگەر

**ئەلاجەو:** سەیر و سەمەرە، عەجایب.ف عجیب و غریب

**ئەلاحیدە:** تایبەتی، جیاواز، بەجیا.ف علیحده

**ئەلاژیان:** ڕاکشان، ڕازان، تخێڵ بوون، ڕەهێڵ بوون، خۆ درێژ کردن.ف دراز کشیدن

**ئەلاسکە:** نوقڵی دەسکدار، چوکڵەقنگە، شەربەتی لە پەرداخدا بەستووی دەسکدار کە منداڵ زۆری حەز پێ‌دەکەن.ف آبنبات چوبی یخی

**ئەڵبەت:** هەڵبەت، ڕەنگە، وێدەچێ. *(ئەڵبەت کابرا خۆی ڕازییە.)* ف البته

**ئەڵبەتە:** ☜ ئەڵبەت

**ئەڵبەکی:** مەنجەڵ، قازان.ف دیگ

**ئەڵپاچین:** هەڵپاچین، قەڵت قەڵت کردن.ف برش نامرتب موی سر

**ئەڵپڕووگیاگ:** خەجلاو، شڵەژاو.ف خجل شده

**ئەڵپرووگیان**: خەجلان، خەجڵین، شڵەژان. *(ئەڵپرووگیاو دەمی قسە نەکرت.)* ف خجل شدن

**ئەڵپشانن**: پرژاندن، لێپرژاندن. *(دیسان ئاوگە لێمان هەڵپشانی.)* ف پاشیدن

**ئەڵپەڕ و داپەڕ**: هەڵبەز و دابەز. ف جست و خیز

**ئەڵپەڕگە**: هەڵپەڕکێ، دیلان، گۆڤەند، شایی. ف پایکوبی

**ئەڵپەڕین**: هەڵپەڕین. شایی کردن. ف رقصیدن

**ئەڵتیزگانن**: هەڵتیزاندن، *(قاترەکە باشە بەڵام ئەڵتیزگێنێ.)* ف رم کردن و فرار الاغ

**ئەلچاغ**: ئاڵچاغ، بێئابڕوو، بێحەیا ف بی‌حیا، بی‌آبرو

**ئەڵشکاگ**: نابووت بوو، لە دارایی کەفتگ. ف ورشکست شده

**ئەڵشکانن**: بەرشکەست کردن، لەنێو بردن. ف ورشکست کردن

**ئەڵشکیان**: نابووت بوون، *(پارەکە ئەڵشکیا، وەلێ ئەمساڵ دەوڵەمەنە.)* ف ورشکست شده

**ئەڵقەپانن**: ڕفاندن، قاپاندن. *(کتاوەکە لە دەستم ئەڵقەپان.)* ف قاپیدن

**ئەڵلاوەیسی**: ناوی مەقامێکی گۆرانیی کوردییە. ف اسم یک آهنگ کردی.

**ئەلوو**: هەڵۆ، باز. ف عقاب

**ئەلها**: ) ئارەزووی دیتنی کەسێک لە سەرەمەرگا) تاسە، ئیشتیا، مگێز، تامەزرۆیی. ف ) آرزوی دیدار کسی در واپسین ) اشتیاق.

**ئەلەکە**: هەلەکەسەما، سەقر، واشە، باشوو. ف چرخ، قرقی

**ئەلەگەو**: ) نێوی گیایەکە؛ ) ناوی چیایەکە لە نزیک ئارارات. ف ) اسم گیاهی است؛ ) اسم کوهی است

**ئەلەند**: ) تیشکی خۆر، پرشنگی هەتاو؛ ) چۆمێکە لە نزیک شاری سەلماس. ف ) نور خورشید؛ ) رودخانه‌ای در نزدیکی شهر سلماس

**ئەڵەند**: کازیوە، ڕووناکیی بەرەبەیان. ف سپیده

**ئەڵهێ**: گۆڕیچە. ف لحد

**ئەلیشیش**: عەلەشیش، قەلەموونە، بۆقلە. ف بوقلمون نر

**ئەمری خودا کردن(بەجێ هێنان)** : مردن، کۆچی دوایی کردن. ف وفات کردن

**ئەمزووک**: مۆدنە، دەمنە، دار سیغار. *(جغارە کێشان بەبێ ئەمزووک خاس نییە.)* ف چوب سیگار

**ئەملەس**: نۆکەر، کارەکەر. ف نوکر

**ئەمناک**: ئەمن، بێترس، هێمن. *(دنیا ئەمناکەو بووگە.)* ف امن

**ئەمەڵی**: عەمبەڵی، کەسێ کە لە خۆراک و شت و مەک دوودڵ و بە بێزە. ف وسواس

**ئەمیرتانج**: خەمیرێکە بۆ چەور کردنی ڕۆماتیسم. ف ویکس

**ئەنایشتە**: خۆراکی بەیانیان، ناشتا. *(ئەنایشتەی شەوەکییان سێ نانە.)* ف ناشتا

**ئەنجگ ئەنجگ**: ئەنجن ئەنجن، لەتلەت. *(لەشی ئەنجگ ئەنجگ بووگە.)* ف پارە پارە

**ئەنجەرە**: گەزەنە، ئاڵۆشە، گیایەکە لاسقەکەی بە

شلکی دەخورێ.ف اسم گیاهی است

**ئەنگرۆزە:** پارچەیەکی قەدیمی ژنانە بوو.ف اسم پارچەای قدیمی

**ئەنگژین:** توورە بوون، عنرین، ڕق هەستان.ف خشمگین شدن

**ئەنگلات:** چاوەڕوان، چەمەڕا، چاوەنوار.ف چشم‌بەراه

**ئەننەهوو:** هەروەک نەبێ، هەر دەڵێی. *(ئەننەهوو لەگەڵ تۆشم نییە.)* ف انکار

**ئەنوا:** (+) ماڵ، سامان، هەیی.ف ثروت

**ئەنوابڕ بوون:** هەژار بوون، فەقیر بوون.ف تهی‌دست شدن

**ئەنوابڕ کردن:** فەقیر کردن، ماڵ بەدەست نەهێشتن.ف غارت کردن

**ئەنوو کردن:** سواخ دان، ساف و لوس کردنی دیوار.ف گل اندود کردن دیوار

**ئەنیا:** هێز و گوڕ، وزە و توانا.ف رمق

**ئەو:** (+) وشەیەکە ژنان بەجێگەی وشەی مێرد بەکاری دەبەن، *(ئەو چۆتە سەفەر.)* ف کلمەای در محاورەی زنان بەجای شوهر بەکار می‌برند

**ئەوانگەل:** لەمەچێتر، جندۆکە، ف از ما بهتران

**ئەوراد:** ورتە ورت و دۆعا کردن لەبەرخۆوە، پاڕانەوە و دۆعا کردن.ف ورد و دعا

**ئەورام:** کەرەسە، کەل و پەلی پێویست.ف تدارکات

**ئەوژوو:** هێز و توانا، برشت، وزە.ف توان، رمق

**ئەوناق:** ئۆناق، بوغز، ڕق.ف بغض

**ئەهوەن:** ئاهۆن، ئەهۆن، هێدی، لەسەرەخۆ.ف آرام

**ئەیا:** دایک، داڵک، ئۆدا، داک.ف مادر

**ئیبلیس:** شەیتان، شەیتانی گەورە.ف ابلیس

**ئیتۆن:** کوێر، شڤرەشکی، کۆر.ف کور

**ئیختیار:** پیر، زورهان، بەساڵاچوو.ف آدم مسن، پیر

**ئیدەرەم:** ئیسەرەم، پێچەقاندن.ف پافشاری

**ئیرشت:** هێرش، ☜ ئریشت

**ئیرنگە:** هەنووکە، ئێستا، نهۆ.ف حالا، اکنون

**ئیرەنگە:** ئەلحان، ئێستا.ف حالا، اکنون

**ئیزراب:** خۆ نواندن، خۆ نیشان‌دان.ف خودنمایی

**ئیستی:** ئەستۆ، مل، گەردن.ف گردن

**ئیستیفا:** ) مووررووی جوان بە ڕەنگی سوور و پەمەیی وەک کارەبا وایە؛ ) ناوێکی ژنانەیە.ف ) نوعی مهرەی زینتی؛ ) نامی زنانه

**ئیسکە:** ئێستاکە، ئەلعانەکە.ف هم اکنون

**ئێسکی نێو برین:** بریتی لە ملۆزم، کەسێ کە دایمە مایەی دەردیسەری و ناڕەحەتییە.ف کنایه از کسی که همیشه مزاحم باشد

**ئیسە:** ئێستا، ئەلعان.ف اکنون

**ئیسەرەم:** پێ چەقاندن، حوکم کردن، ئیدەرەم، سوور بوون و پێداگری لەسەر کارێک. *(ئیسەرەمی کردووە دەڵێ هەر دەچم.)* ف اصرار کردن

**ئیشک هەڵگەڕان:** وشک هەڵاتن، وشک بوون.ف خشکیدن

**ئیشکاوس:** ئەستێور، ئاژەڵێ کە بۆ ئاوس بوون ساڵ بوێری کردووە.ف سترون یک ساله

**ئیشکه پڵاو**: کەتە، پڵاوی بێڕۆن.ف کته

**ئیشکه چۆم**: وشکەڕۆ، چۆمێ کە هاوینان وشک دەکا.ف رودخانەای کە در تابستان میخشکد

**ئیشکه داوەت**: هەڵپەڕکێی بێ ژن.ف رقص گروهی مردان

**ئیشکه سەما**: خۆ شاد و بە کەیف نیشاندان لەخۆڕایی.ف اظهار شادی کردن بیسبب

**ئیشکه وەرد**: خەفتان، وشکەکێڵ.ف شخم در زمین خشک

**ئیشکەبار**: وشکەبار، میوەی وشکەبار وەک بادام و گوێز و مێوژ و ...ف خشکبار

**ئیشکەچن**: وشکە کەڵەک، دیواری بەردی بێقوڕ.ف دیوار سنگی

**ئیشکەڕێ**: ڕێگای سەخت و بەردەڵان و لێژ.ف راه سنگلاخ و ناهموار

**ئیشکەشیو**: وشکەخڕ، شیوێ کە هاوێنان ئاوی پێدا نایە.ف جویی کە در تابستان آب ندارد

**ئیشکەکەند**: وشکەکێڵ، وشکە وەرد، شێوەردێک کە بە وشکی کێڵدرابێ.ف زمینی کە خشک شخم زده باشند

**ئیشکیل**: فێڵ، تەڵەکە، دەهۆ، ئاگوول.ف نیرنگ

**ئیلاقه**: بوختان، تۆمەت.ف بهتان

**ئیلمه**: پۆ، گرێی پۆ.ف پود

**ئیلیگی**: شێعر و گۆرانیی خەماوی، وایلۆک.ف مرثیه

**ئیمان هەردە بوون**: لە دین دەرچوون، بریتی لە زۆر تووڕە بوون.ف بسیار عصبانی

**ئینکەبەرایەتی**: ئینکەبەری، ڕقەبەرایەتی، ڕقەبەری.ف رقابت کینەتوزانه

**ئێوەت**: بارهێنان، ڕاهێنان، عاملاندن.ف تربیت

**ئێوەتکەر**: بارهێنەر.ف مربی.

**ئێوەر**: بەڵگە، قەواڵە، قەباڵە.ف سند، قباله



**با تێ‌کردن**: ) پێدا هەڵکوتن و فریو دان، تاریف کردنی بە درۆ. *(بە درۆ هێندەم تاریف کرد، بام تێ‌کرد.)* ؛ ) داخ نانە سەر دڵ، تووشی خەفەت کردن.[ف] ) تعریف دروغین از کسی؛ ) داغ روی دل کسی گذاشتن

**بابادەم**: بابەدەم، ئادەم.[ف] آدم

**بابۆ**: (+) بۆن هەڵگرتنی توڵە و سەگ لەدوای ڕاو.[ف] بو کردن سگ و یوز

**بابۆس**: ) ناوی چیایەکە لە نزیک شاری بانە؛ ) ناوی خێڵێکە لە کوردستانی باکوور.[ف] ) نام کوهی در نزدیکی بانه؛ ) نام ایلی در کردستان شمالی

**بابەدەم**: بابادەم. ☜ بابادەم

**بابەڕۆ**: باوکەڕۆ، وشەیەکە لە کاتی مردنی باوکدا دەیڵێن.[ف] کلمه شیون و عزا

**بابەکۆش**: دۆعایەکی ژنانەیە. *(یاخوا بابەکۆش بێ.)* یانی قەت منداڵ نەیەتە کۆشت و وەجاخ‌کوێر بی.[ف] نفرین زنانه، یعنی بچه در دامن خود نبینی

**باپۆرە**: غەوارە، لاوەکی، تاچیک، بێگانە.[ف] ناشناس، بیگانه

**باپیلیک**: گێژەڵووکە، گەردەلوول، بابلیسک، باگەڕ، گێژەبا، باهۆز، گێژەڵە، گەردەبل، گەژگەڕینگ، باگێژە، زەمەن، شایی جندۆکان، سایلکۆن، باگڕۆکە، گەڕەپێچ.[ف] گردباد

**باتر**: دارێکە وەکوو سنگ سەرێکی تیژ دەکەن و لەجێگەی نەرم وەک نێزە لە زەویی دەدەن، باتری هەر کەس زیاتر لە زەوی بچێتە خوارێ بەرەندەیە.[ف] چوبی کوتاه، مانند نیزه در بازی از آن استفاده می‌کنند

**باترێن**: یارییەکی گەنجانی کوردەوارییە بە باتر دەکرێ.[ف] بازی که با چوبی مانند نیزه انجام می‌شود و چوب هر کس بیشتر در زمین فرو رود برنده است

**باتل**: باتر ☜ باتر

**باتلاک**: باتلاغ، زەلکاو، خمخۆرک، زۆنگ، زجاو. ف باتلاق

**باتلێن**: باترێن ☜ باترێن

**باتووبەند**: شتێکە وەک کەژوو ئاغزوونەی پێوەیە گونی قۆڕی پێ دەبەستن. ف خایەبند

**باخ بوون**: لەخۆبایی بوون، بادی هەوا بوون، غلوور بوون. ف مغرور شدن

**باخچۆڵە**: باخچەی چکۆلانە. ف باغچەی کوچک

**باخە**: باقە، باغە، مەڵۆ گیای بەستراو. ف بستەی گیاه

**باخەبێن**: باقەبێن، باقەبەست، باقەبەس. ف گیاه مخصوص بستن علف و یونجه.

**باخەخواز**: کەسێ کە بە خەرماناندا دەگەڕێ و باخە گەنمی دەدەنێ. ف کسی کە خرمن بە خرمن می‌گردد و بستە گندم می‌گیرد

**بادامێر**: باڕووشە، پەنکە. ف پنکە

**بادەقوش**: بایەقوش، کوندەبوو. ف جغد

**بادەڵان**: دەسباد، دەستبڵاو، عەبلەخەرج، هەڵەخەرج. ف ولخرج

**باڕ**: مەیخانە، شوێنی سەما و هەڵپەڕکێ. ف کابارە

**بارانڕست**: نەوندە، گەنمی بە باران ڕواو. ف گندمی کە بوسیلەی باران می‌روید

**بارانە ڕۆژ**: ڕۆژێک کە لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە باران بباری و تەڕ و تووشی بێ. ف روز بارانی

**بارانی کڵاو بە سەرە**: گۆپاڵەباران، بارانی دەنک گەورە و توند. ف رگبار شدید باران

**باربەژن**: موقورباز، جادووباز، سیحرباز. ف جادوگر

**باربەها**: لە ژن بە ژنەدا هەرکام لە بووکەکان باربەهای ئەویترە ف همتادرعروسی زن بە زن

**بارکووڵە**: کۆڵەبار، بارێکی کەم. *(بارکۆڵەیەک چیلگ ها وە کووڵیەو.)* ف کولەبار کوچک

**بارودۆخ**: چۆنییەتی ژیان و هەڵسووکەوتی خەڵک و کۆمەڵگا. ف وضعیت

**باڕۆژ**: بای ڕۆژانە، *(باڕۆژ هەڵناکا شەن بکەین.)* ف باد روزانه

**بارۆڤ**: گژەبا، بای توند. ف تندباد

**باروو**: دیوار، شوورە. ف دیوار بلند قلعه، بارو

**بارویت**: بوختان، تۆمەت، هەڵبەستە. *(قسەگەت گشتی بارویتە.)* ف تهمت

**بارەنداز**: (+) دەلاقەیەکە کە کا وئالیک و گزرەی لێوە دەکەنە نێو کادێنەوە. ف دریچەای کە از آن کاه و علف در کاهدان می‌ریزند

**بارهێنان**: فێر کردن، راهێنان، عاملاندن. ف پرورش

**باریکە پێدان**: فیزماڵک، دەرەدزەدان، خۆ دزینەوە. ف جیم شدن، در رفتن مخفیانه

**بارییە**: حەسیر، ڕایەخی لە جەگەن و قامیش. ف بوریا

**باز لەسەر نیشتن**: بریتی لە بەختەوەری ڕوو تێکردن، بریتی لە خۆشحاڵ بە دیتنی کەسێک. *(نەمردم ئەو بازەم لەسەر نیشت و تۆ بوویە میوانم.)* ف کنایە از نشستن باز برروی سر

**بازقه‌پان:** باسقه‌پان، جۆرێ ماری زه‌ردی ئاماڵ سووره.[ف] نوعی مار زرد رنگ

**بازمه‌له:** جۆرێ مه‌له‌یه.[ف] نوعی شنا

**بازنگ:** بازن، بازنه.[ف] النگو

**بازۆڵه:** باسک، زه‌ند، له هه‌نیشک تا مه‌چه‌ک.[ف] بازو

**بازوو:** (+) تاجیی ڕه‌ش که خه‌تێکی سپی به به‌ر زگیدا هاتبێ.[ف] تازی سیاه که خطی سفید بر روی شکمش باشد

**بازیار:** ڕێبوار، ڕێڤینگ.[ف] رهگزر

**باسترغه:** برنج له ئاو کردن بۆئه‌وه‌ی چه‌قه‌ره بدا.[ف] آب کردن برنج برای جوانه زدن

**باستۆن:** باتۆم، په‌یاغ.[ف] باطوم

**باسخوون:** په‌لاماری کتوپڕ، هه‌ڵمه‌تی خێرا و له‌پڕ.[ف] پاتک

**باسقول:** ده‌ور گرتن، ئابڵۆقه‌دان، گه‌مارۆدان، ده‌ست به‌سه‌ردا گرتن.[ف] محاصره

**باسقه‌پان:** بازقه‌پان، جۆرێک ماری پڕ مه‌ترسییه.[ف] نوعی افعی

**باسکار:** هێز و توانا، وزه.[ف] توان، رمق

**باسکه:** ناوی باڵنده‌یه‌که.[ف] اسم پرنده‌ای است

**باسووره:** باگه‌ڕ، گه‌رده‌لوول، گه‌ڕه‌پێچ.[ف] گردباد

**باسه‌ره‌یی بوون:** بادیه‌وا بوون، باخ بوون، له‌خۆبایی بوون.[ف] مغرور شدن

**باشان:** ) ناوێکی ژنانه‌یه؛ ) باشه‌کان، ئه‌وانه‌ی باشن.[ف] ) نام زنانه؛ ) بهتران

**باشبۆزغ:** ڕێنیشانده‌ری بێگانه، سیخوڕ، جاش، خۆفرۆش.[ف] جاسوس، راهنمای خودی در میان دشمن

**باشقه:** هه‌ڵبژارده، سه‌رباشقه. *سه‌رتۆپ ، (ئه‌و مه‌یه‌ی په‌ڕه باشققه‌ی گشتیانه.)* [ف] ممتاز

**باشمه:** شه‌قڵ، شقڵ، مۆری دارینی خرمان.[ف] مهر چوبین خرمن

**باشه‌واڵه:** باشووک، واشه.[ف] باشه، پرنده‌ای شکاری

**بافرکه:** فرفره‌ی کاغه‌زی.[ف] فرفره

**بافره:** (+) بافیش، بادیه‌وا، له‌خۆبایی. *(گه‌لێ بافره بووگه.)* [ف] مغرور

**باڤی:** (+) ناوی ئه‌شکه‌وتێکه له نزیک مه‌رگه‌ی قه‌لادزێ.[ف] نام غاری است

**باکۆ:** گیشه. قۆری، تایه گیا و یۆنجه. .[ف] توده‌ی انباشته‌ی گیاه و علف

**باگرتن:** جووت بوونی نێر و مێی سه‌گ و تاجی.[ف] جفتگیری سگ و تازی

**باگۆ:** جواو، وه‌ڵام. *(سه‌د جاری قاو لێکه باگۆ ناداته‌وه.)* [ف] جواب

**باڵ کردن:** باڵ ده‌رهاوردن. *(وه چه‌ن ڕۆژ مه‌ل باڵ کێگ.)* [ف] پر درآوردن پرنده

**باڵ کردن:** بڕین یان هه‌ڵکه‌ندنی شاباڵی مه‌ل بۆئه‌وه‌ی نه‌توانێ هه‌ڵفڕێ.[ف] بریدن یا کندن شهپر پرنده برای اینکه پرواز نکند

**باڵا به باڵا گرتن:** خۆ به‌قه‌د یه‌ک گرتن. *(هاته ده‌رکی ده‌روازه/ چاوی شه‌هێن و بازه/ داوام لێکرد بۆ ماچێک/ نه‌یدامێ مه‌کربازه/ باڵام به باڵای گرتووه/ وه‌ک یه‌کین به ئه‌ندازه*

«فۆلکلۆر».) ف مقایسه کردن قد با کسی دیگر

**بـالا:** (+) لای سـەرووی کراسـی ژنانـە، بـەژن. *(کراسـەکـەم داوێنـەکـەی تـەواوە، بـەلام بالاکـەی گەورەیە)* ف از کمر به بالای پیراهن زنانه

**باڵباز:** جۆرێ مراویی باڵ بەڵەکی مەیلەو قاوەییە. ف نوعی مرغابی

**بالبالووکە:** تاژیلۆکە، تاژیی ئەحمەد ڕاوکەر، تاجیلۆکە. ف آخوندک

**باڵبەز:** پیازە، تاوان، سووچ. ف گناه

**باڵتووسک:** دش، خوشکی مێرد. ف خواهر شوهر

**باڵزڕ:** مشکگرە، باڵزێڕ، مەلێکی ڕاوکەرە. ف پرندەای شکاری

**باڵزێڕ:** بازڕ، باڵزڕ، مشکگرە. ف پرندەای شکاری مانند جغد

**باڵشت:** باڵنج، بالیف. ف بالش

**باڵکۆک:** بەڵگە، قەواڵە، ئێوەر، تاپۆ. ف قباله، سند

**باڵگاشە:** پروپاگەندە، پێدا هەڵگوتنی بە درۆ. ف تبلیغات دروغین

**بالووفک:** باڵنج، بالیف، باڵشت. ف بالش

**باڵوێز:** نێردراوی دوڵەتێک بۆ کاروباری دەرەوەی لە وڵاتێکی دیکە. ف سفیر

**باڵوێزخانە:** شوێنی باڵوێز. ف سفارت

**بالەقول کردن:** تاریف کردنی فێڵاوی بۆ فریو دان، پێدا هەڵگوتنی بە فێڵ بۆئەوەی لە خشتەی بەری. *(وای بالەقولی کردووە هەر کارێکی بوێ بۆی دەکا.)* ف تعریف کردن برای فریب دادن

**باڵەوازە:** پەڕەوازە، باڵ گرتنی بێچووە باڵندە. ف پرواز کردن جوجه پرنده

**بالیک:** بالووکە. ف زگیل

**باڵینەک:** فڕۆکە، تەیارە. ف هواپیما

**باڵێنەوان:** فڕۆکەوان، خەلەبان. ف خلبان

**بام:** (+) بم، ببم. *( فیدات بام ساقی تەڕ زوانم کە/ مـن دەردی دیـرم دەوای گیـانم کـە.)* ف شوم، بشوم

**بامال:** شوێنێک کە با بەفرەکەی ڕادابێ، *(وەرە بەو بامالەدا بڕۆین لەبەفر ناچەقین.)* ف جایی که باد برفش را مالیده باشد

**بانبز:** مامز، ئاسک. ف آهو

**بـاندڕ:** دارێک کـە لـە دارەڕادا لـەوانـی دیکـە درێژتـرە و لـە دیـوارەکـە دێتـە دەرێ. ف تیرگ سقفی که از لبه‌ی بام بیرون می‌آید

**باندوور:** نیڵە، نیری جووت. ف یوغ

**بانکوت:** باگردێن، باگردان. ف بام غلطان

**بانکە:** بۆشکەی چکۆڵە، بەرمیلی گچکە. ف بشکەی کوچک

**بانگلۆز بوونەوە:** خلۆر بوونەوە، تلار بوونەوە. ف غلط خوردن

**بانگلێن:** باگردێن. ف بام غلطان

**بانوان:** ) سەنگفەڕش؛ ) کۆڵانی باخ، ڕیزەداری وەک کۆڵان. ف ) سنگچین کوچه و حیاط؛ ) کوچەباغ

**بانەناز:** بانیژە، سەربانی نەوی. ف بام کوتاه

**بانـەوسـان:** ) بـانکوت، بـانتلێن، ) خـەوتـن لـە سـەربـان لـە هاویندا. ف ) خوابیدن پشت‌بام در فصل تابستان ) بام غلتان.

**بانینەوە**: بێچوو خستنەوە بەر مەڕی نەبان. ف عادت دادن دوبارەی دام که از بچه خود بیزار می‌شود

**باوبۆ کردن**: گەمەی سەگان لەدوای تێر خواردن. *(سەگەل تێریان خواردووە کەوتوونە باوبۆ کردن.)* ف بازی کردن سگها بعد از سیر شدن

**باوخۆش**: بریتی لە منداڵێک کە فێری گڕوگاڵ و تریقانەوە بووبێ. *(منداڵی جیرانەکەمان لە منداڵەکەی ئێمە باوخۆشترە.)* ف رشدیافته، برای کودک

**باوشۆر**: جاجمێک کە وەک تەلیس هەڵیدەدوورن و چۆلەکەی پێ دەگرن. ف جاجیمی که مانند گونی می‌دوزند برای به دام انداختن گنجشک

**باوگەورا**: باوەگەورە. ف پدربزرگ

**باوە**: بابە، بانگ کردنی باوک، باوکە. ف صدا کردن پدر

**باوە**: دێراو، بۆ، چاڵ کردنی عەرز بۆ بێستان بۆئەوەی ئاوی تێدا ڕاوەستێ. ف جوب آبیاری

**باوەجەرە**: باوەخولێ، هەڵسووڕان بە دەوری خۆدا. ف چرخیدن به دور خود

**باوەژۆ**: ئاوارە، هەڵوەدا، دەربەدەر، ئاراگێڵ. ف آواره

**باوەسیر**: بێوەسیری، نەخۆشییەکە لە کۆمی مرۆڤ پەیدا دەبێ. ف بواسیر

**باوەگەورە**: باپیرە، باوگەگەورا. ف ☜ باوگەگەورا

**باوەڵە**: باول، باولە، جانتا. ف چمدان

**باوین**: باسکار، هێز، وزە، توانا. ف توان، رمق

**بای دار ئاوس**: بای شەماڵی هەوەڵی بەهار کە هەڵیدەکات و دار چڕۆ دەردەکەن. ف باد بهاری که موجب شکفتن شکوفەی درختان می‌شود

**بای کەپۆ**: ) جۆرێ مارە لە تیرەی ئەفعی کاتی دیتنی دوژمن ملی هەڵدێنی و دەهووشێنێ؛ ) جۆرێ تەیری ڕەشە ئێواران بە پۆل بە ئاسماندا دەگەڕێن و دەنگێکی تایبەتیان هەیە و خەڵک لەسەر ئەو باوەڕەن کیسەیەک لە گەروویاندایە، شمشێر باڵ ف) نوعی مار از خانواده افعی؛ ) پرستوی سیاه

**باینە**: بایەقووش، کوندەبوو. ف جغد، بوم، بوف

**بای‌وادە**: بای‌وەعدە، شەماڵی سەرە بەهار کە بەفر دەتوێنێتەوە. ف باد بهاری

**بایەدەس**: دەستبڵاو، دەستباد، هەڵەخەرج، عەبلەخەرج. *(بایەدەس قەت دەوڵەمەن نیەوگ.)* ف ولخرج

**بایەدەسی**: عەبلەخەرجی، دەستبڵاوی. ف ولخرجی

**بایەشک**: باوێشک. ف خمیازه

**بایەڵان**: بایەدەس. ف ☜ بایەدەس

**بایەم**: بایەو، بادام، بادم، بایەڤ. ف بادام

**بایەمە**: لووی بن پێست، گرێی ڕەقی بن پێست. ف غده

**بترژم**: ئافەرەم، بارەقەڵڵا، ئەفەکەڵڵا. ف آفرین.

**بتۆ**: ) ڕێگای بنبەست؛ ) نەزۆک، قسر، ئەستێور؛ ) تات، تۆک، پەردەی کچێک کە

کرۆشکە بەری دەگرێ و نابێ بە ژن.ف) راە بن‌بست؛ ) نازا، قسر؛ ) پردەی بکارتی کە غضروفی باشد

**بتووی**: بن‌بەست.ف بن‌بست

**بچیک**: زارۆ، منال، منداڵی ساوا.ف کودک خردسال

**بخوڕ**: هەراهەرا و دەنگە دەنگ، زەنازەنا.ف سروصدای زیاد

**بڕ خەلاس**: جۆرێ کایەی منداڵانەیە.ف اسم یک بازی کودکانە

**براڕۆ**: وشەیەکە لە کاتی مردنی برا و دۆست و هاوڕێدا دەیڵێن.ف کلمە عزا و شیون

**براندۆخ**: کەللە ڕەق، خیشەسەر. *(مرۆیەکا گەلەک براندۆخە.)* ف خیرەسر

**برج**: (+) جاسووسی تفەنگ، دەرزیلەی نیشانە گرتن لەسەر تفەنگ.ف مگسک تفنگ

**برجڵانەکی**: جۆلانێ، دنگلاڤ، هەلۆرتک، دیلانێ. ف تاب

**برژنگ**: مژۆڵ، برژۆڵ، بژانگ.ف مژە

**برساق**: (+) ڕوودار، ڕوو هەڵماڵدراو، بێ‌شەرم، بێ‌ئەدەب. *(فرە ئایەمێک برساقە.)* ف گستاخ

**برساقی**: ڕووداری، بێئەدەبێ، ڕوو هەڵماڵدراوی.ف گستاخی

**بڕشکان**: تینوێتی شکان، *(هەرچی ئاو دەخۆمەوە برم ناشکێ.)* ف عطش

**برشوو**: برش، کەڕەکیفە، کەڕوو.ف کپک

**برشیاگ**: برژیاو، برژاو.ف برشتە

**برشیان**: برژان، *(سزیام و برشیام، بووم وە کۆی بریان/ بووم وە تەماکوو سەر سختەی قلیان «فۆلکلۆر».)* ف برشتە شدن

**بڕک**: (+) گیایەکی بۆنخۆشە زۆر بەرز نابێتەوە و گوڵێکی سپی دەردەکا.ف اسم گیاهی است

**بڕکەمردە**: ئەو تەڕە کارییەی *(کاڵەک و شووتی و گرکە و خەیار و ...)* کە بڕکەکەی لەبەر هۆیەک وشک دەبێ و بەرەکەی زوو دەگا و تامی ناخۆشە. سیس بوونی بڕکەی بێستان.ف میوەای کە بوتەاش خشکیدە باشد

**برگ**: دارێکی قوڵە بە ئەندازەی نیو مەتر وەکوو نێزە دەیهاون، بەتڵ، بەتر.ف چوبی کە مانند نیزە در بازی پرتاب می‌کنند

**برگە**: (+) هیجا، برگەی کێشیی شێعر.ف هجا

**برنجداس**: ناوی گیایەکە گوڵێکی زەردی هەیە بۆ دەرمانی دڵ کەڵکی لێ وەردەگرن.ف برنجاسف

**بڕۆ**: شفرەی فیل و بەراز، شرن، ددانی زەقی‌یەکانە، بڕڕە.ف عاج فیل و گراز

**بڕۆک**: گەڕۆک، ڕانەوەستاو.ف سیار

**برووک**: خۆش کردنەوەی باران بۆ ماوەیەک. ف بند آمدن باران برای مدتی کوتاە

**برهاڤ**: کۆما، کۆگا، کۆ کردنەوەی شت لەسەر یەک.ف انباشتە روی هم

**بڕیار**: (+) بڕینی پارچەی جلوبەرگ *(من بڕیارەکە دەکەم و شاگردەکەم دەیدوورێ)* ف بریدن پارچەی لباس در کارگاە خیاطی

**بڕیارنامە**: پەیمان‌نامە.ف پیمان‌نامە

**برێژە**: بنێشت، جاچکە، جاجک، چەقە.ف سقز

**بریسوو**: ) برووسکە، هەورەتریشقە، بلاچە ) ناوی گوندێکە لە ناوچەی بانە.ف نام روستایی در کردستان ) آذرخش

**بریڤ**: وریا، وشیار، ئاگادار.ف آگاه

**بریڤان**: ئاگادار بوون، وریا بوونەوە.ف آگاه شدن

**برینج**: برنج، دانەوێڵەیەکی سپییە بۆ پلاو دەبێ. ف برنج

**برینجە**: ) بزە، گرژینەوە، زەردەخەنە ) جووڵەی بە ئاستەمی ئاو، شەپۆلی وردی چۆم. *(چۆمەکە برینجە دەکا.)* ف ) لبخند ) موج ریز بر بستر رودخانە

**برینگچی**: ئەو کەسەی کە بە برینگ مەڕ دەبڕێتەوە.ف پشمچین

**بڕیەکار**: کەسێک کە قەباڵ هەڵدەگرێ.ف پیمانکار

**بڕیەکاری**: کار کردن بە قەباڵ، قۆنتەرات.ف پیمانکاری

**بزاوتۆکە**: جووڵەی کەم، نیمچە جووڵە.ف حرکت آهستە

**بزڕبزڕ**: پارچە پارچە، لەتلەت، ونجڕ ونجڕف تکە تکە

**بزرۆکە**: (+) پیتی ساکن وەک *(شـُــرذن ــ بـُـژن ــ شروە)* ف نمە

**بزگە**: بزە، زەردە. *(هاتە نێو شار و کەمێ گەشتی کرد/ ڕوویی ڕوونی دی و بزگەی لێوان «سەید تاهیر هاشمی».)* ف تبسم، لبخند

**بزمار بە گا**: بریتی لە جێگای تەنگەبەر و پڕ لە حەشامات. *(لەو ژوورە چکۆلەیەدا بزمار بە گایەکە کەس جێی نابێتەوە.)* ف کنایە از جای تنگ و پر از جمعیت

**بزمژنەک**: بزنمژە، جۆرێ مارمیلکەی گەورەیە. بێرەبێرە.ف بزمجە

**بزمووک**: بەسترانەوە، جووڵە نەکردن. *(لەجێی خۆی وا ویشک بووە دەڵێی بزمووک کراوە.)* ف بستە شدن، پابند

**بزنگرە**: جۆرێک دڕکە لە کونجرە گەورەترە بەمەڕ و بزنەوە دەنووسێ.ف نوعی خار

**بزنەڕێ**: ڕێچکەی ڕژد و باریک بەقەدی کێوەوە.ف بزراە

**بزنی قازی**: گەمەیەکی لاوانەیە، دوو قوڵە داری بەقەد بستێک بە دەستەوە دەگرن و شەمچەیەک دوو مەتر دوور دادەنێن و دەبێ لەسەر لاق و ئەو دوو قوڵە دارە وەک گاگۆڵکێ بڕوا و بە دەمی شەمچەکە هەڵگرێ، هەر کەس بتوانێ ئەنجامی بدا بەرەندەیە.ف نام یک بازی جوانان

**بزووتن**: (+) هاتنە خوارەوەی بێئیختیاری شیری مەمک، بێئەوەی منداڵەکە بیمژێ تک تک دڕژێتە خوارێ، مەمک بزووتن.ف ریختن ناخودآگاە شیر پستان

**بزوێن**: ) جووڵێنەر، بزوێنەر؛ ) پیتی دەنگدار، وەک ئا، ئۆ، ئی، ئوو، ئێ.ف ) تکاندهندە؛ ) حرفهای صدادار

**بزەخەنگ**: زەردەخەنە، بزە، گرژینەوە.ف تبسم

**بزەلەرە**: مەلێکی لاق درێژە لە قەراغ ئاوان

دەژی و ماسی دەخوا.ف نوعی مرغ ماهی‌خوار

**بژبژۆکە**: ناوی گیایەکە گوڵی سوورە.ف اسم گیاهی با گلهای قرمز

**بژمێر**: ژمێریار، کەسێ کە حیساب دەکا، حیسابگەر.ف حسابدار

**بژوار**: بژوێن، زەمەند، زەویی پڕ لە گیا و گژ. ف زمین پر از گیاه و علف

**بژۆن**: ) ورە و غیرەت، هێز و توانا.) برژانگ، مژۆڵ، برژۆڵ.ف ) قدرت، توان. ) مژه

**بژوو**: بژ، یاڵی ئەسپ، مووی سەر ملی ئەسپ و شێر.ف یال

**بژی مەمر**: نەمر نەژی. *(کارەکەمان بژی مەمرە.)* ف بخور نمیر

**بستۆک**: ☜ بستووک

**بستووک**: بستوو، ملەی کێو، زینوو. *(تۆی لە من دوور کردووە و منی لە تۆ دوور/ ئەو بستووکەی دوژمن ناوی نا سنوور «هێمن».)* ف *گردنەی کوە*

**بستە**: (+) لقێکی باریکی پێچ پێچە بەسەر لقی بڕکە بێستانەوەیە لە گیا و گژیتر دەهاڵێ.ف شاخەی پیچ پیچ بوتەی جالیز.

**بسکدان**: گەیشتنی کاڵەک و گڕکە بەجۆرێک کە لەبەر گەیشتن لە بڕکەکەی بپێتەوە. *(بێستانەکە کەس نییە لێی‌کاتەوە هەمووی بسکی داوە.)* فمیوەای کە بەخاطررسیدن زیاد از بوتە جدا می‌شود.

**بسکوجاخ**: ئەگریجە، بسکۆک، مووی سەر لاجانگ.ف زلف

**بسکۆڵە**: (+) بسکی چکۆڵە، ئەگریجەی قوڵە.ف زلف کوتاه

**بسیلاک**: زیخەڵان، خیزەڵان.ف ریگزار

**بشتاڵ**: لاکوت، لاپرەسەن.ف فضول

**بقوت باژۆ**: ناوی کایەیەکی منداڵانەیە.ف اسم یک بازی کودکانە

**بکەر**: کەسێک کە کارێک دەکا. *(کەس بکەری ئی‌کارە نییە.)* ف فاعل

**بگربگر**: هەراهەرا، زەنازەنا، ڕەشبگیر، هەڵڵاوبگر.ف سروصدای زیاد

**بلاتینک**: پەپوولە، پەرپەرۆک، پەلپەلیسک.ف پروانە

**بڵاجەو**: سەیر، عەجایب. *(ئی کارە فرە بڵاجەوە.)* ف عجیب

**بڵاچانن**: برووسکەی هەور، هەورە تریشقە، هەورە برووسکە. *(ئاسمان بڵاچنێ.)* ف آذرخش

**بڵاچوهۆڕ**: هەورەگرمە، هەورەتریشقە.ف رعدوبرق

**بڵاچە ئاگر**: گڕی ئاور، بڵێسە.ف شعلە

**بڵاچە**: برووسکە، بریقەی هەور.ف آذرخش

**بلالک**: بەڵاڵووک، بڵاڵووک.ف آلبالو

**بڵاڵووکە کێویلە**: دارێکی کورتە بنەیە بەرێکی وردی زەرد دەگرێ لە جێگای شاخ و بەردەڵان دەڕوێ.ف آلبالوی کوهی

**بڵاوەند**: ناوی تیرەیەکە لە هۆزی مامەش.ف نام طایفەای از ایل مامش

**بڵباس**: ) ناوی ناوچە و عەشیرەتێکی کوردە. ) ئەڵماس، بەردێکی بەنرخە.ف ) نام یک طایفەی

کرد ) الماس

**بڵحەڕوو:** مرۆڤی چاوحیز، تۆلاز، ژنی حیز و خراپکار و خەنەڕوو.ف آدم بدعمل، فاحشه

**بڵفەتە:** نەخۆشیی تاعوون، چاوقووڵکە.ف مرض طاعون

**بڵقەتاڤ:** ئەنگوستەچاو، تاریکەشەو، شەوەزەنگ.ف شب بسیار تاریک

**بڵماندن:** بڵمە، دەنگی وشتر و لۆک، وشتر دەبڵێنێ.ف صدای شتر نر

**بڵند:** بەرز.ف بلند

**بڵنگۆ:** بڵیندگۆ، بڵینگۆ.ف بلندگو

**بڵۆک:** بلووک.ف بلوک

**بڵووت:** دەوریی درێژۆکەی گەورە بۆ پلاو. ف دیس

**بلووک:** جۆرێ خشتی گەورەیە لە چیمەنتۆ دروستی دەکەن.ف بلوک

**بلووکە:** بەفری وشک، بەفرەلووکە.ف برف ریز و خشک

**بلوێر ئەنگێو:** شمشماڵژەن، بلوێرژەن.ف نیزن

**بلەرزەک:** بۆمەلەرزە، بوولەرزە، بوولەرە.ف زلزله

**بلیاق:** ڕەشایی نێو گلێنەی چاو.ف مردمک، عدسی چشم

**بلیز:** بڵێسە، بڵێزە.ف شعله

**بڵێسک:** جنچک، پلە گۆشت، چنچک.ف تکه گوشت کوچک

**بلیمەت:** (+) ناحەز، ناشیرین، دزێو.ف زشت

**بڵیند:** بڵند، بەرز.ف بلند

**بڵینگۆ:** بڵیندگۆ، ئامرازێکە بۆ بەرز بوونەوەی دەنگ کەڵکی لێ وەردەگرن.ف بلندگو

**بمارکی:** جۆرێک دمەڵی زۆر بە ژانە لە لەشی مرۆڤ دێ.ف نوعی دمل چرکی

**بنئامۆزا:** ئامۆزازا، منداڵی ئامۆزا. ف فرزند پسرعمو

**بناجانگ:** لاجانگ، نێوان ڕوومەت و گوێچکە.ف عارض

**بنار:** (+) ڕێی هەوراز، ڕێگای سەراولێژ.ف راه شیبدار

**بناژانگ:** ☜ بناجانگ

**بناورە:** ئەو پووشە نەرمەی بۆ هەڵبوونی ئاور لە بن دەستە چیلەی دەنێن.ف خاشاک خشکی که برای روشن کردن آتش زیر چوبها قرار می‌دهند

**بناوکەر:** مەلەوان، سۆبا، مەلەزان، مەلەڤان.ف غواص، شناگر

**بنپاژینە:** بنژیل، خۆڵ و خاکی دانەوێڵەی لە بێژنگ دراو، بنبێژنگە.ف تەنشین بیختن غربال

**بنپشک:** (+) قورەکەشی، تیروپشک.ف ☜ تیروپشک

**بنترنە:** ئەو تەختەی کە ڕایەڵی گوردە و شێرە لە فەرشدا لێک جیا دەکاتەوە.ف تختەای در میان تارهای فرش قرار می‌گیرد

**بنتەمەڵە:** بنچینە، هێم، بناخەی دیوار.ف شالوده، بنای زیرین دیوار

**بندارۆک**: (+) سەیران، سەیاحەت، رابواردن.ف تفریح

**بندرپس**: عەسڵ، رەسەن.ف اصیل

**بندنۆ**: پووک، ئەو جێیەی ددانی لەسەر دەڕوێ.ف لثه

**بندۆک**: (+) ئەو خورییە زبرەی لە شانە کردندا دەمێنێتەوە و بۆ ڕستن نابێ.ف باقیماندەی پشم هنگام ریسندگی

**بندوورە**: میلاقە، ڕەبەنۆک.ف آلاله

**بنچڵەک**: بنەچەکە، ڕچەڵەک، باوباپیران.ف اجداد و نژاد

**بنعانە**: جۆرێ پێڵاوی قەدیمی ژنانە بوودراوێکیان لە پاژنەکەی دەدا بۆئەوەی تەقەی بێ.ف نوعی کفش زنانه

**بنقرووژنەک**: ئەوک، قورقوڕاچکە، بینبینۆکە، قورگ، تینتینۆکە.ف حلقوم

**بنکرنەک**: بنکڕ، شتێ کە بە بنی مەنجەڵەوە دەنووسێ.ف تەدیگ

**بنکەوا**: کورتەکی ژنان، شتێکی ئەستوورە ژنان وەک شۆرت لەپێی دەکەن بۆئەوەی سمتیان قەڵەو بنوێنێ.ف نوعی پوشاک زنانه

**بنکەوش**: (+) مووروووە قاچاخی، جۆرێ خشڵ و مووروووی سێ گۆشەیە ملوانکەی پێ دەگرنەوە.ف نوعی مهرەی رەنگی برای بافتن گرنبند

**بنۆرە**: کوندەی چکۆلە، کوندەک.ف مشک چرمی کوچک

**بنۆس**: ) بنەما، بناغە، بنێشە، هێم، بنچینە ) هۆ، سۆنگە، هۆکار ف ) اساس، شالودە) سبب، علت.

**بنەبان**: میچ، لای ژووری ماڵ.ف سقف، قسمت بالایی خانه

**بنەبڕ**: (+) بەهانەبڕ، گرووشکێن.ف وسیلەای برای بریدن بهانه بچه

**بنەتان**: داری ژێرەوەی فەرش کە تەونکەر لە سەر ئەو پەراوێزی هەوەڵ دادەمەزرێنێ.ف چوب زیرین دەستگاه فرش بافی

**بنەتوو**: دابێکی ناحەزە کەسێک کە ماڵی نییە ژن بێنێ، کچی کابرایەک بە بنەتوو دەخوازێ واتە هەرچی منداڵی مێیینەی بوو دەبێ بیداتەوە بە ماڵی خەزووری و هیچ هەقێکی بەسەریەوە نابێ.ف رسمی ناشایست در فرهنگ عشایری

**بنەجەرگ**: گۆشتی بەندی دڵ، ئەو ڕەگە گۆشتەی بۆتە پێوەندی جەرگ و دڵ.ف رگی کە دل و جگر را بە هم پیوند زده است.

**بنەگر**: جێگرتوو، جێگیر، مسۆگەر، سەقامگیر. ف جاگرفته، پایدار

**بنەگۆگەم**: ) گۆگەم گیایەکە لە بوورە و بەیار شین دەبێ گوڵی زەردە بنەکەی وەک کۆڵوو خڕ و ئەستوورە بۆ سووتاندن دەبێ:) بریتی لە مرۆڤی قوڵە و نالەبار. *(دەڵێی بنەگۆگەمە پۆز و هەواشی هەیە.)* ف ) ریشەی گیاه جوجم؛ ) کنایە از آدم کوتولە

**بنەما**: (+) بناغە، بنێشە، بنچینە، هێم.ف شالودە

**بنەوپاڵ**: پەنا، تەنیشت. *(هەر لە بنەوپاڵی خۆتدا دانیشتووە.)* ف پهلو، بغل

**بنەوەشی**: جیددی، بەڕاستی.ف جدی

**بنێس:** لەڕ، لاواز، داڵگۆشت، ڕیوەڵە.ف لاغر

**بنێسین:** ژاکان، وشک بوون، سیس بوون.ف پژمرده شدن

**بنێشته خۆشکە:** بریتی لەقسەیەک کە دەکەوێتە سەر زاری خەڵک و برانەوەی نییە. *(ئەم قسەیان کردۆتە بنێشتە خۆشکە.)* ف حرفی که در دهان مردم می‌افتد و تمامی ندارد

**بنێشە:** بناغە، بنچینە، هێم، بنتەمەڵە.ف زیربنا

**بۆ هەڕنەهووت:** بۆ ترشاو و گەنیو، بۆ گنخ، بۆگەنی زۆر پیس و ناخۆش.ف بوی بسیار بد

**بواردوو:** قاوت، گەنمی برژاوی لێکراو.ف قاووت

**بوخت:** بوختان، تۆمەت.ف بهتان

**بوخچە:** نێفەکی دەرپێی ژنان، گردەڵە. *(بوخچەی ئاوەڵکراسەکەم تەنگە.)* ف خشتک شلوار زنانه

**بوخچەی نەکراوە:** بریتی لە لاوێک کە ژنی نەهێنابێ. *(کوڕەکەمان هێشتا بوخچەی نەکراوەیە.)* ف کنایه از جوانی که هنوز زن نگرفته باشد

**بۆخنک:** بۆدڕ، بۆدڕن.ف بوی چرک بدن

**بۆدرە:** پۆتر، کرێمی چەور کردنی دەست و دەم و چاو.ف کرم

**بۆدی پۆش:** زرێپۆش.ف زره‌پوش

**بۆدی:** بەدەنەی ماشێن.ف زره

**بۆڕ خواردن:** بەزین، شکست خواردن. *(هێندە خوێڕییە هەر لەڕێوە بۆڕ دەخوا.)* ف شکست خوردن

**بۆران پێچ کردن:** ڕاپێچەک دان، ڕامالین بە زۆر.ف غارت و چپاول

**بۆران پێچ:** باڕن و تۆف و بەند.ف کولاک

**بۆڕبۆڕێن:** ململانێ، گوڕڕە، ڕقە.ف مسابقه

**بۆڕدان:** بەزاندن، شکست پێدان. *(هەر کەس ململانێی لەگەڵ بکات بۆڕی دەدات.)* ف شکست دادن

**بۆڕدراو:** بەزیو، ترساو، شکست خواردوو، قژ بوو.ف شکست خورده

**بۆڕدران:** بەزین، شکست خواردن، قژ بوون.ف شکست خوردن

**بۆرە خوڵک:** خوڵک کردنێکی کەم و سارد و سڕ. *(وەک جاران خوڵک خۆش نەبوو تەنیا بۆرە خوڵکێکی کردین.)* ف تعارف کردن سرد

**بۆرەتار:** بوومەلێڵ، تاریک و ڕوونی بەیانی و ئێوارە.ف گرگ و میش

**بۆرەکار:** کاری سووک، ف کار اندک.

**بۆرەکە:** ) گوێلکی نێری دووساڵە، پارگوێر، گوێلپار؛ ) بۆرە پیاو، پیاوی سووک و چرووک و بێبایخ لە تایەفەدا.ف) گوسالەی دو سالە؛ ) مرد بی‌شخصیت و بی‌ارزش در طایفه

**بۆری:** شووشەی لامپا، بۆق.ف شیشەی چراغ

**بۆزراق:** ڕەنگی کەهووی مەیلەو سپی، سپیواش.ف رنگ طوسی مایل به سفید

**بۆزقاجی:** تاجی و حەیوانی بۆز و خەتخەت. ف تازی و حیوان بور با خط و خال سفید

**بۆسۆ کردن:** بریتی لە بوختان کردن، قسەی سووک وەدوای کەسێک خستن.ف کنایه از تهمت زدن

**بوغز له زگ:** ☜ بوغزاوی

**بوغزاوی:** قین له زگ، ڕقاوی.[ف] کینه‌توز

**بوغمه:** ئۆناق، بوغز، [ف] عقده.

**بوغور:** (+) ) لۆک، وشتری نێر) قه‌ڵه‌و، یاخی، گوێ نه‌ده‌ر.[ف] ) شتر نر) یاغی

**بوغه:** جوانه‌گای مل ئه‌ستووری نه‌خه‌ساو.[ف] گاو اخته نشده

**بۆفره:** بلۆق، بڵق، گۆمه‌زه.[ف] حباب

**بۆق له زگ:** بوغز له زگ، غه‌زراوی، ڕکوونی، دخه‌زدار، قین ئه‌ستوور.[ف] کینه‌توز

**بـۆق:** (+) شووشـه لامپـا، شووشـه‌ی چـرا.[ف] شیشه چراغ

**بۆک ونابۆک:** دوودڵی، دڕدۆنگی کردن. *(بۆک و نابۆک چوومه پێشێ.)* [ف] مترددد

**بۆکان:** شارێکی کوردستانه.[ف] بوکان

**بوکسه‌وات:**خلیسکان و سه‌رنه‌که‌وتنی ماشێن له‌جێگای قوڕ و سه‌هۆڵ.[ف] بکسوات.

**بۆکۆن:** ) ناوساجی، زرووبی؛ ) بۆنی شتێک که کۆن بووبێ.[ف] ) نان روغنی؛ ) بوی کهنگی

**بۆگه‌نکه:** (+) بوونه‌وه‌رێکی چکۆله‌یه له قالۆنچه بچووکتره، سن.[ف] حشره‌ی سن

**بۆڵ:** (+) هێشوو، زه‌نگه‌ته، تلووتک، یه‌شوو.[ف] خوشه‌ی انگور

**بۆڵژن:** ناڵه، بۆ ده‌نگی گه‌وره ده‌گوترێ. *(ده‌نگی ده‌ڵێی بۆڵژنی دێوه.)* .[ف] صدا و نعره‌ی بلند

**بووتگ:** ڕێزه، زه‌ڕڕه، گه‌ردیله، هوورک.[ف] ذره

**بووج:** گه‌وج، نه‌فام، ناهیر، حۆل.[ف] ابله

**بووجی:** گه‌وجی، نه‌فامی.[ف] ابلهی

**بـووده‌ڵـه:** (+) کوده‌ڵـه، بـه‌چکـه‌ی بـه‌راز.[ف] بچـه خووک و گراز

**بووری:** ڕابردوو، ڕابووری، ڕابورده.[ف] گذشته

**بـووزه‌ڵـه:** بـه‌ربینک، بـه‌رهـه‌ڵبێنـه‌ی بـووزوو.[ف] سینه‌پوش

**بووژاندن:** ڕنجاندن، دڵهێشاندن. *(گوڵی من وا سه‌رم دانا له‌به‌ر پێت/ له‌مه زیاتر مه‌بووژێنه دڵی شێت «ڕاوچی».)* [ف] رنجانیدن

**بووژه‌ڵه:** تازه پێ گرتوو، منداڵی خڕه‌که بوو. *(کوڕه‌که‌یان تازه بووژه‌ڵه بووه و خله‌خل ده‌ڕوا.)* [ف] بچه تازه پا گرفته

**بووکـه باخـه:** بـووکی نـایلۆنی.[ف] عروسـک پلاستیکی

**بووکه به‌فرینه:** ئه‌و په‌یکه‌ره‌ی منداڵان به به‌فر دروستی ده‌که‌ن.[ف] آدم‌برفی

**بووکه سووره:** مه‌لێکی به‌ر زگ سووره به‌قه‌د چۆله‌که‌یه‌ک ده‌بێ.[ف] اسم پرنده‌ای است

**بووکه واڵا:** بووکه شووشه.[ف] عروسک

**بۆون:** به‌یار، زه‌ویی نه‌کێڵدراو.[ف] زمین بایر

**بوهتووم:** بوختان.[ف] بهتان

**بۆیرش:** بۆشێ، بۆنی هه‌ر شتێک که له شوێنی ته‌ڕ داندرابێ و شێی هه‌ڵێنابێ.[ف] بوی نم

**به ئاو کردن:** زه‌رد بوون و سیس هه‌ڵگه‌ڕانی گه‌نم و جۆ به‌هۆی ئاوی زۆره‌وه.[ف] زرد شدن محصول براثر آب زیاد

**به بازو و برد:** توند و تۆڵ، چوخت و چالاک، ئازا له هه‌ڵاتن.[ف] چالاک

**بـه بـای خـه‌یاڵـدا نـه‌هـاتن:** گـوێ پـێ‌نـه‌دان و

کەمتەرخەمی نواندن، *(تەواوی ماڵەکەی لەنێو بچێ بە بای خەیاڵیا نایە.)* ف اهمیت ندادن

**به بەردا هەڵخوێندن:** تاریف و پێدا هەڵکوتن و پاڕانەوە لە کەسێک بۆئەوەی کارێک جێبەجێ بکا. *(مانگێکە بە بەریدا هەڵدەخوێنم پێمل نابێ.)* ف خواهش و تعریف و تمجید

**به بەژن بران:** تایبەت بوون، ڕێک هاتنەوەی دوو شت پێکەوە. *(کوڵمەت گەش و ڕووناکە دەڵێی تیشکی هەتاوە/ جوانچاکی کراسێکە بە بەژنی تۆ بڕاوە «هێدی».)* ف چیزی کە مخصوص چیز دیگر باشد

**به پێی فیلان:** بریتی لە زۆر و زەوەند. *(هەر چییەکت بوێ بە پێی فیلانە.)* ف کنایە از بسیار زیاد

**به تاڵیا:** بەرەڵڵا و بێکارە، لات، کەسێک کە بێکارە و دەسووڕێتەوە. ف بیکار

**به تڕ بەند بوون:** بریتی لە شتی ناقایم و خوڕانەگر. ف کنایە از چیز غیر مقاوم

**به تەما:** تەمادار، تەمایەر. ف خواهان

**به چەقی نەحلەتا چوون:** ڕق هەستان و پێداگری کردن لەسەر کارێک. *(تازە بە چەقی نەحلەتا چووە بە قسەی کەس ناکا.)* ف یکدندگی و پافشاری

**به دەمدا ساوین:** ) بریتی لە شتی کەم بۆ پێخۆر. *(عالەمێکمان بەسەردا ڕژاوە ئەو تۆزە چێشتە بە دەمی کێدا بساوم؟)* ؛ ) لە دەم هەڵساوین. ف ) کنایە از غذای کم برای افراد زیاد؛ ) به دهان ساییدن

**به دەمدا هاتنەوە:** جوابە جەنگی. *(وای بە دەمدا هاتەوە خەریک بوو بیخوا.)* ف جدال لفظی

**به دەمەوە دان:** ) بریتی لە ڕوو پێدانی زۆر بە منداڵ. *(هێندەی بە دەمەوە مەدە دوو ڕۆژی‌تر چاوت دەردێنێ.)* ؛ ) بریتی لە پێ زیاد کردن. *(برێکی دیکەی لەو زەوییە بە دەمەوە بدە خانووبەرەیەکی باشی تێدا دەبێ.)* ف ) رو دادن زیاد به بچه؛ ) اضافه کردن چیزی به چیز دیگر

**به ڕقدا چوون:** ڕق هەستان، تووڕە بوون. ف عصبانی شدن

**به ڕوودا دانەوە:** بە چاودا دانەوە، چاکە کردن لەگەڵ کەسێک و وەبیر هێنانەوەی. *(باشە هێندەت بە ڕوودا دایەوە کوێرت کردین.)* ف کنایە از منت گذاشتن

**به ڕیشەوە بوون:** بە تووشەوە بوون. ف دچار شدن

**به سەر چوون:** بە سەر ڕۆیشتن، بە مەیل و ئارەزوو چوون بۆلای کەسێک. *(بۆ خزمەت مامۆستا هەر بە سەر دەچم.)* ف ☜ بە سەر ڕۆیشتن

**به سەر ڕۆیشتن:** بەسەر چوون، بریتی لە تامەزرۆ بوونی زۆر. *(هێندەم پێخۆشە بچمە حوزووری بۆم هەڵکەوێ بە سەر دەچم)* ف با سر رفتن

**به سەرەوە نەچوون:** ماوە پێنەدان، موڵەت نەدان، *(هێندە بە تەماحە بەسەر ماڵی کەسەوە ناچێ.)* ف پرهیز نکردن از هر چیز

**به سەنگی سیا هەڵێنان:** بە بەڵای گەورە

دووچار کردن، ئابڕوو بردن و تەمبێ کردن. ف به خاک سیاه نشاندن

**بە شەرما کەوتن:** بەڕوودا کەوتن، شەرم کردنی زۆر. *(وا بە شەرما کەوت لەڕووی هەڵنەهات نانەکەی بخوا.)* ف خجل شدن

**بە قێز و بێز:** ☜ بێزەون

**بە کێودا کردن:** شێت کردن، خوودار کردن. *(ناوێرم ئەو قسەیە بکەم بە کێومدا دەکات.)* ف کنایه از دیوانه کردن

**بە گڕ:** دڵتەڕ و ئاشق، هەوەسباز. *(هێندە بە گڕە بە دە شوو تێر ناخوا.)* ف هوسباز

**بە گژەونان:** بە گژدا کردن، پیا هەڵشاخاندن. ف تحریک کردن برای گلاویز شدن

**بە گۆڕێ وەر کردن:** لەبەر یەک پرژ و بڵاو کردن، جەرگ و ڕیخۆڵە دەرهێنان. *(تانجی و تولە جەرگ و ڕیخۆڵەی ڕێوییان بە گۆڕێ وەر کرد.)* ف پاره پاره کردن و از هم پاشیدن

**بە مۆر و مایە:** بە پۆز و دەمار، خۆگر و لەخۆبایی. *(هێندە بە مۆر و مایەیە دەڵێی کوڕی قەڕاڵی فەرەنگە.)* ف کنایه از کسی که خیلی متکبرانه رفتار میکن

**بە مەشکە دەرهێنان:** کەوڵ کردنی ئاژەڵ بۆ مەشکە. ف کندن پوست حیوان برای مشک

**بەبا کردن:** لاتیل، بە لێواری بێژنگ گەنم بە بادان ف به باد دادن غله با لبه‌ی غربال

**بەبە:** (+) باوک، باب. ف پدر، بابا

**بەبەران:** مەڕی بەرانخواز. ف گوسفند قوچخواه

**بەپۆز:** بەفیز، خۆبەزلزان، ترزل، قۆرەدەماخ، قودە قورە. ف مغرور، متکبر

**بەتاک:** بەتاڵ، خاڵی. ف تهی

**بەتاڵپە:** ☜ بەتاڵپا

**بەتر:** بەتڵ، بەش، ماوە. *(بەترێکی شەو چووبوو.)* ف قسمت

**بەترەف:** (+) زۆر، لەڕادەبەدەر، یەکجار زۆر. ف بیش از اندازه

**بەتری:** چاو ئێشە، نەخۆشیی چاو. *(چاوی بەتری کردگە.)* ف چشم درد

**بەتڵە:** تەپکە، جۆرێک داوە لە تەختەی دەدەن و دەیخەنە بن بەفرەوە دانی بە سەرەوە دەکەن بۆ گرتنی باڵندە. ف نوعی دام برای پرنده

**بەتەک:** کوڕکوڕ، کەت، وەتەک، قەتێ. ف کوکر

**بەتەگە:** بزنی نێریخواز ف بز نرخواه

**بەحاڵ و دووبەلا:** زوورەک و دووبەلا، بەحاستەم، بەئەسپایی. ف بسیار اندک، آهسته

**بەحێشت:** بەهەشت، بەحەشت، ف بهشت.

**بەخاو کەوتن:** لاق و قول گیران، لاق ئێشان بەهۆی بەڕێدا ڕۆیشتنی زۆر. ف پا درد براثر پیادەروی زیاد

**بەخۆدا شکانەوە:** شەرمەزار بوون، خەجاڵەت بوونەوە، تەریق بوونەوە. ف شرمسار شدن

**بەدادایی:** گریان و گوڕووی منالی چکۆلە کە لە شیری دەبڕنەوە.( *مادەری گێتی لە شیری بڕیەوە دەبڕێتەوە/ فائیدەی چی شەخسی لێکەوتوو بەدادایی بکا «مەحوی».)* ف بهانه و گریه کردن بچه شیرخواره

**بەداری نەحلەتا چوون:** ☜ بە چەقی نەحلەتا

چوون

**بەدانستە:** بەتایبەت و لە ڕووی وریاییەوە. *(بەدانستە لامدا بۆلای و چاوم لە کارەکەی کرد.)* ف عمدا

**بەدبەدە:** کەرەواڵە، هەویردە. ف بلدرچین

**بەدرست:** پێچەوانەی خۆشڕست، تاژییەک کە بە جوانی ڕست نادا. ف تازی کە بە خوبی با شکارچی همکاری نمی‌کند

**بەدفەڕ:** بەدئەتوار، ئاکار خراپ، نارەسەن. ف بدعمل، نامبارک

**بەدگل:** دزێو، ناشیرین، ناحەز. ف زشت

**بەدگووز:** مرۆی خیشەسەر و ناحاڵی، قین لە زگ و بوغزاوی، خیرەسەر. ف آدم کینەتوز

**بەدماژە:** ڕووتاڵ، ڕووگرژ، دزێو، مرومۆچ، خوێنتاڵ. ف اخمو، زشت

**بەددایی:** بەدادایی. ف ☜ بەدادایی

**بەدەستەوە چوون:** بەدەستەوە مردن، بەدەستەوە زایە بوون. ف کشتن کسی

**بەدەستەوە هاتن:** توانایی و سەرکەوتن لە کارێکدا. *(کارەکەم بە جوانی بەدەستەوە هات.)* ف توانایی انجام کاری

**بەدەعیە:** بە پۆز و هەوا، خۆ بە زل زان. ف متکبر

**بەدەماخ:** قەڵەو، گۆشتن، پرگۆشت. ف چاق

**بەدەماغ:** ☜ بەدەماخ

**بەدەنداز:** دزێو، ناحەز، ناشیرین. ف زشت

**بەدەهەن:** ☜ بەدەهەند

**بەدەهەند:** دەست و دڵباز، دڵاوا. ف بخشندە

**بەرئاوێتن:** ☜ بەرهاویشتن

**بەرانگژا بوون:** بە گژدا چوون، ئانگژا بوون. ف گلاویز شدن

**بەراو:** (+) لای خوارووی جۆگە ئاو کە شێڵەگەی لێ هەڵدەبەستن، بەرانبەری پشتاو. ف طرف پایینی جوی آب

**بەرایی:** دەسپێک، سەرەتا، لەپێشدا. ف ابتدا

**بەربجاڤ:** سامناک، بەسام، ترسناک. ف بیمناک

**بەربڕ:** (+) پێش گرتن، بڕدان، بەرزەفت. ف ☜ بەرزەفت کردن

**بەربۆغە:** بەرخەبەبە، بەرچێڵە، غەوغەو. ف غبغب

**بەربەتاو:** بریتی لە ژن و پیاوی دڵتەڕ و بە گڕ، حەشەری. ف انسان بلهوس

**بەربەرەڵڵا:** پێش ئاوەڵا، بەرنەگیراو، پاوان نەکراو. ف مکانی کە انحصاری نباشد

**بەربەلا کردن:** وەبەر بەلا دان، قوربانی کردن. *(مانگایەکی بۆ بەربەلا دەکەم ئەگەر بگەڕێتەوە)* ف صدقە کردن

**بەربەلا:** لە بەلاوە نزیک، کەسێک کە زۆری بەلا بەسەر دێ. *(ئەو فەقیرە هێندە بەربەلایە ڕۆژ نییە تووشی گرفتێک نەبێ.)* ف از بلا نزدیک.

**بەربێر:** شوان، شڤان، بەرڤان. ف ☜ بەرڤان

**بەربێنک:** بەرهەڵبێنە، پەڕۆیەکە بۆ داپۆشینی لاق هەتا پشتێنە لە کاتی کار کردندا. ف پیش‌بند

**بەرپیوار:** ون، نادیار، گوم، بزر، وندا. ف گم، ناپیدا

**بەرتەک دانەوە:** بەرپەرچ دانەوە، قسە پێبڕین.

ف در میان سخن دویدن

**بەرجەڤان:** خاوێن، پاڤژ، ئافیدە.ف پاکیزە

**بەرجی:** بێجگە، جگە.ف بەجز، غیراز

**بەرچاکڵە:** قڵفبەندێکە بە گوریس بۆ بەستنی باقەی چوارەمی شەغرەکێشان.ف نوعی گرە طناب در بار کردن علف

**بەرچێڵەگە:** بەرچێڵە، گۆشتی شۆڕی ژێر ملی گا و کەڵ و ...ف گوشت آویزان زیر گردن گاو و گاومیش و ...

**بەرخ خنکێنە:** گیایەکی قاڵچخ دارە لە مێرگ و گوێ جۆگە ئاو دەڕوێ، وەک گوڵە جۆ وایە.ف نام گیاهی است

**بەرخۆدان:** خۆڕاگری.ف مقاومت

**بەرخوێن:** دابێکی ناحەز و نارەوای کوردەوارییە کەسێک کە پیاو دەکووژێ دەبێ کچەکەی یان خوشکەکەی لە تۆڵەدا بدا بە ماڵی کووژراوەکە. ف دادن دختر به جای خون بها

**بەرخەتا:** خەتابار، تاوانبار.ف مجرم. خطاکار

**بەرخەلان:** کۆزی بەرخ، تامانی جێگەی بەرخ و کاژیلە.ف محل نگهداری بره و بزغاله

**بەرد بە با کردن:** بریتی لە زۆر توورە بوون و ڕق هەستان. *(وای ڕق هەستا بوو بەردی بە با دەکرد.)* ف کنایە از بسیار عصبانی شدن

**بەرد لەسەر دانان:** بریتی لە شاردنەوەی ڕاز و نهێنی، *(ئەو قسەیە هەر لێرە بەردێکی لەسەر دادەنێین و لەبیری دەبەینەوە.)* ف نهان کردن راز

**بەرد لەسەر مەڵۆ دانان:** بریتی لە خاترجەم بوون، دڵنیا بوون. *(تازە بەردی لەسەر مەڵۆ داناوە خەمی هیچی نییە.)* ف کنایە از خاطرجمع شدن

**بەرد هەڵگرتنەوە:** بریتی لە زۆر توورە بوون و ڕق هەستان. سەگ کاتێک کەسێکی نەناس دەبینێ و پێی دەوەڕێ ئەگەر کەسەکە بەردی تێ هەڵکا وای ڕق هەڵدەستێ هەڕا دەکاتە بەردەکە و قەپی پێدا دەکا.ف کنایە از بسیار عصبانی شدن

**بەرداخستنەوە:** ) فەڕش کاتێک زۆری لێدەتەنن و بەرز دەبێتەوە بەنەکان شل دەکەنەوە و دەیگێڕن و تەندراوەکەی دەچێتە پشتەوە و لە خوارەوە دەست دەکەنەوە بە تەنین، بەو کارە دەڵێن بەرداخستنەوە.) تەکمیش کردنی دێراوی بێستان، بەرنانەوە، تەربیش.ف ) برگرداندن قالی روی دارقالی ) سست کردن خاک جالیز

**بەرداس:** دەغڵی ئامادەی دروێنە، گەنمێک کە وەختی دوورێنەوەی هاتبێ.ف محصول آمادەی درو

**بەردۆ:** (+) گادۆشکە، مەرکەنی، سەتڵی گەورە، مانگادۆش.ف سطل بزرگ

**بەردە ئازەبە:** بریتی لە کەسێک کە دەبێتە هۆی ئازار و خەمی خەڵکی. *(بۆتە بەردە ئازەبە و وەزاڵە هاتووین بەدەستییەوە.)* ف مایەی عذاب

**بەردە بەلک:** بەردە جەرگە، جۆرێ بەردی سوور و لووسە وەک جەرگ وایە.ف سنگ شبیه جگر

**بەردە جەرگە:** بەردە بەلک.ف ☜ بەردە بەلک

**بەردە کەچەڵە:** بەردێک کە خەنەتیلکەی پێوەیە

و کرێژی بەرداوە.ف سنگی کە گلسنگ گرفتە باشد

**بەردە مووروو:** بەرد یان ئاسنێکی قووڵە لە ژێرەوەی بەرداش تەوەرەی لەسەر دەگەڕێ.ف سنگمهرەی آسیاب آبی

**بەردە موورەسەن:** بەردێکی خڕی سەختە لە ئاشی ئاویدا بەرداش لە سەری دەخولێتەوە.ف سنگی گرد و سخت در آسیاب آبی

**بەردە نەخشینە:** ناوی گوندێکە لە ناوچەی فەیزووڵلا بەگی بۆکان کەوتۆتە بەر سەدی کۆرش و ئاسەواری نەماوە.ف نام روستایی کە زیر سد کورش رفتە

**بەردەڕەوا کردن:** بەردباران کردن. *(بەردەڕەوا کریاگە.)* ف سنگسار کردن

**بەردەڕەوا:** بەردباران، کوچکواران.ف سنگسار

**بەردەزەرد:** ) ناوی چەند چیایە لە کوردستان کە بەهۆی ڕەنگی بەردەکانییەوە پێیان دەڵێن بەردەزەرد؛ ) ناوی گوندێکە لە ناوچەی بۆکان. ف ) نام چند کوه در کردستان؛ ) نام روستایی در نزدیکی شهر بوکان

**بەردەستک:** بەردەست، شاگرد، وروێرکە، خزمەتکاری بەردەست.ف پادو، وردست

**بەردەسماڵ:** خشڵێکە ژنان لە دەسماڵی دەدەن لەبەر گەردنیاندا.ف از زیورآلات زنانە

**بەردەق بەردەق:** بیر کردنەوە و هێنان و بردن، بیر ئاڵۆز بوون و خەیاڵ کردنی زۆر. *(خەم دایگرتبووم و کەوتبوومە بەردەق بەردەق.)* ف فکر و خیال بیش از حد

**بەردەڵا کەفتن:** نەخۆش کەفتن، کەلەلا کەوتن، *(ئی بەدبەختە ئەیە سێ جارە بەردەڵا کەفێ.)* ف زلیل شدن

**بەردەڵا:** زەلیل، کەلەلا، نەخۆش و لەجێدا کەوتوو.ف علیل، زلیل

**بەردەلینگ:** پارچەیەکی باریک و قایم کە بە دەوری دەلینگی پاتۆڵیدا دەدوورن بۆئەوەی شی نەبێتەوە.ف ئاستری نوار مانند دور دمپای شلوار میدوزند

**بەردەماو:** بەرماو، بەرما.ف سئور

**بەردەنگ:** کەسی بەرانبەر لە ئاخافتندا، *(ئەو هەمووە قسە دەکا و دەنووسێ بەردەنگی نییە.)* ف مخاطب

**بەردەنووس:** بەردێک کە نووسراوە و نەخشی کەونارای لەسەر هەڵکەندرابێ.ف کتیبە

**بەردەنوێژ:** تاتەنوێژ.ف سنگی کە بر آن نماز میخوانند

**بەردەوام:** بێبڕانەوە، پەیتا پەیتا.ف پیدرپی

**بەردەوام:** لەسەریەک، بێپسانەوە، *(بەردەوام خەریکی کارە.)* ف همواره

**بەردیلزا:** بەرخە نێری سێ ساڵە، شەک بەران. ف برەی نر سە سالە

**بەرڕاو:** لای خوارووی ڕاوگە.ف طرف پایین شکارگاە

**بەرزە حەوالکێ:** کۆلارە، بەرزە حەوایلە.ف بادبادک

**بەرزە حەوایی:** ) بەرزە حەوالکێ؛ ) بەردێکی درێژۆکەیە بە پەتێکییەوە دەبەستن و فڕێی

دەدەن بۆ حەوا زۆر دەڕواتە سەرێ و وەک مووشەک دێتەوە خوارێ.ف ) بادبادک؛ ) ☜ بەرزە حەوایلە

**بەرزەدەماخ:** لووتبەرز، لەخۆڕازی، قۆڕەدەماخ. *(مەی حەلالە بۆ منی دڵ پڕ لە داخ/ حەیفە لێی بخواتەوە بەرزەدەماخ «هێمن».)* ف مغرور

**بەرزەفت کردن:** پێش پێگرتن، بەرگری لێکردن.ف پیشگیری کردن

**بەرژەوەن:** ☜ بەرژەوەند

**بەرژەوەند:** ) بەرجەوەند، بەرجەوەن، دیمەن، لەپێش چاو دیار؛ ) بەراورد، لێکدانەوە.ف ) منظره؛ ) تخمین

**بەرساوتە:** بەرهەیوان، ژێرسابات، سێبەری کەپر.ف سایبان

**بەرسۆلکە:** بەرسوورکە.ف ☜ بەرسوورکە

**بەرسوورکە:** بەرسۆلکە، جۆرێ کارگی زەردی وردە لە مێرگان دەڕوێ.ف نوعی قارچ زرد رنگ

**بەرسینچکە:** نزگەرە، نزگرە.ف سکسکە

**بەرڤان:** شوان، شڤان.ف چوپان

**بەرفرەوان:** بەرفرە، هەراو، بەرفەریح، بەرین.ف وسیع

**بەرفەریح:** بەرفرەوان، هەراو، بەرین.ف وسیع

**بەرقەد:** لاپاڵی کێو، قەدی کێو، قەدپاڵ. *(مەڕەکان لەو بەرقەدە پەلیان هەڵخستووە.)* ف سینەی کوە

**بەرک:** (+) قایم، ئاسێ، سەخت، ئاز.ف سخت، محکم

**بەرکۆ:** پێشەکیی کارێک، پێچەوانەی پاشکۆ.ف ابتدای کار

**بەرکوت:** ) خواردنێکی کەم نزیک نیوەڕۆ و شێو. *(تازە بەرکوتێکم کرد برسیم نییە.)* ؛ ) کوتانی کولۆشی گەنم پێش گێرەکرانی خەرمان.ف ) خوردن اندکی غذا قبل از وعدەی نهار یا شام؛ ) کوبیدن ساقەی گندم با چوب قبل از کوبیدن خرمن

**بەرگیرفان:** ئاسەڕی گیرفان.ف آستر جیبی

**بەرگێلە:** هەیوانی بەردەم ئەشکەوت.ف سنگ ایوان مانند جلوغار

**بەرلۆغە:** بەرخەبەبە، بەرچێلە، بەرچەنە. *(هێندە قەڵەوە بەرلۆغەی شۆڕ بۆتەوە.)* ف غبغب

**بەرلیکە:** بەرسنگە، کوتێک پەڕۆیە بە بەر سنگی منداڵیدا شۆڕ دەکەنەوە وەک بەرهەڵبێنە بۆئەوەی سەر سنگی بە لیک و نان و چێشت پیس نەکا، بەروانکە.ف سینەپوش کودک

**بەرماڵ لەسەر ئاو گەڕان:** تاریفێکە بۆ موسوڵمانەتی، کەسێک کە سەری بچێ نوێژی ناچێ. هێندە موسوڵمانە بەرماڵی لەسەر ئاو دەگەڕێ.ف کنایە از مسلمان نمازخوان

**بەرمیت:** مێو، مۆم، شانەی هەنگوین کە دەیتاوێننەوە.ف موم عسل

**بەرنانەوە:**☜ بەرداخستنەوە

**بەرنیخ:** بەرهەڵێخ، دیواری پارێزەری دیوار، ئەو دیوارەی کە لەبەر دیوارێکی درزبردوودا هەڵیدەچنن.ف دیوار محافظ دیواری کە دارد فرو میریزد

**بەرۆدان**: زاووماک، تێکەڵ کردنی مەڕ و بێچوو. ف قاطی کردن گوسفند و بره

**بەڕوودا کەوتن**: بە شەرما کەوتن، لەڕوو دامان. ف رودربایستی

**بەروێ**: بەرۆک، پێسیر، بەرۆ. ف گریبان

**بەڕە لەسەر هەتیو هەڵدانەوە**: لا لێکردنەوە و چاکە کردن لەگەڵ کەسێکی لێقەوماو ف کمک کردن به فقیر و محتاج

**بەرهاویشتن**: بەرخستن، بەرئاویتن. ف سقط جنین

**بەرەبەرە**: (+) وشەیەکە کاتی جووت بە گا دەڵێن بۆ هاتنەوە سەر هێڵی جووتەکە. ف کلمەای کە دهقان هنگام شخم زدن بەکار می‌برد و گاو را بە طرف خط شخم هدایت می‌کند

**بەرەجۆ**: ) ئەو چەند دێراوەی لە جۆگەلەیەکەوە ئاویان بۆ دەچێ؛ ) ناوی گوندێکی ناوچەی مەنگوڕی مەهابادە. ف ) چند چالەای از جالیز کە از یک جوی آب می‌خوردند؛ ) نام روستایی از توابع مهاباد

**بەرەچاوە**: بەرێکی کاریتەی بان کە ڕیزە دەستەکی دەخرێتە سەر. ف یک طرف شاەتیر

**بەرەدار**: مەودای بەینی دوو کاریتە لە میچی خانوودا، *(نێومالەکەیان سێ بەرەدارە.)* ف ردیف تیرگ سقف

**بەرەدایە**: ڕەوا دیتن، بەرایی. *(چاوم بەرەدایە نادا ببینم.)* ف چشم دیدن کسی را نداشتن

**بەرەڤاژی**: بەراوەژوو، پێچەوانە، چەواشە. ف بلعکس

**بەرەڤی**: کۆڕ، کۆی چەند کەس لە دەوری یەک. ف مجلس

**بەرەڵێخ**: ☜ بەرنیخ

**بەرەنسکێ**: هەنیسک، هەنسک، بەرسینچکە. ☜ بەرسینچکە

**بەرهەڵدا**: بەرەڵلا، ئازاد کراو. ف رها

**بەرهەڵستکار**: کەسێک کە بە دژی کارێک ڕادەوەستێ. ف مخالف

**بەرهەڵستکاری**: ڕاوەستان بە دژی کارێک، هەڵوێست گرتن لە بەرانبەر کارێک یان کەسێکدا. ف مخالفت

**بەرێ**: (+) بەچکەی ئاسک، کارمامز. ف برەآهو

**بەڕیدە**: ئاوارە، ئاراگێڵ، هەڵوەدا، باوەژۆ. ف آوارە

**بەرێک**: بەرۆک، پێسیر، بەرۆ، بەروێ. ف گریبان

**بەڕێوەچوون**: ئەنجام درانی کار. ف انجام گرفتن کاری

**بەزافتە**: بریتی لە پیاوی بە هەیبەت و تووڕە کە ژن ومنداڵەکەی ناتوانن قسە لە قسەیدا بکەن. ف متضاد زن زلیل

**بەزگ**: غەمگین، خەمناک، خەمبار، پەرۆش. ف حەزین. غمناک

**بەزمورەزم**: شایی و داوەت، هەڵپەرکێ و شادی. ف شادی و پایکوبی

**بەزیبک و زاکوون**: بەتوانا و قانوونزان، ئازا و یاسازان *(ڕێبوارێکم ئازا و بەزیبک و زاکوون/ دەبڕم چۆڵ و چیا و پێدەشت و بێروون/*

*بەرهەڵستم دەکە هەپروون بە هەپروون/ دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون «هێمن»)* .ف
توانا و قانوندان

**بەژاڤیت:** بیانوو، بەهانە، پەڵپ، ورک.ف بهانه

**بەژکی:** ناکۆکی، ناتەبایی، ئاژاوە.ف ناسازگاری

**بەژن:** (+) ☜ باڵا

**بەساڵاچوو:** پیر، گەڕاوە، زورهان.ف سالمند

**بەستەڵان:** بەستەڵەک، زەویی سەهۆڵین و بەستوو.ف یەخبندان

**بەستێن:** (+) سەد، بەربەندی ئاو، بەنداو.ف سد

**بەسەر کردنەوە:** (+) ) بژاردنی مەڕ و ماڵات و سەر حیساب بوونیان کاتی هاتنەوە لە دەشت و سەحرا ) سەر لێدان، سەردان کردن.ف ) شمارش احشام هنگام برگشتن بە خانە) ملاقات، دیدنی.

**بەسەردا هاتن:** ) بەسەرا هاتن، ئامۆژگاری کردن؛ ) بەسەردا چوون. *(لەبن دارەکە خەریکی ماچ و مووچ بوون بەسەریاندا هاتن.)* ف ) نصیحت؛ ) هنگام کاری غیرشرعی کسی را دیدن

**بەسیت:** ئاسان، سانا، هاسان.ف آسان، راحت

**بەشداری کردن:** هاوکاری کردن، شەریکایەتی کردن.ف شرکت کردن

**بەفا:** وەفا، بەڵێن، پەیمان.ف وفا

**بەفرکوش:** شوێنی رژد و سەخت لە کوێستان کە بەفرەکەی درەنگ دەتوێتەوە و عەرزەکە ڕەق دەبێ. شۆنە. *(ڕەوەی جوانی دەبینی تۆ لەجێی مژ/ بەجێماوە لە ئارایش بەفرکوش «مەلامحەممەد ساردەکوێستانی».)* ف جایی در کوهستان که برف آن دیر آب می‌شود

**بەفرەک:** ) پەڵە و زبرایی سەر شاشەی تەلەڤیزیۆن؛ ) سەهۆڵ و زوقمی نێو یەخچاڵ *(سەلاجە)* .ف ) برفک تصویر تلویزیون؛ ) برفک یخچال

**بەفری شادی:** شتێکە وەک ئەفکەن کەفی گوڵاوی تێدایە و کاتی شایی و زەماوەند بەسەر بووک و زاوایدا دەپرژێنن.ف برف شادی

**بەقەم:** گەنم و جۆی تەواو گەیشتوو بۆ دروێنە. ف گندم و جوی رسیده

**بەکرە ژۆڤار:** بریتی لە مرۆی ئاژاوەچی و ناپاک، ئەو کەسەی بووبووە دڕکی ئەوینی مەم و زین، نەیاری مەم و زین.ف کنایە از آدم ناپاک و توطئەگر

**بەکرە:** (+) کورت کراوەی ناوی ئەبووبەکر.ف مخفف ابوبکر

**بەلا لێبارین:** بەلا بەسەر هاتن، تووشی بەسەرهاتی ناخۆش بوون. *(چیمەن گوڵ و سەوزەپۆش و ئێمەش سەرخۆش/ پێم‌وابێ بەهەشت وایە، بەڵام لێبارێ «خەیام».)* ف دچار بلا شدن

**بەلادا شکاندن:** هۆگری بە لایەک، لایەنگری لە کەسێک. *(هەر بەلای خزمەکانی خۆیدا دەشکێنێ.)* ف طرفداری از کسی کردن

**بەلاوەقە:** بەلەباقە، نەخۆشییەکی بزنە.ف نوعی بیماری بز

**بەلان کەوتن**: خۆ مات کردنی کەروێشک و بەتەماڵ دەرنەپەڕین لە لانەکەی( وادیارە کەروێشکە شین بەلان کەوتووە.[ف] کنایە از خرگوشی کە در لانە خودرا پنهان مکند و بیرون نمی جهد.

**بەلبەشۆ**: ئاژاوە، کەس لە کەس، [ف]جنجال و سروصدا

**بەلبەلە شوانە**: زرەمەندێ، زیزرەمەندێ، گیایەکی بونخۆشە گوڵی سپی دەردەکا و گەڵا و لاسقەکەی تووکنە، تێکەڵ سیریژی دەکەن.[ف] اسم یک گیاە خوراکی

**بەڵشاندەر**: بزوێنەر، هاندەر، دنەدر.[ف] تحریک کنندە

**بەڵغی**: سەرەتای چنینی تەون.[ف] ابتدای قالیبافی

**بەڵکینە**: زمانە چکۆڵە.[ف] زبان کوچک

**بەڵگ**: (+) نەرمانی گوێچکە، ئەو شوێنەی کونی دەکەن بۆ گوارە.[ف] نرمەی گوش

**بەلووتنەک**: پێکی زۆرنا و نایە، زمانەی سەری زۆرنا، پیق، پیک.[ف] نرمادەی سرنا

**بەلەتورکە**: بەلەفیرە، زگچوون، تەقەفیرە.[ف] اسهال

**بەڵەتین**: گوریس، پەتێکی باریکە لە مووی بزن دروستی دەکەن بۆ بەستنەوەی گوێلک و کاژیلە و قایم کردنی چادری ڕەشماڵ، گوێلەوسار.[ف] ریسمان بافتە شدە از موی بز

**بەلەچەق**: بەلەچەک، کەلەپچە. *(گرتیان و بەلەچەقیان کرد.)* [ف] کلپچە

**بەلەچەک**: ☜ بەلەچەق

**بەلەخەت**: کووز، تۆمەشان.[ف] خطی کە برای شخم زدن تعیین میکنند

**بەلەریقە**: تەقەفیرە، زگچوون، بەلەفیرە.[ف] اسهال

**بەلەژنانێ**: ☜ بەلەکناچی

**بەلەکانەک**: کوندەبوو، بایەقووش.[ف] جغد، بوم

**بەلەکناچی**: کوڕی خووخدە کچانە، ژنانیلە، ژنیلانە.[ف] مرد زن صفت

**بەلەمرک**: هەنیشک، ئانیشک.[ف] آرنج

**بەلەمکێش**: بەلەمئاژۆ، سەوڵ لێدەری گەمیە، گەمیەوان.[ف] قایقران

**بەلەمیزکە**: ☜ بەلەمیسکە

**بەلەمیسکە**: میزە چرکە، چرتکە میزە، میزە چورکی.[ف] چکمیزک

**بەلەورەن**: بزنە کێویی دوساڵە تا سێ ساڵە.[ف] قوچ کوهی تا سالە

**بەلی**: (+) بەڕوو، بەرێکی دارمازووە.[ف] بلوط

**بەمۆ**: ناوی چیایەکە لە کوردستان.[ف] نام کوهی در کردستان

**بەن پێ بادران (بانەدران)** : دەرەقەت نەهاتن و پێنەوێران، ترسان لە دەمی کەسێک. *(من کوا بەنی ئەوەم پێ بادەدرێ؟)* [ف] کنایە از قدرت نداشتن در برابر کسی

**بەنامییە**: بەناوبانگ، ناودار، ناو بەدەرەوە، مەنشوور، بەناو.[ف] نامدار، مشهور

**بەنپرچ**: ئەو بەنەی کچان پرچی پێ دەبەستن. [ف] نخ بستن گیسو

**بەندروومان:** بەندروو، گشتەکە بەن بۆ جەواڵ دوورین. [ف] نخ جوالدوزی

**بەندەوار:** دیل، ئەسیر، بەردە. *(بە دیل و بەندەواری بەجێمام لەوێ.)* [ف] اسیر، گرفتار

**بەندیر:** کاوڕ، بەرخی دووساڵە. [ف] برەی دو ساله

**بەنکاڵە:** قەیتان، بەنی کاڵە لە پێ توند کردن. [ف] قیطان کفش

**بەنگزی:** قەشمەری، حەنەکچی. [ف] دلقک

**بەنگەژ:** روخسار، ڕەنگ و ڕوو، دیم، ئەدگار، دەموچاو. [ف] رخسار

**بەنگین:** (+) ئاشق، ئەویندار، دڵدار. [ف] عاشق

**بەنۆڵ:** گیایەکە گوڵێکی ورد و سپی دەردەکا. [ف] نام گیاهی است

**بەنەورۆ:** بە نێورۆ، مەیلی جووت بوونی پشیلە. [ف] میل جفتگیری گربه

**بەنێورۆ:** ☜ بەنەورۆ

**بەوروو:** بەورینگ، وردە سووتووی کە لەگەڵ دووکەڵ بەرز دەبێتەوە، پەپرووکە، بەورووک. [ف] خاکستر سبک که با دود بلند می‌شود

**بەورووک:** بەوروو. ☜ بەوروو

**بەورەڵوو:** وەروەرە، بەورەماڵ. [ف] پاروی برف‌روبی

**بەورەڵوو:** وەروەرە، شاپاڵۆخ، شاپاڵۆغ. [ف] داموز، برف‌روب

**بەورینگ:** بەورووک. ☜ بەورووک

**بهووراندن:** ڕابواردن، کات تێپەڕ کردن. *(ئێرە ژیان خۆش دێتە بهووراندن.)* [ف] بەسر بردن، گذرانیدن

**بەهارنارنج:** گوڵێکی سپییە لە پەڕۆ دروستی دەکەن بۆ سەری بووک. [ف] بهارنارنج

**بەهارە:** (+) نەخۆشییەکی چاوە لە کاتی بەهاردا. [ف] تراخما

**بەهرە:** (+) توانایی و هونەر لە کارێکدا، مرخ. *(شاعیرێکی بە بەهرەیە.)* [ف] استعداد

**بەهەڵم:** تاجیی ئازا و تیژ و چالاک لە ڕاودا. [ف] تازی چست و چالاک

**بەیتوون:** زەویی چۆڵ و کاکی بە کاکی کە بۆ کێڵان نابێ، بەیار. [ف] زمین بایر

**بەیتوونی:** بەیار. [ف] زمین بایر

**بەیتەرە:** ئاژەڵداری. [ف] دامداری

**بەیتیبلە:** بریتی لە قسە و باسی دوور و درێژ کە بڕانەوەی نییە. [ف] کنایه از سخنی که تمامی ندارد

**بەیی:** ناوی تیرەیەکە لە هۆزی مامەش. [ف] نام طایفه‌ای از ایل مامش

**بەیی:** برۆ، ئەبرۆ. [ف] ابرو

**بێجیکەڵدان:** کەم جیقڵدان، بریتی لە بێسەبر و تاقەت. [ف] کنایه از ناشکیبا

**بێئامان:** پڕ مەترسی، بریتی لە مرۆی هار و هاج، بێڕەزا. *(دەڵێی ئاوری بێئامانە، ئاو و ئاور بێئامانن.)* [ف] خطرناک، کنایه از آدم شلوغ

**بیاز:** ) شوێنی چۆڵ و خەڵوەت؛ ) زەویی پان و بەرین، دەشت. [ف] ) خلوت؛ ) زمین وسیع

**بیاڤ:** بوار، شوێنی پەڕینەوە لە چۆم، دەراو. [ف] گدار

**بیانگە**: بیانوو، پەڵپ، ورک، بیانگ، بەهانە، هەنجەت. *(بیانگەی پێمان گرتکە.)* ف بهانه

**بیبارە کێویلە**: گیایەکە بەرێکی ورد دەگرێ وەک بیبار وایە، وشکی دەکەن و دەیهاڕن بۆ زگچوون باشە. ف نوعی گیاه دارویی

**بێبوار لە ئاو دان**: بەبێ بیر کردنەوە و تێبینی کار ئەنجام دان. ف بی‌گدار به آب زدن

**بیبیجان**: بووکەڵەی شانۆ. ف عروسک نمایشی

**بیبیچنگ**: بایەقووش، جۆرێ کوندە لە کاولاشدا هێلانە دەکا و خەڵک دەڵێن چونکە ناتوانێ ڕاو بکا لە لایەن خوداوە ڕۆژی دوو چۆلەکە دێن لە بەردەمی دەنیشنەوە و دەیانخوا. ف بوف کور

**بێتاشا**: بێباک، نەترس. ف بی‌باک

**بیتانۆ**: ناوی گوڵێکە. ف اسم گلی است

**بیجادە**: جۆرە یاقووتێکە. *(سم وەکوو یەشم و لە پەشم و توکی پێدا سەرنگوون/ چاو وەکوو بیجادە یا دوو شەوچراغی شوعلە ڕێژ «نالی».)* ف نوعی یاقوت

**بێچاوێنی بوون**: بەچاوەوە نەبوون لە چاوی پیس بە دوور بوون. *(یاخوا بێچاوێنی بێ زۆر ژیانێکی خۆشی هەیە.)* ف دور بودن از چشم حسود

**بیچکۆڵانە**: ☜ بیچکۆڵە

**بیچکۆڵە**: چکۆڵانە، بچووک. ف کوچولو

**بیچگ**: ☜ بیچکۆڵانە

**بێح**: بێحانە، پارەی پێش کڕین. ف بیعانه

**بێحانە**: ☜ بێح

**بێخود بوون**: بوورانەوە، بێخودی. *(وەخت بوو دڵم بێخود بێ.)* ف غش کردن

**بێخودا**: کافر، بێدین، بێبەزەیی. *(پیاوێکی بێخودایە، بەزەیی وەکەسا نایە.)* ف کافر، بی‌رحم

**بێ خودایی**: بێ ڕەحمی، بێ بەزەیی بوون. ف ستمکاری، بی رحمی.

**بێخەوش**: بێعەیب، بێگەرد. *(دەڵێی زێڕی بێخەوشە.)* ف بدون عیب

**بێدڵی کردن**: دڵ شکاندن. ف دل شکستن

**بێدەم و دوود**: بێدەم و دوان، نەدوێن، کەمبڵێ. ف کم حرف

**بێراخ**: بەیداخ، ئاڵا، پەرچەم. ف علم، پرچم

**بیرداڕێژەر**: کەسێک کە بیر و ڕایەکی تازە بۆ کۆمەڵ دادەڕێژێ، بیرمەند. ف نظریه‌پرداز

**بیرگە**: دالغە، زەین. ف حافظه

**بێرم**: زەلکاو، باتلاغ، زۆنگ، خمخۆرک. ف باتلاق

**بیرۆڤ**: (+) خونچە، پشکۆژ، چرۆ. ف غنچه

**بیرۆکە**: ئەندێشە، فکرە. ف اندیشه

**بیرە بیرە**: وازی وازی، کەسێک کە هەرتاوی لەسەر بڕوایەکە. ف آدم وسواس

**بیرەخەو**: سەرخەو، چوونە بیرەوە و هۆش لێبڕان. ف فرو رفتن در خیال و اندیشه

**بێزە**: (+) بێزوو، مەگیرانی، مگێر، مژدی. ف ویار

**بێزەون**: قێزەون، بە قێز و بێز. ف وسواس در غذا خوردن

**بیژمۆت**: ) بیژوو، زۆڵ؛ ) بریتی لە منداڵی زۆر هار و بزۆز و شەیتان. ف ) حرامزاده؛ ) کنایه

از بچەی شلوغ و شیطان

**بێژمۆتــە**: بیــژوو، زۆڵ، بێژمیلــەک. بــیچ.ف حرامزادە

**بێژمیلەک**: ☜ بێژمۆتە

**بێژی**: یاڵ، بژ، مووی سەر ملی ئەسپ و شێر. ف یال

**بێستانەمارە**: گیایەکە وەکوو مالۆنچە وایە بە زەویدا پان دەبێتەوە و دەور و بەری خۆی دادەگری و بەرێکی وەک لیمۆ دەگری. کاڵەکەمارانە.ف هندوانەی ابوجهل

**بێسەرەوبەرە**: هەر کەس هەر کەس، تێکە و لێکە. *(ماڵێکی بێسەرەوبەرەیە.)* ف هرکی هرکی

**بێقابیلەت**: ناقابیل، *(لەسەر گرکەیەکی بێقابیلەت خەریک بوو لەگەڵمان بە شەڕ بێ.)* ف بی‌ارزش

**بێقسەیی کردن**: جواب نەدانەوە، بەگوێ نەکردن.ف فرمان نبردن

**بــێقــولاغ**: ون بــوو، بــێســەر و شــوێن.ف مفقودالاثر

**بێقوونەبان**: تەمبەڵ، کار لە دەست نەهاتوو، دەستەوستان، زەغەڵ، تەوەزەل. ف تنبل

**بێکش**: بێدەنگ، مات.ف ساکت

**بێکەسکوژ کردن**: بریتی لە کەسێک کە بە تەنیا وەگیر دوژمن دەکەوێ و نامەردانە دەیکوژن. ف کنایە از کسی کە تنهایی بە دام دشمن می‌افتد و نامردانە او را می‌کشند

**بێگــەرد**: بــێخــەوش، پــاک و خــاوێن.ف ☜ بێخەوش

**بیلاتەژبی**: ☜ بیلامانێ

**بــیلاخ**: قامکــە گــەورە، کلکــەزلــە، تلیامــەزن، تلیابەرانکێ.ف انگشت شست

**بیلامانێ**: بیلاتەژبی، تەژبی بێ، دوور لە تۆ.ف دور از روی شما

**بێلاندن**: بێڵە، دەنگی کارژۆڵە، کاژیلە دەبیلێنێ. ف صدای بزغالە

**بێلایەن**: بێتەرەف. *(بێلایەنە کاری بەسەر هیچ لایەکەوە نییە.)* ف بی‌طرف

**بیلبتــوون**: بــەتێکــڕا، بــەتــەواوی، *(بــە گــەورە و بچووکــەوە بیلبتــوون هــاتبوون.)* ف همــە بــا هــم، همگی، بلااستثناء

**بیلعــەت**: کــاری ناحــەز، کــاری کوونییانــە، کــاری جڵفانە.ف کار زشت

**بــێلووتــە**: جۆرێ نۆکە سپیلکەیە بۆ لەبلەبی دەبێ.ف نوعی نخود برای نخودچی

**بیلــە**: جۆرێک کــەوشــی قــەدیمــی ژنانــە بــوو.ف نوعی کفش قدیمی زنانە

**بێڵــەبــاو**: ڕادانــی قــوڕ و خــۆڵ بــەدەمــی بێــڵ.ف روبیدن گل و لای با بیل

**بێڵەســاو**: خــاوێن کردنــەوەی کــەرێز و کــانی.ف پاک کردن کاریز و چشمە.

**بێڵەق**: تانە، تەشەر، لاتاو.ف طعنە

**بێڵەقان**: بێڵەکان، پیشکان.ف بیلک گیاەکنی

**بیلەقدەر**: تانەلێدەر، کەسێ کە هەمیشە خەریکی فڕ و لاتاوە.ف طعان

**بیلەمڕ**: ژیلەمۆ، خۆڵەمێشێک کە وردە پۆلووی لە ژێر دایە.ف آتش زیر خاکستر

**بــین پێــوەنــان**: دەم بــە ئــاوەوە نــان و چــۆڕە

لێبڕین.ف دهن در آب گذاشتن و نوشیدن

**بین خواردنەوە:** هەناسە کۆ کردنەوە لە سینگدا کاتی شمشاڵ لێدان.ف نگاه داشتن نفس هنگام نی زدن

**بین کێشان:** هەناسە کۆ کردنەوە لە سینگدا لەژێر ئاودا.ف نگاه داشتن نفس در زیر آب

**بینبەر:** دیمەن.ف منظره

**بینبینۆکە:** تینتینۆکە، قورقوڕاچکە، ئەوک.ف حلقوم

**بێنەوبەرە:** هێنان و بردن و ئازار دان، گێرە و کێشە. *(ڕزگارمان کە ئیتر ئەو بێنەوبەرەیەمان بۆ پێ‌دەکەن؟)* ف اذیت کردن و آوردن و بردن کسی

**بێوان:** بیاوان، بێروون، جێگەی دڕندە و جانەوەران.ف بیابان

**بێوەسیری:** باوەسیر.ف ☜ باوەسیر

**بێهۆ:** بێهوودە، لەخۆڕا.ف بیهوده



**پا پیاگ**: پیادە، بە پای پیادە. *(چوار سوار و دوو پا پیاگ بوون.)* ف پیادە

**پا لێ نەبڕین**: سەردانی بەردەوام. *(تۆخوا زوو زوو سەری بدە و پای لێ مەبڕە.)* ف دیدنی پیوستە

**پاپا کردن**: خۆ خافڵاندن، خۆ خەریک کردن. *(پاپا بکەن تا خەوەری ڕاسی تێی وەدەسمان.)* ف خود مشغولی و درنگ کردن

**پاپارنجێ**: یارییەکی منداڵانەیە، پشت بە پشتی یەکترەوە دەنێن و هەرکام بە نۆرە کۆم دەبنەوە و ئەوی دیکە بە پشتەوە دەکەوێتە سەر پشتی ئەوی‌تریان. لەکاتی یارییەکەدا ئەو شێعرە دەڵێنەوە. *(پاپارنجێ، کۆترە قرینجێ/ کۆترە قرینجێ، پاپارنجێ.)* ف اسم یک بازی کودکانە

**پاپۆکە**: تێک هاڵانی مار، قەف خواردنەوە، پەپکە. ف چنبرە زدن مار

**پاپووچکە**: پاپووچە، کەوشی منداڵانە، پاپەجانە. ف کفش بچە

**پاپەل کردن**: قرتاندنی گەڵای سیس و زەرد بووی لای خوارەوەی نەمام و بڕکە وتووتن. ف چیدن برگهای پایینی نهال و بوتە توتون

**پاپێژ**: جۆرێک دەوە یان تەپاڵە کە بە پا دەیپێژن، تەپاڵەی خڕ و گەورە. ف نوعی تپالە کە با پا می‌سازند

**پاترا**: گوم، بێ‌سەر و شوێن، *(مانگێکە پاترا بووە و بە هەواڵی نازانم.)* ف گمشدە

**پاتۆنیا**: ناوی گوڵێکی دەرمانییە. ف گیاهی دارویی

**پاتووک**: شڕ و کۆنە، پڕتووکاو، پۆکاو، پواو. ف پوسیدە

**پاتیلۆک**: کەباب، گۆشتی برژاو. ف کباب

**پاچاندنەوە**: پەرچ کردن، پەرچاندنەوەی تەنەکە

و بزمار.ف پرچ کردن میخ و حلبی و...

**پاچرا:** پیّچرا، ئەو پارەی لە قوماردا دەدرێ بە خاوەن قاوەخانە.ف پولی کە قماربازها بە قهوخانە می‌پردازند

**پاچناڤ:** نازناو، ناوی هەڵبژاردە.ف اسم مستعار

**پاخس:** ژەنگ، غەور.ف زنگ

**پاخلێر:** کاکڵە گوێز.ف مغز گردو

**پارچک:** چەکچەکیلە، شەمشەمەکوێرە.ف خفاش

**پارچە پارچە بوون:** لەتلەت بوون.ف تکە تکە شدن

**پارچە پارچە کردن:** لەتلەت کردن.ف تکە تکە کردن

**پارچە پارچە:** لەتلەت، پارە پارە، پاژپاژ.ف تکە تکە

**پارچینە:** پلیکان، قاڵدرمە، سولەم.ف پلکان

**پارخان:** پەراسوو، پارسوو.ف دەندەی سینە

**پارخخە:** لاق ئێشەی ماڵات، تەبەق. *(ئەڕا رێ نیەکەی، پارخخە گرتیە؟)* .ف نوعی بیماری سم دام.

**پاردە:** (+) دیواری هەڵچنراو بە وشکە بەرد، وشکەچن، وشکە کەڵەک *(بەڵێنی راگەیاندێ راسپاردە/ وتی بۆت دێتە بن ئەو پاردە، غار دە «هێمن»)*.ف دیوار سنگی بدون گل

**پارزۆنگ:** (+) پاڵوێنە، فلتێر.ف فیلتر

**پاروو:** (+) ) قاڵبی سابوون؛ ) یەکەی بژاردنی سابوون. *(دوو پاروو سابوون بکڕە.)* ف ) قالب صابون؛ ) واحد شمارش صابون

**پارووبژێر:** بریتی لە مرۆی سەقیل و بەرچاوتەنگ، کەسێک کە حەزی لە میوان نییە و پێی خۆش نییە کەس نانی بخوا.ف کنایە از آدم خسیس

**پارەدان:** پووڵدانک، داخڵە، دەخیلە.ف قلک

**پارەدێن:** پارەدان، دەخیلە، پووڵدانک، داخڵە.ف قلک

**پارەستوو:** پەراسوو، پارخان، پارە هەستوو، پارسوو.ف ☜ پارخان

**پارەش:** پیّڕەش، نەخس، سەرونەشەمە خراپ، بەدقەدەم، دژی قەدەمخێر.ف شوم، نحس

**پارەکەوشانە:** پارەیەک کە دەیخەنە نێو کەوشی بووکەوە کاتێک لە ماڵە باوانەوە بۆ ماڵی زاوا دەگوێزرێتەوە.ف پولی کە هنگام عروسی در کفش عروس می‌گذارند

**پارەهەستوو:** پەراسوو☜ پارخان

**پازازک:** پاسەوان، قەرەوڵ، کێشکچی.ف نگهبان

**پاژنە تاقرانی:** جۆرێک کەوشی قەدیمی بوو، بن‌عانە.ف ☜ بن عانە

**پاژنە فەرشی:** جۆرێ کەوشی پاژنە تەختە.ف کفش پاشنە تخت.

**پاژنە مێشولە:** جۆرێ کەوشی ناڵچە باریکی ژنانەیە.ف نوعی کفش پاشنە باریک

**پاژنەپڕ:** ژنی قولاپە و پاژنە خڕین و قەڵەو. *(خودا ژنێکی پاژنەپڕت بداتێ.)* ف زن پاشنە و پشت پا چاق

**پاژەر:** کۆڵەکە، ئەستوون.ف ستون

**پاساو دانەوە:** بەرپەرچ دانەوە، هەس دانەوە،

تەست دانەوە.[ف] برگرداندن

**پاستاو:** ) یەکەمین ئاو بۆ زەوی؛ ) کۆگا گڵ کە قـوولکێکی لـەسـەر دروست دەکـەن و ئـاوی تێدەکـەن بـۆ قـوڕ لـە کـوورەخانـە.[ف] ) اولـین آبیاری مزرعە؛ ) جمع کردن تودە خاک و آب ریختن در گودی آن و تبدیل کردن آن بە گل در کورەی آجرپزی

**پاسرگیاگ:** گڕ گرتوو، کڵپە کردوو.[ف] ملتهب

**پاسرگیان:** بڵێسە کێشان، گڕ گرتن.[ف] التهاب

**پاشاو:** قووناو، خەساراو، ئاوێک کە لە گۆلاودا دەمێنێتەوە.[ف] مانداب

**پاشبانگ:** ماندوو بوونی کەو لە خوێندن کە دەنگێکی تایبەت دەردێنێ.[ف] صدایی مخصوص در خواندن کبک هنگامی کە خستە می‌شود

**پاشکرا:** ڕەوا، حەڵاڵ.[ف] حلال، جایز

**پاشکەل:** دیاری کردنی گوێی بەرخ و کاژیلە کە لای دواوەی گوێچکـەی تـۆزێ هـەدەدڕن.[ف] نشانە کردن گوش برە و بزغالە از طرف عقب

**پاشمەڵلا:** کەسی دووهەم لە کایەی مێشێندا.[ف] نفر دوم در تیلەبازی

**پاشنوێژ:** دوانێوەڕۆ، دوای بانگی نیوەڕۆ.[ف] بعدازظهر

**پاشەکشێ:** ) پاشە و پاش کشانەوە؛ ) هاتنە دواوە لە شەڕدا، *(هێزەکانی دوژمن تووشی پاشەکشی بوون.*[ف]*)* ) عقب عقب رفتن ) عقب‌نشینی در جنگ.

**پاشەڵپیس:** ) بریتی لە ڕابردوو ناشیرین، کەسێک کە لە ڕابردوودا کاری خراپی کردووە؛ ) کەسێک کە لای دواوەی جلەکانی پیسە[ف] بدسابقە؛ ) کسی کە عقب لباسش کثیف است.

**پاشەوار:** ئاسەوار، بەرهەمی دوای نەمان. *(گەر کەمێ نەخشت هەبێ بۆ پێکز و چینی هەژار/ پاشی مردن تۆ دەناسێنی بە کۆمەڵ، پاشەوار «ڕاوچی».)* [ف] آثار

**پاک کردن:** (+) بریتی لە دانەوەی قەرز و قۆڵە *(دوێنێ چووم قەرزەکەم لەگەڵ دووکانەدارەکە پاک کرد)* [ف] تسویە حساب

**پاکتاو:** (+) بە تەواوی، بیلبتوون، *(ماڵەکە پاکتاو سووتا.)* [ف] بەکلی

**پاکژ:** خاوێن، پاقژ.[ف] پاکیزە

**پاکۆ:** (+) ) دوایی، کۆتایی، ئاکام) جۆرێک شەڕواڵی کوردییە.[ف] انجام، انتها

**پاکی نەهاتن:** دڵ پاک نەبوونەوە، ڕق لە دڵ دەر نەکردن. *(هێندە ڕق ئەستوور و دەخەزدارە قەتی پاکی نایە.)* [ف] کسی کە هموارە کینەتوز باشد

**پاڵ گەڕان:** لە گەڕ نەکەوتن، بەردەوام بوون. *(پاڵت بگەڕێ ئیشەڵلا.)* [ف] از پا نیافتادن

**پالاوگە:** شوێنی پالاوتن و هەڵگوێستنی نەوت. [ف] پالایشگاه

**پاڵمە:** پاڵمە، پالمە، پاڵدرمە ☜ پاڵدرمە

**پاڵتوو تەکانن:** ڕیایی کردن، تەشی ڕێسی کردن، ماستاو کردن. *(بەسە کەم پاڵتوو بتەکنن.)* [ف] تملق

**پاڵدرمه:** جۆرێ شنگی گەڵا پانە، پاڵمە، پالمە.ف نوعی شنگ

**پاڵدەر:** پشتیوان، جێباوەڕ، باوەڕ پێکراو.ف مرجع

**پاڵگە:** پاڵپشت، جێی پاڵ پێوەدان.ف متکا

**پالمە:** (+) ) ئاڵەکۆک، هەڵاکۆک، گیایەکە بنەکەی خڕە و دەخورێ) جۆرێک شنگی گەڵاپانە.ف ) نام گیاهی است) نوعی شنگ.

**پاڵنەر:** ئەنگێزە، دنەدەر، هاندەر.ف انگیزە، محرک

**پاڵۆش:** تێکەڵ، ئاوێتە، ئامێتە.ف آمیختە.

**پاڵۆشت:** پاڵوپشت، پاڵگە.ف ☜ پاڵگە

**پاڵوو:** سووچ، گۆشە. *(ژوورەکە شەش پاڵووە.)* ف ضلع

**پاڵوێن:** پاڵوێنکە، پاڵوێنە، پارزۆنگ، شیرپاڵۆک، پەڕۆیەک شتی ئاوەکیی پێ دەپاڵێون.ف پالوونه

**پالەرزە:** لەرزینی لاق، وشەیەکە بۆ ژەمەخوێری و عەسرۆژە کە ژەمێکە لەنێوان فراوێن و شێودا، یانی لەو ماوەیەدا لە برسانا لاقیان دەلەرزێ و دەبێ نان بخۆن.ف غذا خوردن گارگر و کشاورز هنگام عصر

**پاڵەستۆ:** پاڵەپەستێ، پاڵەپەستۆ.ف فشار

**پاڵەکی:** کەژاوەی سەر ئاوەڵا.ف کجاوەی رو باز

**پامل بوون:** پێمل بوون، ناچار بوون. *(فره پاملی مەوە.)* ف مجبور شدن

**پامل کردن:** پێمل کردن، ناچار کردن. *(پاملی کرد تاچگ ئەولیا.)* ف مجبور کردن

**پامل:** پێمل، ناچار.ف مجبور

**پامەلە:** مەلەپایە، مەلەپێیە، مەلە کردن بە پێ.ف شنا با پا

**پامێدە:** ) جۆرێک ئوتۆمۆبیلی قەدیمی بوو. ) شەک و کاوری دابەستە و قەڵەو و جوان. *(مریەمێ چەندە جوانی/ چەند بەناز و عینوانی/ هەر دەڵێی پامێدەیە/ دێتەوە لە ڕێی کانی «برایم فەتاحی».)* ف ) نوعی ماشین قدیمی.) برەی چاق و چله و زیبا

**پانتا:** بۆشاییی ئاسمان.ف فضا

**پانکە:** جانەوەرێکی چکۆڵەی پانە وەک کەرەجنە وایە ڕەنگی قاوەییە بەسەر پێستی لەشدا بڕوا لیرگی پێدەکا، گەنەکەوڵە.ف ساس

**پانەڕێ:** شەقام، شارێ، جادەڕێ.ف بزرگراه

**پانەسێڵە:** مرۆڤی پان و پۆڕ، شتی پان.ف هر چیز پهن و بزرگ

**پاوار:** مسافیری دەستەنگ کە لە ڕێدا دەمێنێتەوە.ف مسافر تهی دست کە در راه می‌ماند

**پاوزاخە:** چاوزەقە، دڕوویەکی تیژە لەنێو مەزرادا دەڕوێ.ف نام گیاهی خاردار

**پاومان:** تەشک، داوێن، لە پشتێنە بەرەوخوار.ف دامن.

**پاوەشانە:** دیاریی زاوا بۆ بووک بەرلە چوونە پەردەوە.ف هدیەی داماد برای عروس قبل از رفتن به حجله

**پاوەشانی:** پاوەشانە ☜ پاوەشانە

**پاهەڵەن:** گیای بەهاری، سەوزە گیای دەمەو

بەهار، شینکە.ف گیاه بهاری

**پایدۆزی:** پایدۆس، دەست لە کار کێشانەوە.ف دست از کار کشیدن.

**پاییزە:** (+) ) شەختە، شەخسە، سەرمای پایز کە گژ و گیا دەشەمزێنێ. *(گوڵەکەم باخی دڵم پاییزە لێی‌داوە بڕۆ/ تۆ گەشی هەڵدەپرووکێی مەیە ئەمناوە بڕۆ «ئاسۆ».)* ) مەقامێکی کۆنی کوردییە بە دەنگی زۆربەی بەیتبێژەکان تۆمار کراوە.ف) سرمای پاییزی آفت کشت) نام آهنگی قدیمی

**پاینجە:** پەیجە، پەینجە، پەیژە، ناردیوان، نیردیوان، سولەم، قاڵدرمە، قادرمە، سلەم.ف نردبان

**پخ:** ) دەنگ دانی بەرخ؛ ) وشەی ترساندنی منداڵ.ف) صدا زدن بره؛ ) کلمه ترساندن بچه

**پڕتووکاو:** داپۆکاو، ڕزیو، پواو. *(بۆ تێکۆشانی ڕۆژی ماسی‌ڕاو/ نەختێ شریت و تۆڕی پڕتووکاو/ لەگەڵ قولاپێ کۆن و ژەنگ‌هێناو/ هێناوییە ئەمڕۆش بیانخاتە ئاو «شەریف».)* ف پوسیده

**پرچگ و پلار:** تیر و تانە، توانج و تەشەر.ف سرزنشت

**پرچە:** ترووسکە، شەبەق، درەوشان.ف درخشش

**پرچەماتێ:** درەوشانەوە، ترووسکانەوە.ف درخشیدن

**پرزوولگ:** پرزۆڵ، پرزۆڵە، بزگور، تیتۆڵ.ف تکه پارچەی کوچک و کهنه

**پرزە لێبڕان:** لە تاقەت کەوتن، ماندوو بوون، هێز لێبڕان(هێندە ماندوو بووین پرزەمان لێبڕا.) ف از رمق افتادن

**پرزە لێبڕاو:** هێز لێبڕاو، شەکەت بوو.ف از رمق افتاده

**پرزە لێبڕین:** ماندوو کردن، بەزاندن، هێز لێبڕین.ف از رمق انداختن

**پرسیارپێچ کردن:** پرسیار کردنی زۆر لە کەسێک و بە پرسیار سەرلێشێواندنی.ف سؤال‌پیچ کردن

**پرشکە:** پریشکە، پشکی ئاو.ف پشنگ آب

**پرشنگدار:** بریقەدار، ڕووناک و درەوشاوە.ف درخشان

**پرکە:** پرمە، دەنگی پێکەنین. *(دانەی لە پرکەی خەنگ.)* ف صدای خنده

**پرنگانەوە:** ☜ پرینگانەوە

**پرینگانەوە:** پرنگانەوە، سڵەمینەوە، سڵە لێ کردن. *(لە هیچ شتێک ناپرینگێنەوە)* ف پرهیز و دوری کردن

**پرووپاتاڵ:** (+) ئاژەڵ و حەیوانی ماڵی.ف حیوان اهلی

**پرووپرتۆخ:** گێڕانەوەی بەسەرهات لە بنج و بناوانەوە، باس کردن بە تێر و تەسەلی. *(تەواوی ڕووداوەکەم پرووپرتۆخ بۆ گێڕایەوە.)* ف تعریف کردن بی کم و کاست

**پرووپنجڵ:** پیس و چەپەڵ، نارێک.ف کثیف و نامرتب

**پڕووزان:** (+) بریتی لەو کەسەی لە کایەدا خەتا

دەکا و دەر دەکرێ. *(پێت لە خەتەکە نا پرووزای برۆ دەرێ.)* ف خطا کردن در بازی و اخراج شدن.

**پرووش:** ریشاڵی قەراغی پارچە. *(پەراوێزی دەسرەکەم پرووشی هەڵداوە.)* ف پارەهای باریک قماش

**پرووکان:** هەڵپرووکان، بزرکان، پووکانەوە. *(شەو راشکا / ئەژنۆم شل بوو /مانگ بە تاقی ئاسمانەوە هەڵپرووکا «پەشێو».)* ف پژمردە شدن و رنگ باختن

**پرووکاندن:** هەڵپرووکاندن، بزرکاندن. ف پژمردە کردن

**پرووکاو:** هەڵپرووکاو، بزرکاو. ف پژمردە شدە و رنگ باختە

**پریچک:** ) پریشک، پریشکە، پشکی ئاو ) پریشکی تۆپ و قومبەڵە و... ف ) پشنگ آب ) ترکش توپ و خمپارە و...

**پرێزگ:** پرێسکە، پریاسکە. ف صرە، بقچەی کوچک.

**پرێزە:** سەلیقە، ڕێک و پێکی لە کاردا. ف سلیقە

**پریشکە:** ☜ پرشکە

**پریڤ:** شەبەق، پرشنگ، تروسکە. ف درخشش

**پرێمز:** پەرەمێز، پەرامێز. ف نوعی چراغ نفتی تلمبەدار

**پزلووخ:** پووزلەخ، پووزەوانە. ف ساقبند

**پزوو:** (+) گیایەکە لاسقی برگە برگەی هەیە، کاتێک مەڕ نەخۆشیی پزوو دەگرێ (پزوو) لە ملی دەکەن و بڕوایان وایە چاک دەبێتەوە. ف اسم گیاهی است

**پژگ و بڵاو:** پرژ و بڵاو، تێکەڵ و پێکەڵ. ف پراکندە و بەهم ریختە

**پژگیر:** خاولی، مەرحەمە، پشتەماڵ. ف حولە

**پژلمە:** سیس، ژاکاو. ف پژمردە

**پژلمیان:** ژاکان، سیس بوون. ف پژمردن

**پژوو:** لق و پۆپی دار، پەلوپۆی دار. ف شاخە و برگ درخت

**پسوولە:** نووسراوە، کاغەزی چکۆڵەی یادداشت. ف نوشتەی کوچک

**پسینچک:** ناوی گیایەکە. ف اسم گیاهی است

**پشاڕەش:** جەرگ، کەزەب. ف جگر

**پشاسپی:** سیپەلاک، پیلاسپی. سیپەلک. ف ریە، شش

**پشت بە خووسار:** سیخوار لە پشت، بریتی لە کەروێشکی قەڵەوی پاییزان. ف خرگوش چاق پاییزی

**پشت دەرکانە:** دابێکی کۆنی کوردەواری کاتی زەماوەند ژنێک دەچووە پشت دەرگای ئەو ژوورەی بووکی لێبوو، نەیدەهێشت بووک بێتە دەرێ هەتا شتێکیان پێنەدایە. ف یک نوع انعام هنگام عروسی

**پشت ڕاست کردنەوە:** بە بەڵگەوە سەلماندن. *(قسەی ئەوی پشت ڕاست کردەوە.)* ف تایید کردن سخن کسی

**پشت ماسیلکە:** جۆرێ دروومان. ف نوعی بخیە

**پشتاو:** (+) ئاوێکی کە لە پشتی جۆگەوە دادەشکێ و لە زەوی ئاژین دەکرێ. ف آبی کە

از پشت جوی به طرف زمین هدایت می‌شود

**پشتک**: شیتک، پشتوێن، پشتێند، پشتێن، شووتک.[ف] شال کمر

**پشتگر**: مامان، قابیله.[ف] ماما، قابله

**پشتگورد**: تەختەیەکی درێژە دەیخەنە نێوەڕاستی ڕایەڵی فەرشەوە و تاڵەکانی پێ گورد و واز دەبێ.[ف] تختەای دراز که در میان تارهای فرش قرار می‌گیرد

**پشتوو**: دەمانچە، شەشلوول.[ف] تپانچە

**پشتە پەڵە**: دووهەمین بارانی پەڵە لە پایزدا.[ف] دومین باران پاییزی

**پشتە دەرێ**: پشت دەرکانە.[ف] پشت دەرکانه

**پشتەپەل وێستان**: ) ڕووە هەڵماڵدراوانە لە هەمبەر کەسێکی گەورەتر لە خۆدا ڕاوەستان؛ ) بریتی لە دەسکە پێمەڕەیەک کە تۆزێ بەلای پشتەوەدا خوار بێتەوە، پشتە وشکێن.[ف] ) پررو شدن در برابر بزرگتر از خود؛ ) دسته بیلی که در وسط اندکی خم شده باشد

**پشتەپەل**: ڕوو لێک کرانەوە، ددان لێک سپی بوونەوە. *(هێندە بە دەم کوڕەکەیەوە دا ئێستا پشتەپەل بوون.)* [ف] پررو شدن در برابر بزرگتر از خود

**پشتەجووڕە**: قنگەجووڕە، قوونەجووڕە، ئێسکی پاش قنگی مریشک.[ف] استخوان‌بندی تخمدان مرغ

**پشتەڵ پشت**: پشتاوپشت، پاشەوپاش ڕۆیشتن. *(وە پشتەڵ پشت هاتەو.)* [ف] عقب عقب راه رفتن

**پشتەوقەفار**: لەسەر پشت کەوتن، لەسەر پشت ڕاکشان. *(پشتەوقەفار خۆی ڕاکێشا بوو.)* [ف] به پشت خوابیدن

**پشتێندە**: (+) پشتێنە. *(پشتێندەیەک بەفر باریوە.)* [ف] کمر

**پشتێنە**: (+) نێوقەد، کەمەر، ناوقەد. *(هەتا پشتێنەی لە قوڕ هەڵکێشابوو.)* [ف] کمر

**پشدێن**: پشتێن، پشتوێند.[ف] شال کمر

**پشقەڵ**: پشکەڵ، کشپەڵ، پشقڵ.[ف] مدفوع گوسفند و بز و خرگوش...

**پشکۆڵ**: چۆڵەپێچەن، شەوژەن، داخستنی درگا بە دارێکی گەورە. *(درگاکەیان لە ناوەوە گاڵە دابوو، پێموا پشکۆڵیان خستبوو.)* [ف] بستن در با تیر چوبی بزرگ

**پشکووک**: پشکۆژ، دوگمە، قۆپچە.[ف] دگمه

**پشکیل**: مازوو، ئەو شتە خڕەی گۆرەویبازیی پێدەکەن.[ف] تیلەی جوراب‌بازی

**پشکێنەر**: ئەو کەسەی دەپشکنێ، پشکن.[ف] مفتش

**پشیلۆکە**: پشیلۆک، پەپوولە پایزە، پشیلە پایزە، باویلکە، شەلەمکەرە، شەلەمینکەرە.[ف] قاصدک

**پشیلە کوەیلە**: پشیلە کێوی.[ف] گربەی وحشی

**پشیلە کێوی**: ☜ پشیلە کوەیلە

**پفکە**: بلۆق، پۆرک.[ف] تاول

**پڤڵە دان**: هەڵتۆقان، بلۆق کردن. *(خارچک پڤڵە داگە.)* [ف] برآمدن

**پڤڵە کردن**: ☜ پڤڵە دان

**پفەک**: دروستکراوێکە لە گەرمەشانیی لێکراو و ڕۆن و خۆی و پەنیر کە مندال زۆریان

پێخۆشە.ف پفکنمکی

**پلپۆسەکی**: ڕزیو، گنخاو، پواو، پەڕپووت، پڕووکاو.ف پوسیده

**پڵتۆخ**: (+) پیس، گەمار، چەپەڵ.ف کثیف

**پڵتەخۆری**: زۆرخۆری، خواردنی زۆر لەسەر یەک و نەخۆش کەوتن بەو هۆیەوە. *(هێندەی پڵتەخۆری کرد لەو باخە بۆیە نەخۆش کەوت.)* ف پرخوری

**پلک و پلتوور**: بە هەموو ئافرەتانی خزمی دایک و باوک دەگوترێ، یانی پوور و پوورزا

**پلوورگە**: پلووسک، لووساوک.ف ناودان

**پلووک**: کڵۆ، لەتی چکۆڵە. *(پلووکێ قەن بدە پێم.)* ف حبەقند

**پلووکە بەرد**: بەردی چکۆڵە، لەتی وردی بەرد، ورکە بەرد.ف خردە سنگ

**پلیان**: سووڕان، هەڵخولان. *(کەفتەسە پلیان وە دەور خوەیا.)* ف چرخیدن

**پلیخاندنەوە**: فلیقاندنەوە.ف لە کردن

**پلیک**: چڵکن، پۆخڵ، پیس، لەگەڵ چڵیک دێ، چڵیک و پڵیک.ف کثیف و چرکین

**پلیمۆت**: بەد دیمەن، ناحەز، دزێو، ڕەزا گران.ف زشت رو

**پلینکان**: پێلپێلک ☜ پیلپێلک

**پنج بەستن**: ڕیشە داکوتان، شین بوون و گەشە کردن.ف روییدن و ریشە دوانیدن

**پنج و مۆر**: (+) بە کەسێک دەڵێن کە لە ژوور کرا بێ و نەهێڵن بێتە دەرەوە. *(بێچارە لە ژوورێدا پنج و مۆر کراوە.)* ف زندانی کردن در خانە

**پنجڵ**: پیس و چەپەڵ، کەسێک کە هەمیشە شل و شەوێق و داوێن قوڕاوییە.ف کثیف

**پنچک**: (+) گیایەکە وەک قەیاغ وایە لە زەلکاو و قەراغ ئاو دەڕوێ، مەترێک بەرز دەبێتەوە و بۆ باقەبێن کەڵکی لێ وەردەگرن.ف نام گیاهی باتلاقی

**پندڕ**: دڕاو، شڕ و پەتۆر، ڕیشاڵ ڕیشاڵ، شندڕ و پندڕ.ف ☜ پەتۆر

**پندرحاڵی**: ناحاڵی، لا، بەدگووز.ف لجباز

**پندرە**: بە ئەدەب، فەقیرۆکە، بێدەنگ و ئاقڵ.ف آرام و بی سروصدا

**پندوو**: ناوی گیایەکە.ف اسم گیاهی است

**پنگەڵ**: پنگەی پیر، پنکەیەک کە لاسقەکەی ڕەق بووبێ.ف پونەی پیر

**پۆ باریک**: بەنێکی باریکە وەک دەزوو لە تەوندا کەڵکی لێ وەردەگرن.ف پود باریک در فرشبافی

**پوار**: گیایەکی گەڵا باریکە بستێک لە زەوی بەرز دەبێتەوە و گوڵەکەی وەک گوڵە جۆ وایە. ف اسم گیاهی است

**پۆپەشاخ**: دوندی کێو، لووتکە، ترۆپک. *(هەور لە دەشت و کێو و پۆپەشاخان/ کردی بە تۆپ تەقاندن و چراخان «هەژار».)* ف قلەی کوه

**پۆتر**: کرێم، شتێکە دەست و دەم و چاوی پێ چەور دەکەن.ف کرم، پماد

**پۆڕتووکاو**: پرتووکاو، پواو.ف پوسیده

**پۆرخس**: پۆرخز، چەمووش، سەرقورس.ف

خیرەسر

**پۆز**: فیز، دەمار، هەوا.ف تکبر

**پۆزەتیڤ**: ئەرێنی، موسبەت.ف مثبت

**پۆشێنەر**: داپۆشەر.ف پوشاننده

**پوفەبا**: نەرمەبا، شنەبا، سروە.ف نسیم

**پۆلاینە**: پۆلانیا، مانای هەنبانە بۆرینە راست نییە، بە وەسەر خستنەوەی گاسن دەڵێن نەک دەمەزەرد.ف جوش کردن تکەای آهن بە نوک گاوآهن

**پولپولۆز**: ئالۆزاو، ئالۆزکاو. *(یەکی ناڤ گوندێ دەروێشێک ڤان ڤانایە/ سەری پولپولۆز مملانک عەبایە.)* ف پریشان

**پولتۆخ**: پلتۆخ، *(ئاشقم زەردە روخ و ئاشوفتەمە/ پیس و پولتۆخ و نەزارم تێمەگە «غەریب».)* ☜ پلتۆخ

**پۆلکە حۆلە**: پۆلکە گایانە، جۆرێ پۆلکەیە ئەگەر مرۆڤ بە کاڵی بیخوا گێژ دەبێ.ف نوعی خلر

**پۆلکە خاتوونە**: جۆرێک پۆلکەی خۆرسکە بە کاڵی دەخورێ.ف نوعی خلر

**پۆلکە رەشە**: پۆلکە مارانە.ف نوعی خلر

**پۆلکە گایانە**: جۆرێک پۆلکەی خۆرسکە گەلاکانی پانە و گوڵی بنەوش دەر دەکا دانەکەی بە شلکی لە ئاو و خوێدا دەکوڵێنن و دەیخۆن، پۆلکە گایانە.ف نوعی خلر

**پۆلکە مارانە**: جۆرێک پۆلکەی خۆرسکە ناخورێ.ف نوعی خلر

**پۆلۆتقە**: کلکەسووتێ، ریایی، خۆشئامایی.ف ریایی کردن

**پوورپنۆک**: بریتی لە مرۆڤی گرینۆک و دڵناسک، کەسێک کە خێرا دەست دەکا بە گریان، پیرێژنی گرینۆک. *(پوورپنۆک لە بەهانە بەندە بۆ گریان.)* ف کنایە از آدم نازکدل کە زود گریه می‌کند

**پووزپووزێن**:یارییەکە بە هەڵمات دەکرێ، قووڵکێک هەڵدەکەنن و هەڵماتەکە بە پللە دەهاون هەرکەس بیخاتە قووڵکەکەوە بەرەندەیە.) ف نام یک بازی با تیله.

**پووزلەخ**: پزلووخ، پووزەوانە، بەلەکپێچ.ف ساق‌بند

**پووش لە کا بژاردن**: بریتی لە چاک لە خراپ جیا کردنەوە.ف کنایە از جدا کردن خوب و بد

**پووشکە بەفوو**: کایەیەکی لاوانی گوندنشینە، هێندێک پووشکە یان گەسکێک بە تێلێکەوە هەڵدەواسن و ئاوری تێبەردەدەن لە چوار لاوە بە نۆرە فووی لێدەکەن هەر کەس بتوانێ بیکوژێنێتەوە بەرەندەیە.ف اسم یک بازی جوانان روستایی

**پووشکە پسانێ**: نێوان تێک چوون، خاک بوون، قسە لەگەڵ یەکتر نەکردن، دوو کەس کە دەنگ لە یەکتر دادەگۆڕن پووشکەیەک هەڵدەگرن و هەر یەکی سەرێکی دەگرن و دەیشکێنن و هەر یەکەیان لەتێکی بەدەستەوە دەمێنێ و ئیتر لەو کاتەوە لەگەڵ یەکتر قسە ناکەن.ف قهر کردن

**پەپرووکە**: بەورینگ، بەوروو، وردە سووتوویەک کە لەسەر ئاور بەرز دەبێتەوە.) ف خاکستر ریزی کە با آتش و دود بلند

می‌شود

**پەپی:** پەپوولە، بلاتینک، پەرپەرۆک، پەڵپەلیسک. ف پروانه

**پەت:** (+) مۆڵەت، مەودا. ف مهلت

**پەتا چەپەڵە:** نەخۆشیی پرمەترسی و گیرۆ. ف بیماری خطرناک و واگیر

**پەتکینە:** گۆرەوییەکی کە بە یەک شیش دەیچنن. ف جورابی که با یک میله می‌بافند

**پەتۆر:** دڕاو، شڕ و پەتۆر، لەتلەت بۆ پارچە. ف پاره و پوره

**پەتەسوو:** خۆڵەمێش، خۆڵەکەوە. ف خاکستر

**پەتەڤینگە:** قۆچەقانیی بەن، قەڵماسک. ف فلاخن

**پەتی سەوەتە:** بریتی لە کەسێک کە سووک و چرووک و بێدەسەڵاتە و لە ماڵێدا دەستی ناڕوا. *(کوڕە کەیخوادای چی پەتی سەوەتەش تەواو نییە.)* ف کنایه از آدم بی‌ارزش

**پەتیتە:** تۆبە، پەژیوان بوونەوە لە گوناح. ف توبه، ندامت

**پەراڤ:** قەراغ، ڕۆخ، کەنار، لێوار، دەم چەم. ف کناره رودخانه

**پەرامێز:** ماتۆڕێکی نەوتییە ناسووس دەکرێ و چێشتی لەسەر ساز دەکەن. *(دوگمە و تاقرانی و دەرزی/ خرمەی کرد کەوتە عەرزی/ پەرەی دڵم ئاوی گرت/ میسالی پەرامێزی «گۆرانی».)* ف چراغ نفتی تلمبه‌ای

**پەرتاڵ:** ئاکام، ئەنجام. *(ئی‌کارە پەرتاڵ نەیری.)* ف عاقبت

**پەرتوبڵاو:** پرژ و بڵاو، پەرگەنە. ف پراکنده

**پەرتەک:** هێز، قەوە، وزە. *(پەرتەکی لێبڕیاگە.)* ف توان، رمق.

**پەرتەک بڕیاگ:** هێز لێبڕاو. ف از رمق افتاده

**پەرتەک بڕیان:** هێز لێبڕان. ف از رمق افتادن

**پەرتەک بڕین:** هێز لێبڕین. ف از رمق انداختن

**پەرچان:** تەیمان، تانۆک، پەرژین، تامان، تانۆ. ف پرچین

**پەرچاندن:** ☜ پاچاندنەوە

**پەرچدانەوە:** بەرپەرچ دانەوە، گێڕانەوە. *(کەس نیەتوونێ پەرچی ئی‌کارە بێگاوە.)* ف سرا راه قرار گرفتن و مانع شدن

**پەرچم دانەوە:** پەرچ دانەوە، بەرپەرچ دانەوە. ف در میان سخن درآمدن

**پەرچە:** (+) پەچە، جێگە مۆڵی مێگەل لە سەحرا. ف محل استراحت گله در صحرا

**پەرچیم:** ☜ پیم

**پەردۆژ:** دەرفەت، هەل. ف فرصت

**پەردە لە چاودا نەبوون:** بریتی لە ڕووڕاست و بێڕوودەربایستی. *(بە خوا پەردە لە چاوما نییە ئەوەی دەیزانم دەیڵێم.)* ف کنایه از رودربایستی نکردن

**پەردە:** (+) بن، کچێنی. ف پرده‌ی بکارت

**پەردەگێڕان:** لە بەینی دوو شتدا پەردە کێشان. *(لە ژوورەکەدا پەردەیان گێڕابوو ژن لە لایەک و پیاو لە لایەک دانیشتبوون.)* ف پرده کشیدن

**پەردەی گوێ:** پەردەیەک کە دەنگ دەیلەرێنێ. ف صماخ

**پەرژان:** (+) پەرژین، تەیمان، تانۆک. ف پرچین

**پەڕشخۆرکە**: مەلێکی بۆری چکۆڵەیە بەقەد چۆلەکەیەک دەبێ، سیچڕە.ف نام پرندەای است

**پەڕشکە**: چێشتێکی تایبەتی هەڵامەت و سەرما بوونە، ماش و نۆک و پاقلە و بڕوێش و هەرشتە و بیبار پێکەوە دەکوڵێنن و دەیکەنە ئاشی پەڕشکە.ف آش

**پەڕشەخۆرە**: ☜ پەڕش خۆرکە.

**پەرکۆ**: کوتانی ساواری خڕ هەتا تەواو تفرەکەی هەڵدەدا.ف کوبیدن بلغور برای جدا کردن پوستەی آن

**پەرگر**: گۆشەنشین، گۆشەگیر، دوورەپەرێز، *(پەرگر دانیشتووە و سەری داخستووە.)* ف منزوی.

**پەرگەنە**: پرژ و بڵاو، شپرزە، شپرێو.ف پراکندە

**پەرگین**: گیایەکی کوێستانییە بۆ رەنگی رەش کەڵکی لێ وەردەگرن.ف اسم گیاهی کە برای رنگ سیاه مورد استفادە است

**پەرۆ لێ دادڕین**: بریتی لە ئاوڕ لێدانەوە و یارمەتی دان. *(هیچ کەس پەرۆیەکمان لێ دانادڕێ.)* ف کنایە از کمک کردن

**پەرواز**: (+) تەختەی باریکی تاشراو بۆ قەراغی سندوق و دۆلاب، زەوار.ف زوار

**پەروازبەند**: تەختەبەند، *(قەراغی ئەو دۆلابەمان بۆ پەروازبەند کە.)* ف تختەبند کردن کنارەی صندوق چوبی و کمد

**پەرۆش کردن**: ڕشانەوە، وەڕشان، هێنانەوە.ف قی، بالا آوردن

**پەرۆشان**: دەسرۆکەیەکە بە شانی منداڵیدا دەگرن بۆ دەم و لووت سڕین.ف دستمالی کە برای پاک کردن دماغ و دهان بە شانەی بچە میدوزند

**پەڕۆک**: ) فڕندە، باڵندە، باڵدار، پەلەوەر *(دەهاتنە سایەم نازێ و نازەنین/ لە سەرم دەنیشت پەڕۆکی باڵشین «بەیتی پیرەدار»)* ؛ ) پاتک، پارچەپینە، کنجک.ف ) پرندە؛ ) تکە پارچە برای وصلە

**پەروو**: ☜ پەروە

**پەرووک**: پەڕۆ، قوماش، کووتاڵ.ف پارچە

**پەروە**: خەڵات، دیاری، پێشکەشی.ف سوغات، مشتلق

**پەڕە**: پەلک، بەرگی گوڵ. *(هەر دەڵێی پەڕەی گوڵە، لە پەڕەی گوڵ ناسکترە.)* ف برگ گل

**پەڕەژاڵ**: ) ناوی گوڵێکە؛ ) ناوی چیایەکە لە ناوچەی سەقز و بانە.ف ) نام گلی است؛ ) نام کوهی در منطقەی سقز و بانە

**پەڕەسیغار**: کاغەزی جگەرە، کاغەزێکی ناسکە سیغاری پێ دەپێچنەوە.ف کاغذ سیگار

**پەڕەشووت**: چەتری خەلەبان، چەتری چەترباز. ف چتر چترباز

**پەرەڵێل**: تەریبی، دوو خەتی ڕاست لە پاڵ یەکدا.ف موازی

**پەرە مریشکە**: قرژ بوونەوەی تووک و پێستی لەش لە کاتی سەرما و مۆچڕک پێدا هاتندا.ف مورمور شدن پوست بدن

**پەرەملە**: گەردانە، بەرموور، خەناوک، ملوانکە، ملوێنک.ف گردنبند

**پەڕەمووچ**: فلچەی چکۆڵەی وێنەکێشان. ف قلم‌مو

**پەرەوکێ**: پەوکی، پەوکەی، بۆیە، لەبەر ئەمە. ف به این دلیل

**پەرەول**: باڵندە، پەلەوەر، پەڕۆک. ف پرنده.

**پەریشاخ**: پەڕەسێلکە، پەڕەسلێرکە، حاجیڕەش ف پرستو

**پەری‌شارۆخ**: زەردەولی، زەردەزیرە، زەرباڤ، زەرکتک. ف پرنده‌ای سینه زرد و سیه بال

**پەریوە**: ئاوارە، بەرپیدە. *(بوومە ئاوارە و پەرپیوەی دوور وڵات/ کەوتمە نێو وردە داوی ڕێی نەجات «هێمن».)* ف ئاواره، دربه‌در

**پەریوەشان**: گوڵێکی بۆنخۆشە. ف پرسیاوشان

**پەزاج**: مامان، قابیلە. ف ماما، قابله

**پەزکۆ گورۆ**: ناوی کایەیەکی منداڵانەیە. ف اسم یک بازی بچه‌گانه

**پەژارەوار**: پەژارەدار، خەمڵەبەر، دڵتەنگ و خەمبار. ف اندوهگین.

**پەژمینە**: کەڕوو، برشوو، برش. ف کفک

**پەژین**: شاخ و کێو، هەرد و کۆ، کەژ، چیا. ف کوهسار

**پەسا**: قۆرغ، قۆپی، دارستانی کەناری چۆم. *(لەو پەسا چڕ و پڕەدا بزر بوو.)* ف بیشه‌ی کنار رودخانه

**پەسپەزەکێویلە**: هەڵەپەزە پەزپەزەکێولە. ف رتیل

**پەستێوراو**: ئاخنداو، شلێدراو، پەستواو. ف انباشته و سفت شده

**پەسە و پووسە**: شت و مەک، بارگە و بنە. *(پەسە و پووسەکەتان کۆ کەنەوە دەڕۆین.)* ف وسایل و خرت و پرت

**پەسێر**: پەسیو، پەنا، پاسار. ف پستوو، کنج

**پەسیلە**: بەرسیلە، قۆرەی ترێ، پەسێرە، هاڵە. ف غوره

**پەگر**: گەمرە، کەمرە، گەڕمە. ف سرگین سفت شده‌ی زیر پای حیوان در طویله

**پەل هاویشتن**: ☜ پەل هەڵدان

**پەل هەڵخستن**: بڵاو بوونەوەی مەڕ و ماڵات بە کێودا بۆ لەوەڕین. ف پخش شدن گوسفندان برای چرا

**پەل هەڵدان**: لق و پۆپ دەرکردن، گەشە کردنی دار و گیا. ف رشد و نمو درخت و گیاه

**پەلاتیقە**: هەوڵ، تەقەلا، حەول. *(زیاتر پەلاتیقە بکەن.)* ف کوشش، سعی

**پەلارە**: بۆڵ، هێشوو، زەنگەتە، تلووتەک. ف خوشه انگور

**پەلامپیتکە**: پەلەپیتکە، پەلەپیتک. ف تلنگر

**پەلاو**: ئاوی تەنک، تەنکاو، بەرینی چۆم کە ئاوەکە بە زەویدا بڵاو دەبێتەوە. ف بستر رودخانه که آب آن زیاد عمق نداشته باشد

**پەڵخور**: (+) جۆی لێکراو کە دەدرێ بە ماڵات. ف جو خرد شده برای حیوان

**پەلک ڕەیحان**: جۆرێ کراسی قەدیمی ژنانە بوو. ف نوعی پیراهن قدیمی زنانه

**پەڵەباقی**: دوورینەوەی گیا و دروو کە پەڵە پەڵە ڕوابێت و لە هەر شوێنێک باقەیەک دەدوورنەوە. ف درو کردن گیاه و خار که

پراکندە روییدە باشد

**پەلەزێ:** گوڵاڵە گەزیزە.ف زنبق وحشی

**پەلەسۆ:** گیایەکی گوڵ زەردە زوو هەڵدەوەرێ. ف اسم گیاهی است

**پەلەسوانە:** لقی داری گوێسوانە، داری سواندن. ف چوب لبەی بام

**پەلەک بڕیان:** جووڵە لێبڕان، لە هەڕەکە کەوتن. ف از حرکت افتادن

**پەلەک:** هەڕەکە، جووڵە، جمە. *(پەلەکم بڕیا فرە ڕا کردم.)* ف از حرکت افتادن

**پەلەکانە:** پەیژە، قادرمە، نێردیوان.ف نردبان

**پەلەکرن:** پەلکێش کردن، ڕاکێشان. *(بچۆ پەلەکرنی بکە و بارەی.)* ف به زور کشانیدن

**پەلکێش:** (+) پیل گرتن و ڕاکێشان بە زۆر. *(بە زۆر پەلکێشیان کرد و بردیان.)* ف بە زور کشیدن و بردن

**پەلەمریشکە:** میروولە کردن و قرژ بوونەوەی پێستی لەش بەهۆی سەرما و مۆچرکەوە.ف مورمور شدن پوست بدن

**پەلەواژ بوونەوە:** بوورانەوە، بێخود بوون. *(لە برسانا خەریک بوو پەلەواژە بینەوە.)* ف از حال رفتن، غش کردن

**پەنار:** سەرچاوە، کانی.ف چشمە

**پەناڤ:** زەویی نەرمان، گۆشتە زەوی.ف زمین نرم و بیسنگ

**پەنجە چۆلەکە:** پێ چۆلەکە، گیایەکی لاسق قاوەییە بە عەرزیدا پان دەبێتەوە.ف اسم گیاهی است

**پەنجەقازە:** ناوی گیایەکە زۆر بەرز دەبێتەوە قالۆری سپیی هەیە و لە قەراغ چۆم و ئاوان دەڕوێ. ف گلپر

**پەنجەقازی:** گاسنێکە زۆری تیغە هەیە بە تەراکتۆرییەوە دەبەستن و جووتی پی دەکەن. ف پنجەقازی

**پەنجەکەڵە:** قامکە گەورە، تلیابەرانکێ، تلیامەزن، کلکە گەورە.ف انگشت شست

**پەنجەوانە:** ) قامکەوانە، چەرمێکە درویێنەوان لە قامکی دەکا، ئەنگوستیلە، کلکەوانە.ف ) چرمی کە دروگر بە انگشت میکند؛ ) انگشتر

**پەنچەر:** خاڵی بوون یان تەقینی توییی تەگەر.ف پنچر

**پەندەمووس:** ) پەنگڵەمووس؛ ) جنێوێکە. *(دەک پەندەمووس کەی.)* یانی ڕەبی بماسێی.ف ) آماسیدن؛ ) نفرینی است

**پەندیر:** پەنیر.ف پنیر

**پەنکوور کردن:** وەشارتن، شاردنەوە، حەشاردان.ف نهان کردن

**پەنکوور:** نهێنی، شاراوە، ڕاز. *(هەرچک لە بەینی خوەیان بکەن پەنکووری کەن.)* ف سر، نهانی

**پەنگرەئەستێرە:** گوڵئەستێرە، پەنگەئەستێرە.ف کرم شبتاب

**پەنگڵەمووس:** با کردن، ماسین، پەنەمین.ف آماسیدن

**پەنگەئەستێرە:** ☜ پەنگرەئەستێرە

**پەنەمووس:** لە خەو ڕاچوون و هەڵنەستانەوە. *(یاخوا پەنەمووس کەی.)* ف بە خواب ابدی فرو

رفتن

**پەنی:** (+) ون، نادیار، بزر، پیوار. *(نازانی خوەی بۆچە پەنی کردگە.)* ف پنهان

**پەنێرکە:** بۆقژە، نەخۆشییەکی زاری منداڵی شیرەخۆرە. ف مرضی در دهان کودک

**پەوو:** پی، ئاروو، پدوو، پووک. ف لثه

**پەیار:** چەواشە، سەرگەردان. *(هێند ورده ئەم وتاره/ بیر دەوێدا پەیاره «ڕاوچی».)* ف سردرگم، سرگردان

**پەیاغ:** تێلا، دار دەستی لەبار و لەدەستان خۆش. ف چماق

**پەیدۆز:** پەیجۆر، تۆژەرەوە. ف محقق

**پەیدۆزی:** پەیجۆری، تۆژینەوە، لێکۆڵینەوە. ف تحقیق

**پەیڤاژۆ:** کەسێ کە مژولیایش دەکا، وتاردەر. ف سخنران

**پەیوین:** قسە کردن، پەیڤین، دووان. *(دەبێ بە کوێ بگەی؟ هێشتا نەگەیوی/ لە روخسارا بەهەشتی، ڕۆژی، هەیوی/ هەزاران داود و دەنگی زەمووری/ دەبەر لێوەت مرن کاتێ دەپەیوی «هەژار».)* ف سخن گفتن

**پێ بە جەرگی خۆدا نان:** دەست لە دڵ بوونەوە، ڕازی بوون لەبەر ناچاری. *(ناچار بووم پێ بە جەرگی خۆمدا بنێم و بچم بۆلای.)* ف پا روی دل خود گذاشتن

**پێ بە خەنە:** بریتی لە نازدار و دەست و پێ سپیلکە. *(ئەو پێ بە خەنەیە کوا توانای کار کردنی هەیە؟)* ف نازنازی

**پێ بە قوونە:** جۆرێک مراویی چکۆڵەیە زۆرتر لە پەنا و پەسیوی چۆماندا دەژی. ف نوعی مرغابی وحشی

**پێ پان:** بە توانج بە کەسێک دەڵێن کە قەڵەو و لاق زل بێ. *(جا ئەو کچە پێ پانە کێ دەیهەوێ.)* ف کنایه از آدم چاق و پاگنده

**پێ پرکە:** لاق لە عەرزی گیراندن و هەڵکەندنی لە کاتی ڕق هەستاندا، بۆ حەیوان بەکار دێ، زۆر جار گورگ کاتێک لەگەڵ کەسێک بەرەوڕوو دەبێ چنگ لە بەفر دەگیرێنێ و دەیکا بە سەر و چاوی کەسەکەدا بۆئەوەی چاوی پڕ بکاتەوە و بتوانێ هێرشی بۆ بەرێ. ف ☜ پێکۆڵ

**پێ پشیلە:** چنگە پشیلە، گیایەکە وەک پێی پشیلە دەچێ. ف نام گیاهی است

**پێ پیرۆز:** قەدەمخێر، کەسێ کە مایەی خێر و بەرەکەت بێ *(خدری پێ پیرۆز لە کوێیە بۆچی لێڵە ئاوی ژین؟/ خوێن لە پەلکی گوڵ دەچۆڕێ، بای بەهاران چوونە کوێ؟ «حافز بە کوردی، حەقیقی»)* . ف قدمخیر

**پێ چەقاندن:** پێداگرتن، سوور بوون لەسەر کارێک، ئیسەرەم کردن. ف اصرار

**پێ فاماندن:** تێ گەیاندن، حاڵی کردن. ف فهماندن

**پێ کردنەوە:** بانگهێشتنی بووک و زاوا، خزم و کەس بووک و زاوا بانگهێشتن دەکەن بۆئەوەی ئاشنا بن لەگەڵیان و بەو بانگهێشتنە دەڵێن پێ کردنەوە. ف دعوت کردن عروس و داماد

**پێ گرتن**: فێری ڕێگا ڕۆیشتن بوونی منداڵ. *(منداڵەکەمان پێی گرتووە.)* ف پا گرفتن بچه

**پێ لێ نەبڕین**: سەردانی زوو زوو، بەردەوام چوونە دیدەنیی کەسێک. ف همواره به دیدنی کەسی رفتن

**پێ لێ هەڵبڕین**: بریتی لە ئەوپەڕی بێحەیایی و دەمدڕێژی، بێشەرمیی لەرادەبەدەر. *(تۆ بەجاری وەک ژنی فاحیشە پێت لێ هەڵبڕی/ نەء گوتم خەیری نییە چاوێکی گەر لێ زەق نەکەم «شێخ ڕەزا».)* ف بیشرمی و زیادەرویی بیش‌ازحد

**پێ لێ هەڵێنان**: شوو لێ هەڵکێشان، چاو و ڕوو کرانەوە. ف ☜ پێ لێ هەڵبڕین

**پێ لێنان**: دان پیانان، ڕاستی گوتنی تاوان. *(ئاخری پێی لێنا تاوانبارە.)* ف اعتراف کردن

**پێمەردە**: عیزراییل، پێمێرد، ف عزراییل.

**پێ و شوێن**: سۆراغ. *(کەس بە پێوشوێنی نازانێ.)* ف اثر

**پێوەعەرز نەکەوتن**: بریتی لە شادی و خۆشیی زۆر. *(لە خۆشیانا پێی وە عەرزی ناکەوێ.)* ف کنایه از شادی زیاد

**پێ**: (+) پووک. ☜ پەوو

**پیازە**: ) تاوان، باڵبەز، سووچ، گوناح ) ناوی چیایەکە لە هەورامان ف ) گناه ) نام کوهی در اورامانات.

**پیازەخوانکە**: گیایەکە گەڵاکانی لە پیواز دەچێ و لە کێو و شاخ شین دەبێ، سیرە سەگانە. ف نوعی سیر کوهی

**پیاسکە**: پریاسکە، پرێسکە، بوخچەی چکۆڵە. ف بقچەی کوچک

**پیاوە بەفرینە**: زەلامە بەفرینە. ف آدم‌برفی

**پێبلقە**: پەیژە، پەینجە، نێردیوان. ف نردبان

**پێبەر**: (+) داگیرکەر، زاڵم، قاندڕ. ف ظالم، متجاوز

**پێبەروانە**: کێشکچی، قەرەوڵ، پازازک، حەسحەس. ف نگهبان

**پێپاکی**: پاکانە، تۆمەت لابردن لەسەر خۆ، فحێڵ. ف اثبات بی‌گناهی و دوری از اتهام

**پێپەست**: لەبەر پێ پەستواو، پێشێل کراو. *(چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمە پێ پەست بوو تاکوو پار/ هەر خوێنی لاوەکان بوو گوڵی ئاڵی نەوبەهار «پیرەمێرد».)* زیر پا له شده

**پێتار**: پیرەدار، داری کۆن و ڕزیو. ف درخت پیر و فرسوده

**پێتاو**: (+) میراوی برینج. ف آبیار برنج

**پێتکە**: قەڵەشینەوەی توێکڵە گوێز. ف ترک خوردن پوستەی گردوی رسیده

**پێتگە**: نەعنا، مەرزە، جاترە. ف نعناع

**پێتۆڵ**: زیرەک، وریا، هوشیار. ف باهوش، زیرک

**پێتوو**: چەرخە، باشوو، واشە. ف باشه

**پێتەڵووک**: پیرەڵۆک، چرچ بوونی دەست لەنێو ئاوی شیلەوگەرمدا. *(دەسم پێتەڵووک بووە.)* ف چروک شدن پوست دست در آب ولرم

**پێتەڵووکە**: باپووک، باپووسکە. *(پێتەڵووکەی زستانێ بە باوە هەڵوەدایە/ سەهۆڵی دەرک و کۆلان، کوڵوڵی دەستی بایە «ڕاوچی».)* ف برف ریز و سبک

**پێچ و کڵاو تێکەڵبوون**: بریتی لە بە کێشەهاتن و تێکهەڵچوون *(لە کوڵم بەوە با پێچ و کڵاوەکەمان تێکەڵ نەبێ.)* ف کنایە از دعوا و زدوخورد

**پێچ و مۆرە**: جەڕ و مۆرە. ف پیچ و مهره

**پێچبادەر**: پێچکوشتی. ف پیچکوشتی

**پێچڕ**: گیانسەخت، زیندەوەرێک کە درەنگ گیانی دەردەچێ. *(هێندە پێچڕە سەد جاری بکووژی نامرێ.)* ف جانسخت

**پێچرا**: پاچرا، ئەو پارەیەی لە قوماردا دەدرێ بە خاوەن قومارخانە. ف پولی کە طرفین قمار بە صاحب قمارخانە میپردازند

**پێچکوشتی**: ئامرازی کردنەوەی پێچ. ف پیچکشتی

**پێچکە ژلۆقە**: گیایەکی کوێستانی ف نام گیاهی است

**پێچکە سوێرە**: گیایەکی کوێستانییە وەک پیواز وایە دەخورێ. ف اسم گیاهی

**پێچۆڵ**: ڕان، مێگەڵ. ف گله

**پێچووک**: پێچۆلەکە، گیایەکی گەڵا باریکە بە زەویدا پان دەبێتەوە. ف اسم گیاهی است

**پێچەڵۆک**: ئاڵۆزاو و پڕ پێچ و پڕ گرێ و گۆڵ، تێکهاڵاو، پێچەڵاوپووچ. ف پر پیچ و خم

**پێ حاجیلە**: نانە حاجیلەقلەق، تۆڵەکە. ف اسم گیاهی خوراکی

**پێحەسان**: هەست پێکردن. ف احساس کردن

**پێخەسوو**: مانای هەنبانە بۆرینە ڕاست نییە، بە ژنێک دەڵێن کە لە ماڵی زاواوە دەچێتە ماڵی بووک و شەوی خەنەبەندان لەوێ دەمێنێتەوە. ف زنی کە از طرف خانەی داماد شب قبل از عروسی در خانە عروس میماند

**پێخەسوولە**: قولە گیایەک کە بۆ قایم کردنی گرێی شەغرە کەڵکی لێوەردەگیرا و دەدرا بەر قوڵفەی گرێکە بۆئەوەی شل نەبێتەوە. ف یک دستە گیاە کە زیر گرە بار میگذارند کە گرە شل نشود

**پێ داکێشان**: (+) زێدەڕەوی، پێی زیادی داکێشان. *(پێی زیادی داکێشی پێت دەشکێنم.)* ف زیادەروی در رفتار.

**پێدەڤی**: پێویست، لازم، پێویس. ف لازم

**پیرایشۆکە**: (+) درووە پوورایشێ، درووییەکی شینی سپیواشە پەپوولە پایزە دەردەکا. ف نام خاری است

**پیرکوونی**: کەسێک کە لە تەمەنی پیریدا تۆڵازی و کاری جلفانە دەکا. ف کنایە از کسی کە در پیری هوسبازی میکند

**پێڕۆ**: پێڕەو، پیادە. ف پیادە.

**پیرۆز**: پێوند، پێویست، پێوند کردنی دار، متوربە. ف پیوند.

**پیرەکورە**: گیاوگژی پیر بوو، گژوگیای هراش و ڕەسیدە.(گیاوگژ پیرەکورە بووە تازە بارانیش بباری قازانجی نییە.) ف پیرشدن گیاه و علف

**پێڕەوگە**: پێیانەڕێ، شۆستە. ف پیادەرو

**پیزڵغ**: پیزەڵک، پیزەڵ، گیایەکە وەک کەرخنکێنە وایە بۆ باقەبێن دەبێ. ف اسم گیاهی است

**پیزڵک**: گیایەکە بە تۆپەڵ دەڕوێ و باڵا پیاوێک

بـەرز دەبێتـەوە و گـوڵی سـوور دەر دەکـا و فەلایان بۆ باقەبێن کەڵکی لێ وەردەگرن پیزلخ. ف نام گیاهی است

**پیزەرۆک**: جۆرێ زیپکەی بە ژانـە لـە پێستی لەش پەیدا دەبێ. ف نوعی جوش پوستی

**پیست**: جێی خلیسکێن. ف پیست سرسرەبازی

**پیستوور**: زۆردار، زاڵم. ف ستمگر

**پیسمۆرە**: گیایـەکی گـەڵا باریکە وەک شـیوت وایە. ف اسم گیاهی است شویت مانند

**پـیش کـردن**: مـووش کـردن، مـان کـردن، دۆش دابـردن. *(بـۆ وا پیـشت کـردووە، دەڵێـی مـەیموونـەکـەت تۆپێـوە.)* . ف رنجیـدن و خودخوری

**پێشاوبرِدانەوە**: وەدوای کـەسێک کـەوتن و لـە لایـەکی دیکـەوە هاتنـە پێـشی و گرتنـەوەی. ف کسی را دنبال کردن و میانبر زدن و گرفتنش.

**پێشبرِکێ**: کێبەرکێ، رقـە، ململانێ، گورِرە. ف مسابقە

**پێشکرێ**: پێشمەرج، بێح، بێحانە. ف بیعانە

**پیشکە قازان**: پیشکان، بێلەکان، بێڵەقان. ف بیلک گیاهکنی

**پێشکـەل**: برینی گوێچکەی بـەرخ و کاژیلـە بـۆ دیاری کردن بـە جـۆرێ کـە بردراوەکـەی لای پێشەوەی گوێچکەی بێ. ف نشانە کردن گوش برە و بزغالە از طرف جلو

**پێشمەرج**: بێح، بێحانە. ف بیعانە

**پێشەزا**: منداڵی پیاوێک کە ژنی هەوەڵی نـەماوە و ژنی دیکەی هێناوە، ئەو منداڵانەی ژنی یەکەم بۆ ژنـی دووهـەم دەبنـە پێشەزا. ف بچـە نـاتنی برای زنپدر

**پیقنە**: فیتفیتە، فیقفیقە. ف صوتک

**پێکدادان**: پێکادان، بە گژ یەکتردا چوون. ف زد و خورد

**پێکز**: نەدار، هەژار، فەقیر. ف تهیدست

**پێکوڵ**: ) سمکوڵ، سم لە زەوی کوتانی ئەسپ، سـمکۆلان؛ ) سـم بـە عـەرزیـدا هێنـانی گـا و جوانـەگـا لـە کـاتی شـەرِدا. ف ) سـم بـە زمـین کوبیدن اسب؛ ) سم بە زمین کشیدن گاو نر هنگام جدال

**پێکەوتە**: شیاو، هێژا. *(پیاوێکی پێکەوتە و زانایە.)* ف لایق

**پێکێو**: داوێنی کێو، پێدەشت. ف کوهپایە

**پێگەرمۆک**: پیاسە، راوێچکە. ف قدم زدن

**پیلارەش**: ☜ پشارەش

**پیلاسپی**: ☜ پشاسپی

**پێڵاومز**: ☜ پێڵاومیز

**پێڵاومیز**: کاڵەدرانـە، هـەقی بـەرێدا رۆیشتن بۆ کاری کەسێک. ف پایمزد

**پیلپێلک**: پلیکان، قاڵدرمە، رازوونـە، پـەیژە. ف ☜ پاینجە

**پێلـۆز کـردن**: پێوەنـد کـردن، لێـک قـایم کـردن، چاک کردنەوەی شکاو. ف بەهم چسپاندن و بند زدن اشیاء شکستە

**پێلۆژە**: کۆڵوو، پەلووژە، بنی تـاڵوو. ف ریشەی کلفت گیاهی است

**پێڵـە**: (+) پیـر، بـێددان، زیـاتر بـۆ حـەیـوان

دەگـوترێ، *(لگـا پێڵــە توانـایی جـووت کردنــی نەماوە.)* [ف] پیر، مسن

**پێڵەوژە**: کۆڵـوو، بنـی تـاڵوو.[ف] ریـشەی گیـاهی تلخ

**پیلیسک**: هەل، دەرفەت.[ف] فرصت

**پـیم**: پـەرچـیم، ئاسـنێکە وەک بزمـار وایـە دوو پارچە ئاسنی پێ بە یەکەوە دەبەستن لەپێشدا هەر دوو پارچە ئاسنەکە کون دەکەن و پیمەکە دەخەنە نێو کونەکانەوە و بە چەکوش دەیکوتن هەتا هەر دوو سەری پەرچ دەخـوا و ئیتر دوو پارچـە ئاسـنەکـە یـەکتـری بـەر نـادەن، مـەگـین پیمەکە بشکێ.[ف] پیم

**پێمجیلکە**: پێمریشکە، گیایـەکە وەک گێلاخـە بـە زەویدا پان دەبێتەوە.[ف] اسم گیاهی است

**پێمزک**: کرێ، مزە، جەمەک.[ف] دستمزد

**پێمل بـوون**: ڕازی بـوون بـە ناچـاری.[ف] راضـی شدن از روی ناچاری

**پێمل کردن**: ڕازی کردن، ناچار کردن.[ف] مجبور کردن، راضی کردن

**پێمێـرد**: مـەڵکـەمـووت، فریـشتەی گیـانکێـشان، ئیزرائیل.[ف] عزرائیل

**پینە**: پەڵە، پینەهەور، پەڵەهەور.[ف] لکه، لکه ابر

**پێوار**: (+) پێوانە، ئامرازی پێوان.[ف] پیمانه

**پیـوازاو**: ئـاو و تـام، شـۆرباو، چێـشتی ئـاو و پیواز و ڕۆن.[ف] اشکنه

**پیوازە خووگانە**: گیایەکی گەڵا پانە بنێکی خڕی هەیە لە ئاڵەکۆک گەورەترە.[ف] اسم گیاهی است

**پیوازە سەگانە**: گیایـەکی بۆگـەنـە وەکوو پیـواز وایـە خۆڕسکە و بنێکی وەک پیـوازی هـەیـە.[ف] اسم گیاهی بدبوو شبیه پیاز

**پێـور**: (+) هــەسـارەی ڕاخوشـیو، نێـزەک. .[ف] شهاب

**پێورمێزین**: ئەستێرەکشان، ڕاخوشینی نێزەک. [ف] افتادن شهاب

**پیوسۆز**: چرای شیلەگەرچەک.[ف] پیەسوز

**پێوە بـوون**: (+) بـەتـەمـا بـوون، قـەسـت کـردن. *(پێوە بووم بێم بۆلات.)* [ف] قصد کاری کردن

**پێوە**: لنگە، تـا. *(بە پێوە کـەوش وەریگـەڕایە.)* [ف] لنگه کفش

**پێوەچاران**: مشوور خواردن، چارە کردن، ئاگا لێبوون.[ف] به فکر بودن و سرپرستی

**پێـوەڕوان**: جـووت بـوونی سـەگ و تـاژی.[ف] جفتگیری سگ و تازی

**پیـەرز**: پـارێز، نـەخـواردنی هێنـدێ خۆراک. *(لـە شیرینی پیەرز بکە.)* [ف] پرهیز

**پیـەرز کـردن**: پـارێز کـردن. *(پیـەرز کـردن لـەری ئایەم کێگ.)* [ف] پرهیز کردن

**پێیانەڕێ**: شۆستە، پێڕەوگە.[ف] پیادەرو



**تئووک**: چادر، تاوڵ، هۆبە، دەوار، خێوەت.[ف] چادر، خیمە

**تابڵمە**: تابلەمە، شتێکەپۆلووی پێ دەگەشێننەوە بۆ نێرگەلە.[ف] آتش‌گردان

**تابلەمە**: پۆلگەشێن، بنچەرخێن.[ف] ☜ تابڵمە

**تابوشت**: تاقەت، توانا. *(لەوە زیاتر تابوشتم نییە کارەکە زۆر قورسە.)* [ف] رمق، توان

**تابیر**: لێکدانەوەی خەون، [ف] تعبیر.

**تاپووس**: تابووت، دارەمەیت، دارەتەرم.[ف] تابوت

**تاتک**: پیتک، کوتک.[ف] پتک

**تاتوولە**: گاگلێنە، گیایەکی ژەهراوییە پاتاڵ بیخوا پێی دەمرێ.[ف] گیاهی سمی

**تاتیپشت**: مۆغەرەی پشت، بڕبڕاگە، بڕبڕە، [ف] ستون‌فقرات

**تاجیلۆکە**: (+) گیایەکی سووک و پەلەپووشی پایزییە.[ف] گیاهی خشک کە در پاییز باد می‌برد

**تاچیک**: بێگانە، نامۆ، غەوارە، غەریبە.[ف] غەریبە

**تاخچە**: پەڵە نەرمایی نێو شاخ و بەردی چیا، کە گیای لێ شین دەبێ.[ف] زمین نرم در میان سخرەهای کوهستان

**تاراوگە**: شوێنێ کە ئاوارەی لێ دادەنیشێ، شوێنی گیرسانەوەی ئاوارە و شاربەدەران.[ف] تبعیدگاه

**تارۆز**: شێعر و چیرۆکی تەوساوی، تەنز.[ف] طنز

**تاریکەوانی**: تاریک و ڕوون، سپێدە، کازیوەی بەیان.[ف] گرگ و میش

**تازەسوو**: تازەساو، تیغی تازە تیژ کراو.[ف] تیغی کە تازە تیز کردە باشند

**تازێ**: پرسە، تازیە.[ف] تعزیە.

**تازیەدار**: عازیەتبار، تازیەبار، ڕەشپۆش.[ف] عزادار

**تاژان**: (+) گوندێکە سەر بە شاری بانە.[ف] روستایی از توابع بانە

**تاژانگ**: شێلاق، شەلاخ، قەمچی، قامچی.[ف]

تازیانە

**تاژپڵنگ**: توڵەپڵنگ، جۆرێ پڵنگی باریک و تیژڕەوە. ف یوزپلنگ

**تاژەنگ**: (قامچی، شێلاق (. گوشار، تەوژم، زەخت. ف ( تازیانە ( فشار

**تاژیلکە**: تاژیلۆکە، تاجیلۆکە، تاژیی ئەحمەد ڕاوکەر. ف آخوندک

**تاسا**: توانا، هێز، وزە *(تاسای دەست کردنەوەی نەبوو.)* ف توان، نا

**تاسکە تاسک**: بە ناز و لار و لەنجە ڕۆیشتن، چاوگێڕان و بە ناز ڕۆیشتنی کچ. *(هەڵیان ماڵیوە باسک/ باسکی قەڵەو و ناسک/ کە دەکەن تاسکە تاسک/ ڕەوەکترن لە ئاسک «هێمن».)* ف ناز و عشوە

**تاسمە**: قاشە گرکە و کاڵەکی وشکەوە کراو ) قایشی پەروانەی ماشێن و....ف ) لواشک خربزە ) تسمە

**تاسەبار**: تاسەمەند، بە ئاوات. ف آرزومند

**تاسیان**: تاسان، گێژ بوون. ف گیج شدن

**تاشا**: (+) مەیل و تاسە، تامەزرۆیی. *(دەبینی ڕۆژ بە تاشا سواری شەو بوو/ شەو ئاوس بوو سبەینێ کاتی زەو بوو «خاڵەمین».)* ف اشتیاق

**تاشقەند**: پەڕپەڕۆچکە، حەویق، تەشق، بەرزایی ئاسمان. ف اوج آسمان

**تاعوون**: ) بڵفەتە، نەخۆشییەکی کوشندەیە. چاو قووڵکە؛ ) بریتی لە منداڵی زۆر بزۆز و هار. *(دەڵێی تاعوونە.)* ف ) طاعون؛ ) کنایە از بچە شلوغ

**تافتافینە**: تاڤگە، سوڵاڤ، قەڵپەزە، ئاوهەڵدێر. ف آبشار

**تاقوتراق**: تاقولۆق، دانەدانە. *(تاقوتراق خەڵکی لێ مابوو.)* ف تک و توک

**تاقەپووتە**: پارچەیەکی قەدیمیی ژنانە بوو. ف اسم پارچەی قدیمی زنانە

**تاقیمانە**: تاقیکاری، ئەزموون. ف امتحان

**تاڵ قەشقە**: بەرێکی دار بەڕووە.داری بەڕوو حەوت بەر دەگرێ. ف یکی دیگر از ثمرهای درخت بلوط

**تاڵتۆز**: گیایەکی بڵیندە وەکوو مۆسک وایە. ف اسم گیاهی ساقە بلند

**تالحە**: فاڵ، بەخت تاقی کردنەوە، تەلیعە. ف فال

**تاڵخۆش**: ئەو ئاوەی کە بە وادەی ڕۆژ و دانێک لە برینجی چاندراوی دەگرن. ف آبی کە بە مدت یک روز و نیم بە شالیزار دادە می‌شود

**تاڵکێش**: دەرهاتنی تاڵی گۆرەوی و بەرگی چندراو و بە بەرەوە چوونی. *(گۆرەوییەکەت تاڵکێش بووە تازە هەتا ئەوسەر دەدڕێ.)* ف پارە شدن تار جوراب و لباس دستباف

**تالنگە**: جەواڵ، تەلیسێ کە وەک بەرە دەیتەنن. ف گونی دستباف

**تاڵوار**: شوێنێکی تایبەتە بۆ لە تەرە دانی تووتن، تەرە. ف گودالی کە توتون در آن می‌گذارند

**تاڵووجاڕ**: جارە تاڵوو، جاڕێکی کە گیای تاڵووی زۆرە و لەبەر کۆڵوو ناکێڵدرێ. ف مزرعەای کە پر از گیاه« تاڵوو» است

**تاڵیشار**: گیایەکی گەڵا سەوز و پانە لاسقەکەی

سپییە.ف اسم گیاهی است

**تاماو**: ئاووخوێ کە دەدرێ بە مالات.ف آب‌نمک برای حیوان

**تامڵ**: تاقەت، سەبر.ف تحمل

**تانجیلۆکە**: تاجیلۆکە، تاژیلۆکە، تاژیی ئەحمەد ڕاوکەر، تانجیی پێغەمبەر، بالووک، حوشترحوا. ف آخوندک

**تانگ**: ) دەبابە ) ڕووبەڕوو، هەمبەر، بەرانبەر. *(ماڵمان لە تانگ ماڵ ئەوانە.)* .ف) تانک ) برابر، مقابل

**تانۆ**: ☜ پەرچان

**تانی تێدان**: دنە دان، هان دان. *(ئەو بۆ ئەوکارە تانی تێدان.)* ف تحریک کردن

**تاوپەڕ**: ڕۆژپەڕ، ڕۆژاوا.ف هنگام غروب

**تاوپەڕان**: کاتی ڕۆژئاوا بوون.ف هنگام غروب خورشید

**تاوتا**: پێوپێ، پاوپا، لینگاولێنگ لەپێ کردنی کەوش. *(کورە ئەوە بۆ کەوشەکانت تاوتا لەپێ کردووە؟)* ف کفش لنگه به لنگه

**تاوتوو کردن**: شی کردنەوە، توێ توێ کردن، لەبەر یەک هەڵوەشاندن.ف از هم باز کردن

**تاوتوێ کردن**: ☜ تاوتوو کردن

**تاوکانەوە**: تەکینەوە، تاسانەوە، کشانەوە لە کارێ.ف شانه خالی کردن

**تاوگر**: بەرڕۆژ، بەربەرۆچکە، شوێنێ کە تیشکی خۆر دەیگرێ.ف جای آفتاب‌گیر

**تاوننە**: تاعوون، بڵفەتە.ف تاعوون

**تاووک**: سێبەر، سابات، چارداخ، سەیوان، کەپر. ف سایبان

**تاوەسووت**: ئەو شتەی خۆر دەیسووتێنێ، دەم و چاوی ڕەش هەڵگەڕاو و پێست داماڵدراو بە تینی هەتاو.ف آفتاب سوخته

**تاویار**: (+) ) تاوێرە بەرد، بەردی گەورە و تەختی قەدی کێو؛ ) کەسێک کە خۆرەتاوی خۆش دەوێ.ف) سنگ بزرگ و پهن کوه؛ ) کسی که به نور خورشید علاقه دارد

**تڕ بە تاق نەهاتن**: بریتی لە خۆشی و شادیی زۆر. *(لە خۆشیانا تڕی بە تاق نەدەهات.)* ف کنایه از شادی بیش از اندازه

**تڕ لەخۆ دەرچوون**: بریتی لە بادیهەوا بوون، غلوور بوون. *(ئەوتازە پیا کەوتووە وا تڕی لەخۆی دەرچووە قسە لەگەڵ کەس ناکا.)* ف کنایه از مغرور شدن

**تڕ و تەوێڵە**: قسەی بێتام و هیچ و پووچ، شتی هیچ و بێبایەخ. *(گوێی مەدەیە هەمووی تڕ و تەوێڵەیە.)* ف چیز و حرف بی‌ارزش و الکی

**تراوکە**: جۆرێ بەردی بریقەدار و تەنکە.ف نوعی سنگ نازک و ساف

**ترپە**: (+) دەنگی بە ئاستەمی پێ، چرپە. *(ترپەی پێی دێ.)* ف صدای پا

**ترترە**: کرمی نۆک، ئافەتی نۆک *(ئەوەی کاری ئەمڕۆ بدا بە سبەینێ/ ترترەی دەکەوێتە ڕدێنێ «پەندی پێشینان»)* ف آفت نخود

**ترتفاق**: شتوومەک، شمەک، کەلوپەل.ف وسایل و اسباب

**ترسان**: (+) سوور بوونەوە و ژان کردنی

پێستی لەش بەهۆی پێدارژانی ئاوی گەرم. *(خەمتان نەبێ نەسووتاوە هەر ترساوە.بلۆقی نەکردووە، سوور بۆتەوە.)* ف سوزش پوست براثر ریختن آب گرم

**ترسیاگ**: ترساو، تووشی ترس و خۆف هاتک. ف ترسیده

**ترشگیاگ**: ترشاو، شتێ کە بە مانەوە ترش هەڵگەڕابێ. ف ترشیده

**ترشگیان**: ترشان، *(خەور فرە بمێنگەی ترشگێ.)* ف ترشیدن

**ترشگیانن**: ترشاندن، ترش هەڵگێڕان. ف ترشاندن

**ترشۆکە خاتوون**: ترشۆکە خاسە، جۆرێ ترشۆکەی ناسک و گەڵا پانە بۆ دۆکولیو دەبێ. ف ترشک

**ترشۆکە خاسە**: ☜ترشۆکە خاتوون

**ترشە خاتوون**: ☜ ترشۆکە خاسە

**ترکزە**: دڵەکوتە، دڵەڕاوکێ، دڵەخورپێ. ف نگرانی

**ترگژۆک**: تەرزە، تەیرۆک، گارسیۆک، تەزرە. ف تگرگ

**ترمەوبۆڵە**: پرتەوبۆڵە، نارەزایی دەربڕینی ترسەنۆکانە و بە پێچ و پەنا. ف غرولند

**ترنیسک**: کۆترەباریکە، یاکەریم. ف قمری

**تروتۆپ**: پۆز و هەوا، فیز و ئیفادە. *(لە ماڵیا نییە دەنکە بروێشێ/ لێفە شرێ نییە لاقی تێکێشێ/ تر و تۆپەکەی کەرێک ناکێشێ «فۆلکلۆر».)* ف تکبر

**ترۆڵ**: ڕەشەکوژی، تیرۆر. ف ترور

**ترۆمتە**: واشە، باشوو، مەلێکی ڕاوکەرە. ف قرقی

**ترۆنتە**: ☜ ترۆمتە

**troook**: 

**تەرە**: (+) کچۆڵە، کیژۆڵە، کناچە، کەنیشکە. ف دختر کوچک

**ترەشکە**: بەڵای ئاسمانی، وەک هەورە تریشقە و تۆفان و ... ف بلای آسمانی

**ترێ بن گۆم**: بریتی لە بێسەر و شوێن بوون. *(وەک ترێ بن گۆم بزر بوو.)* ف کنایە از گم شدن

**ترێ پەزان**: بریتی لە مانگی خەرمانان، کاتی ترێ گەیشتن. ف ماه شهریور، هنگام رسیدن انگور

**ترێ مارانە**: ترێ مارە، ڕێزەڵە مارانە. ف تاجریزی

**ترێ مارە**: ترێ مارانە. ف تاجریزی

**تریشکدار**: پرشنگدار، بە بریقە. ف درخشان

**تریشکە**: گیایەکە دەخورێ و لە قەراغ کانیاو دەڕوێ، ترشۆکە. ف گیاه ترشک

**تریفە بوون**: لە شیر بڕینەوەی بەرخ و کاژیلە و کز بوونیان. *(لەوەتا بەرخەکانمان لە شیر بڕیوەتەوە هەموو تریفە بوون.)* ف لاغرشدن بره بەخاطر بریدن از شیر

**ترینگانەوە**: ) بزە گرتن، گرژینەوە، زەردە گرتن؛ ) پشکووتن، دەم کردنەوەی گوڵ. ف ) لبخند زدن؛ ) شکفتن گل

**تریواندن**: ژان کردنی لەش. *(لەبەر ژان تەواوی*

*گیانم دەتریوێنی.)* ف درد

**تریوه**: تریفه، تیشکی مانگ. ف تابش ماه

**تسکوڵیو**: بریتی له تەمبەڵ و تەوەزل، به ساوه ساو، کەسێک که له کاردا زۆر به شێنەییه، زۆر دادەنیشێ و لەجێی خۆی هەڵناستێ. ف کنایه از تنبل

**تسلّه**:جۆرێ کارگه زۆر نەرمه وەکوو قارچکی تر ژێرەکەی پەڕە پەڕە نییه، کاتێک وشک دەبێتەوه گەردێکی وردی تێدایه وەک خەنه وایه. ف نوعی قارچ

**تسمۆرگ**: گیایەکی چکۆلەیه وەک ئاڵەکۆک و شنگ وایه. ف اسم گیاهی است

**تشپۆک**: زیپکه، پیزۆکه، زووه. ف جوش

**تفارۆک**: منالّ، زارۆک، زارۆ، مندالّ. ف کودک

**تفر**: ( تێخوڵی بڕوێش و ساوار. *(ئەو پەڕشه بکوتەوه و تفرەکەی لێ جیا کەوه.)* ( قەتماغه، پەترۆ ف (پوستەی بلغور ( کبرەی زخم.

**تفلیک**: بەڵغەم، ئاختف، تفی زەرد. ف بلغم

**تفەنگ به تاریکییەوه نان**: له خۆڕا قسه کردن سەبارەت به کەسێک، چێو له تاریکی کوتان. ف سخن گفتن بدون دلیل

**تفیله**: مندالّی ورد، زارۆک، ساوا. ف طفل

**تلارۆکێ**: خۆ تلاندنەوه بەسەر زەویدا. ف غلطیدن

**تلاس**: تەختەیەکه ناوەکەی قووڵ دەکەن سەگ ئاوی تێدا دەخواتەوه. ف آبخوری سگ که از تخته کنده میشود

**تلاسکه بەستن**: لاتراسکه بەستن، سەرەنگرێ بوون. ف سکندری خوردن

**تلاسه**: ☜ تلاس

**تلاشه**: تەڵەزم، لەتی ورد و تیژی ئاسن و دار و بەرد و... ف تراشەی سنگ و آهن و چووب.

**تلّپات**: تلّته، پلّته، بریتی له شتی بێبایەخ. *(تلّپاتی تەڕی تێدا نییه.)* ف کنایه از چیز بیارزش

**تلّغ**: لۆده، کۆگا، *(کۆلّان به تلّغێت بەفر گیرایه.)* ف تودەی برهم انباشته

**تلّنجک**: تەپکه، داوێکه بۆ گرتنی باڵنده. ف دامی است برای شکار پرنده

**تلّۆ**: تولّه، توولّه، قەندی. ف یوز، سگ کوچک شکاری

**تلّووتەک**: هێشوو، بۆڵ، زەنگەتە تڕێ. ف خوشەی انگور

**تلووخانەوه**: گنخان و فلیقانەوەی میوه. ف گندیدن و له شدن میوه

**تلیا مەزن**: قامکه گەوره، پەنجه کەلّه، کلکه گەوره. ف انگشت شست

**تلیابەرانکی**: قامکەگەوره، کلکه زلّه. ف انگشت شست

**تلیچاڤ**: ئەنگوستەچاو، شەوەزەنگ، بلّقەتاڤ. ف شب بسیار تاریک

**تلیسانەوه**: تاوانەوەی کلّۆ قەند و گڵ و ... له ئاودا. ف نرم شدن کلوخ در آب

**تلیسک**: (+) تەڕ، خووساو، *(باران تەڕ و تلیسکی کردووه.)* ف خیس

**تلّیشیاگ**: تلّیشاو، دادڕاو. ف پاره شده

**تلیفسق**: پته، پەلەپیتکه، چەقوونه، چەقەنه. *(دەس*

کردن به *تلیفسق لێدان.)* بشکن زدن

**تلیقانن:** فلیقاندن، پلیشاندن.ف له کردن

**تلیقیاگ:** فلیقاو، پلیشاو. *(تەماتەکە گشتی تلیقیاگه.)* ف له شده

**تلیقیان:** فلیقان، فلێقان، پلیشان.ف له شدن

**تلیلیلان:** هەرا و هوریا و شایی و هەڵبەزین. *(پشیله دیار نەبیَ مشک تلیلیانیانه.)* ف سر و صدا و شادی کردن زیاد

**تمتێل:** تەمتێل، بیچم، ئەدگار.ف سرو سیما

**تنگس:** دارێکی کورتەبنە و چاڵووڵەکە بەرێکی وەک بادامی پێوەیە. (تنگسە هەژارەی پا لەموغار بەند/کیَ تۆی بۆپەرژین لەریشه هەڵکەند؟) ف بوتەای خاردار برای پرچین روی دیوار از آن استفاده میشود.

**تۆپلاخ:** (+) گیاسندە، گیایەکە وەک کەرخنکێنە وایە بۆ باقەبێن دەبیَ، پیزەڵک، پیزەڵ.ف ☜ پیزلخ

**توپلاخه:** توێخڵ، تێکوڵ، تۆخڵ.ف گلولەگل.

**تۆپلاغ:** تۆپلاغه.ف ☜ تۆپلاغه

**تۆپلاغه:** تۆپلاغ، پێکەوە نووساو، تۆپلاخە قوڕ، گڵمەت.ف گلوله گل

**تۆپه:** یەکسم جاری وایە لە برسان یان لەبەر خۆشەویستی یەکتردەلێسنەوە و مووی زیادی بە زمانیانەوە دەنووسیَ و قووتی دەدەن، لە ئاکامدا لە زگیاندا لەسەر یەک گڵۆڵە دەبیَ و وەک تۆپێکی پتەوی لێدیَ و دەبێتە هۆی نارەحەتیی یەکسم.ف مرض اسب و الاغ براثر خوردن مو هنگام لیسیدن یکدیگر

**تۆپی ناوخەتێن:** یارییەکی منداڵانەیە بە تۆپ دەکریَ.ف نام یک بازی کودکانه با توپ

**تۆت:** کڵۆر، خلۆر.ف غلطیده

**تۆتەڵاش:** تەڵاشەدار.ف تراشه

**تۆخ:** دەوڵەمەند، خاوەن دارایی.ف ثروتمند

**تۆخماخی سەر کردن:** پێستی سەر داماڵین، سەرپان کردنەوە. *(بزانیَ تۆخماخی سەرمان دەکا.)* ف پوست سر کندن

**تۆر:** جیَپیَ، شوێن پیَ.ف ردپا

**تۆراخ:** ☜ تۆراغ

**تۆراسک:** گیایەکە بەرێکی وەک قۆرە دەگریَ.ف اسم گیاهی است

**تۆراغ:** *(مانای هەنبانە بۆرینە هەڵەیە.)* دۆی خویَ تیَکراوی ئاو لیَگیراوو خەستەوە بوو دەبێتە تۆراغ، دۆسۆڵ، دۆسوێر.ف دوغ آب گرفته شده و نمک ریخته و غلیظ

**تۆرتان:** مقەست، دوارد، دوێردک، مەگرپێچەنی. ف مقراض، قیچی

**تورڕەهات:** قسەی هیچ و پووچ و بیَمانا. *(شێخ و تورڕەی مێزەرو نەقڵ و نقوولی هیچوپووچ/ مـن بـە تورڕەی یار ئەسیرم، ئەو بە کۆڵیَ تورڕەهات «مەحوی».)* ف حرف پووچ و بیمعنی

**تۆرکردن:** تۆران، زیز بوون، مان کردن و هەڵاتنی کەری نێر، کەرتۆرف فرار کردن و قهرکردن الاغ.

**تۆرکه:** جۆریَ سەوزیی خواردنە.ف نوعی سبزی خوراکی

**توره**: پێوانەیەکە تا ٥ مەن گەنم دەگرێ.ف واحد پیمانه‌ای است که تا ٥ من گندم می‌گیرد

**تۆزتەکین کردن**: ) تەکاندنی شت بە تۆزتەکێن؛ ) بریتی لە لێدان بە ئارامی. *(ئەوە لێدان نییە تۆزتەکێنی دەکەی.)* ف ) گردگیری؛ ) کنایە از کتک زدن به آرامی

**تۆزتەکێن**: ئامرازی تۆز تەکاندن، پەڕۆیەک بە قوڵە دارێکەوە دەبەستن و تۆزی سەر کەلوپەلی پێ دەتەکێنن.ف گردگیر

**تۆسن**: (+) تووڕە، قەڵس، تووڕە و تۆسن.ف عصبانی

**تۆشکیر**: تۆیشتیر، گیسک، بزنە کێویی دوو ساڵە.ف بز مادەی دو سالە

**تۆق**: (+) پەڵە، تۆقەن.ف ☜ تۆقەن

**تۆقە**: دەست و مشتاخ، دەست لێکدانەوە.ف دست دادن

**تۆقەدیوار**: دیوارێک کە چین چین بەقوڕ هەڵیدەچنن و لەژێرەوە ئەستوورە و هەتا بەرزتر بێتەوە، باریکتر دەبێتەوە بۆ حەساری باخ و خانووی دروست دەکەن ف دیوار سنگی.

**تۆقەن**: پەڵە، تۆق. *(تۆقەنێک لە بەفرەکەی تواوبووە.)* ف قطعە

**تۆک**: (+) ) تات؛ ) شتێک کە هیچ کاری لێ ناکا. ف ) زنی کە استخوان، مجرای رحمش را گرفتە باشد؛ ) چیزی کە سخت است و چیزی در آن فرو نمی‌رود

**تۆکلیجە**: گیایەکی وەک کەرتەشی خڕ و تووکنە دڕووی نییە و لە عەرزی کەم بەرز دەبێتەوە، وەک چایی دەمی دەکەن بۆ ژانی جەستە باشە. ف اسم گیاهی دارویی

**تۆلتۆلە**: جۆرێک نانە وەک کەلانە وایە لە جیاتی پیواز و سەوزی ڕۆن دەکەنە نێوییەوە و بە تەندوورییەوە دەدەن.ف نوعی نان روغنی

**تۆڵە شکاندن**: بن پژاندن، کچێنی بردن.ف پارە کردن بکارت

**تۆڵە شکاو**: بنپژاو.ف دختری کە بکارتش پارە شدە باشد

**تۆڵە**: (+) گرکە، گندۆڕە.ف گرمک

**تۆڵەکە**: (+) تەشتی گڵین، سوێنە.ف تشت سفالین

**تۆلێ**: گیایەکە گەلا پانە دەخورێ، تۆڵەکە.ف پنیرک

**تۆمارگە**: شوێنی تۆمار کردن، دووکانی شریت و سی‌دی تۆمار کردن.ف استریو

**تومان**: (دەرپێ، ئاوەڵکراسی ژنانە( تەمومژ.ف ( شلوار زنانە ( مە.

**تۆمەت**: بوختان، ئیفتیرا، بوختان.ف بهتان

**تۆمەتبار**: بوختان پێکراو، تاوانبار کراو.ف متهم

**تۆمەشان**: کووز، هێڵ، بەشێک لە زەوی کە بە خەتێک دیاریی دەکەن و تووی پێوە دەکەن بۆ کێلان.ف قسمتی از زمین تخم پاشیدە شدە برای شخم

**تۆناژ**: بەندەنی ڕژد و چڕ، شاخی ئەستەم.ف کوەصعب‌العبور

**توند**: (+) مەییو، دژی شل، خەست.ف غلیظ

**تونکە**: شۆرت.ف شرت

**تۆو:** ☜ توو

**توو:** (+) ) تۆم، تۆڤ، تۆو؛ ) تۆو، تۆتخمی مرۆ. *(تۆزێکی لەو شیرینییە بەش بە تووی دەتکی.)* ف ) بذر؛ ) نطفه

**تووت و فەراقەت:** یارییەکی منداڵانەیە وەکوو قەرێ قەرێ وایە. ف نام یک بازی

**تووتار:** مەرایی‌کەر، ڕیایی‌باز، خوڵتەکەر، تەشی‌ڕێس، هێلکەکەر، ماستاوکەر ف چاپلوس

**تووتر:** سیکەتۆرە، سیقەتۆرە. ف سنگدان مرغ

**تووترکە سەر:** بریتی لە سەربزێو، نەحەجمیو، هار و هاج. ف ناآرام و شلوغ

**تووتەک:** (+) تاقتاقکەرە، باڵدارێکی شەو بێدارە. *(تووتەک و گوێن و کوند بێکارن/ ڕۆژ وچانیانە، بە شەو بێدارن «هەژار».)* ف بوم

**تووداییە:** ئەو شێعر و گۆرانییەی کابانی شیردۆش لە کاتی مانگا دۆشیندا دەیڵێ. ف شعر و آهنگی که کدبانو هنگام دوشیدن گاو زمزمه می کند.

**توورژیلک:** تەرزەلووکە. ف تگرگ ریز و خشک

**توورکی:** بنەوەشی، جیددی. ف جدی

**توورگ:** چەقەڵ، جانەوەرێکە وەک ڕێوی وایە. ف شغال

**توورەلەم:** گوڵە گەنم کە هێشتا لە ساقەکەی نەهاتوتە دەرێ. گەنم و جۆی کاتی قەفوگوڵ. گەنمێک کە هێشتا نێر نەبووە. ف خوشەی گندم که هنوز در داخل ساقه و برگ قرار دارد

**توسکوول:** بەری دار شەکی، وەک فندق وایە. ف ثمر یک درخت

**تووشی گون ڕەشی خۆ هاتن:** ☜ تووشی نێری شەش گون هاتن

**تووشی نێری شەش گون هاتن:** بریتی لە کەسێک کە ماوەیەک بە کەیفی خۆی ڕایدەدا و ترسی کەسی نییە، بەڵام لەپڕ دژێکی بەهێزی لێ پەیدا دەبێ و زەلیل دەبێ بە دەستییەوە. ف کنایه از کسی که مدتی یاغی می‌شود و عاقبت به‌دست رقیبی توانا شکست می‌خورد

**تووقاڵە:** ) تۆقڵە، بلۆق ) پۆرگ. ف حباب؛ ) تاول

**تووکە مردارە:** ئەو تووکە نەرم و وردانەی بە زەرنەقووتەوەیە و هەڵدەوەرێ پاشان پەڕ و پۆ دەردەکا. ف موی نرم جوجه که بعدا پر جای آن را می‌گیرد

**تووکەمندارە:** تووکە مردارە. ☜ تووکە مردارە

**تووولازم:** دەردە باریکە، نەخۆشینی سیل. ف مرض سل

**توولە:** ڕکە، قەفەز. ف قفس

**توولەکی:** کاسە سەر، کاژەڵاک. ف جمجمه

**توولەوەن:** نەمامی وەن. *(لە چەقەی چەوماخ کەڵەیلە و ڕەمین/ توولەوەن لەژێر ماردەمان چەمین «فۆلکلۆر».)* ف نهال وَن

**توولێن:** بازەڵێن، قەمچان، ڕێخان. ف یەقول دوقول

**تووناو:** پاراو، تەڕوبڕ. ف سیراب

**توونکە:** شۆرت. ف شرت

**تۆونە:** بەراز. ف گراز

**توونەوان:** ئاورچی، ئاگرچی حەمام، کوورەپەز. ف تونچی حمام

**توونی تەبەس:** ☜توونیتەتەر

**توونیتەتەر:** دەرەک، قیرووسیا، جەهەندەم، توونی تەبەس، *(بە توونیتەتەر دەرۆی هەر برۆ.)* ف به درک، جهنم

**توویل زەڕین:** کۆلکەزێڕینە، کەسکاسۆر، پەلکەڕەنگینە.ف رنگین‌کمان

**تووێناوارە:** ئاوارە، بەڕیدە، دەربەدەر.ف آواره

**توێ:** ) بەین، نێو *(بە ڕۆژ دەگەڕێ بە کەتانی/ بە شەو دەچێتە توێی کورتانی «پەندی پێشینان»* ) توێ شیر، سەر توێ.ف (میان ) سرشیر

**توێچ:** پرژ و بڵاو، شێواو، پەرگەنە.ف پراکنده

**توێخ بردن:** ئازار دانی زۆر، ماندوو کردنی لە ڕادەبەدەر. *(هێندەی هەڵسووڕاندین توێخی بردین.)* ف کنایه از زحمت زیاد

**توێخ چوون:** زەحمەت کێشانی زۆر، بریتی لە کاری زۆر سەخت. *(هەتا لەو کارە تەواو بووین توێخم چوو.)* ف کنایه از زحمت زیاد

**توێشک:** توێ، سەرشیر، تۆ.ف سرشیر

**تویشک:** کاژیلەی ماڵی یان کێوی لە سێ مانگان تا یەکساڵە.ف بزغاله در سه ماهگی تا یک ساله

**توێکاری:**لەشکۆڵین، نەشتەرگەری لە سەر جەستە بە وردی.ف کالبد شکافی.

**تەبارە:** گەنم وجۆیەک کە هێشتا نەدوورابێتەوە و هەر بە پێوە مابێ.ف گندم درو نشده

**تەباشیر:** گەچی نووسین.ف گچ تحریر

**تەبەق:** (+) ) پەڕە کاغەز، وەرەق. *(تەبەقێ کاغەزم هێنا و نامەم نووسی.)* ؛ ) پارچە شووشە. *(تەبەقێ شووشەم بۆ پەنجەرەکەمان کڕی.)* ف ) ورق کاغذ؛ ) قطعه شیشه

**تەپتەپە:** زەنگوڵەی گەورە کە بەجێی زرینگە تەپەی لێدێ و لە ملی بزن یان مەڕی سەرگەلەی دەکەن.ف نوعی درای

**تەپڵدران:** ئابڕوو چوون، عەیب و عار وەدەر کەوتن، بێئیعتبار بوون.ف رسوا شدن

**تەپە:** (+) سلە شیاکە، تۆپەڵە شیاکە. *(تەپەیەک شیاکەی کرد مانگاکە.)* ف برهم انباشته

**تەپەدۆرە:** فیبری سپی بۆ ڕاگرتنی سەهۆڵ و ساردەمەنی ف یونولیت

**تەپەسوری:** وڕ بوون، ترس لێ نیشتن، دڵەخورپە.ف نگرانی

**تەپەسەنە:** هەوڵدانی خۆڕایی، هەوڵدانی بێهۆ. ف تلاش بیهوده

**تەتڵەزوان:** لاڵەپەتە، کەسێ کە قسەی چاک بۆ نایە، تور.ف الکن

**تەتڵەمێوە:** کەلووی کرمی هەورێشم، قۆزاخە.ف پیلەی کرم ابریشم

**تەتە:** (+) ناوی چیایەکە لە هەورامانف کوهی در اورامانات

**تەتەرپێچ:** پێچانی لاق و بەلەک بە پەڕۆ و بەن کاتی سەفەر لە بەفر و سەرمادا.ف پیچیدن ساق پا از زانو و به پایین با نوار پارچه‌ای

**تەتیاین:** دۆزینەوە، پەیدا کردن.ف پیدا کردن

**تەخچک:** شیو، گەلی، دۆڵ، خڕ.ف دره

**تەدار:** تادار، نەخۆش، کەسێ کە تووشی تاویاو بووە.ف تبدار

**تــەڕ و وشــک هــەڵخــستن:** دوو کــەس کــە دەیانهەوێ یاری بکەن بۆئەوەی کەسی یەکەم واتە مەڵلا دیاری بکرێ لەتێ سواڵەت یان بەردێکی پان دیوێکی تەڕ دەکەن و هەڵیداوێن، دیوی تەڕی هی یەکیان و دیوی وشکی هی ئەوی دیکەیانە.ف شیر و خط

**تەڕازەن:** ☜ تەڕەزەن

**تەربیش:** تەکمیش، بنکۆڵی رەز و بێستان.ف پی زدن و سست کردن خاک جالیز

**تەرت:** (+) (کلۆشی گێرە کراو کە هێشتا شەن نەکراوە.( هەڵدێر، هەڵەت، رژد ف (خرمن کوبیده شدەی هنوز باد دادە نشدە(پرتگاه.

**تەرتوتەلان:** هەڵدێر، هەڵەمووت، رژد، *(مامە ڕاوچیی رەوەز و تەرت و تەلان/ ئێستە کەی کاتی لە خەو ڕاچوونە/ کە دییان کۆتەڵی باڵات رووخا/ داڵە کەرخۆر لە وڵات بەربوونە «ئەمین گەردیگلانی».)* ف سربالایی صعب‌العبور

**تەرچک:** (+) شلک، ناسک، تورت.ف ترد و نازک

**تەڕدەماخ:** کەیفخۆش، بە کەیف، دڵشاد، دەماخچاخ، دەماختەخت.ف شاد و شنگول

**تەڕدەماخی:** کەیفخۆشی، شادی و دڵخۆشی. ف دماغ‌چاقی

**تەرشک:** قەڵشت، درزی گەورە.ف ترک، شکاف

**تەرفتین:** شپرزەیی، ئاڵۆزکاوی.ف از هم پاشیدگی

**تەرک:** (+) تەخت، ژێر. *(تەرکی ژوورەکەیان فەرشێکی لێ ڕانەخراوە.)* ف کف

**تەرکەندە:** هەوەڵ، سەرەتا. *( لە تەرکەندەوە وا هاتووە.)* ف نخست

**تەرکی ژێر بەرە:** گەمەیەکی لاوانی گوندنشینە دوو کەس دەچنە ژێر بەڕەیەکەوە کەیەکیان پێشتر ئەو گەمەیەی نەکردبێ و نەیدیبێ، ئەوەی پێشتر ئەو یارییەی کردووە بەدزییەوە شووڵکێک بەدەستەوە دەگرێ و دەیباتە ژێر بەڕەکەوە، هەر شووڵکێک لەهاوگەمەکەی دەدا و شووڵکێکیش لەعەرزەکە دەدات و هاوار دەکا؛ هاوگەمەکەی پێی وایە لە هەردووکیان دەدەن.) ف نوعی بازی جوانان روستایی.

**تەرکی:** زەبەلاح، تەژە، تاژان.ف لندهور

**تەرمەک:** تەرمەگ، مەڵۆی درک و داڵ.ف پشتەی خار.ف

**تەرمەگ:** ☜ تەرمەک

**تەڕە بازاڕ:** بازاڕی میوە فرۆشتن.ف میدان ترەبار

**تەڕەبار:** (+) ☜ تەڕەوار

**تەڕەبن:** تەڕەون، ناوی بنچکێکی کوڵەبنەیە چاڵووکی هەیە و وەک زی وایە.ف نام بوتەای است خاردار.

**تەڕەبنە:** ☜ تەڕەبن.

**تەرەز:** تەرزە، گارسیۆک، گژل، تەیرۆک، ترگژۆک، گژلووک، تەزرە.ف تگرگ

**تەڕەزەن:** (+) گیایەکی کوێستانییە گەڵاکەی وەک پیواز وایە ماڵات زۆر چاکی دەخۆن، هەتا زستان سەوزە و زەرد نابێ.ف اسم گیاهی است

**تەڕەکەباب:** شۆرباوی گۆشتی مریشک کە

ترشی سماقی لێدەدەن.[ف] آبگوشت مرغ

**تەرەکەمە:** ئاوارە، شار بە دەرکراو. *(بۆ هەڵوەدا و تەرەکەمان/ بۆ رووتەڵ و دڵبەخەمان. «راوچی»)* [ف] آوارە، دربدر

**تەڕەکی:** تەڕ بوونەوەی ماڵات، واتە خواردنی گیا شینی بەهاری و تەقەفیرە گرتنی. *(مانگاکان هەموو تەڕەکییان گرتووە.)* [ف] اسهال حیوانات

**تەرەکیوەن:** بەنتەرکی، پەتێک کە بە تەرکی زینەوەیە و شتی پێدەبەستن.[ف] فتراک

**تەڕەوار:** ) میوەی تەڕ و تازە؛ ) باقە یا مەڵۆ گیایەک کە دەیهێننەوە بۆ ماڵ.[ف] (میوەی تازە ) علوفەی تروتازە.

**تەرەوڵ:** باڵندە، فڕندە، پەلەوەر، پەڕۆک.[ف] پرندە

**تەریب:** تەقەڵی ڕاست و میزان، *(کڵاوەکە تەقەڵی تەریب و جۆدانم لێداوە.)* [ف] بخیەی راست در کلاە

**تەریبوجۆدان:** جۆرێ تەقەڵی درشتە لە کڵاوی دەدەن و دوایی بەن دەکەن بە بەینی تەقەڵەکاندا بۆئەوەی کڵاوەکە ڕەق بێ.[ف] نوعی بخیەی کلاە

**تەرییە:** چەتە، ڕێگر، جەردە.[ف] راهزن

**تەزبی:** ☜ تەزبێح.

**تەزبێح:** تەسحێب، تەسبێح.[ف] تسبیح

**تەزحێب:** تەسبێح، تەزبێخ.[ف] تسبیح

**تەزوێح:** تەسبێح، تەسحێب.[ف] تسبیح

**تەژ:** کاریتە، شاتیر.[ف] بالار

**تەسبێح:** تەزحێب.[ف] تسبیح

**تەست دانەوە:** هەس دانەوە، بەرپەرچ دانەوە، پاساو دانەوە.[ف] ☜ پەرچم دانەوە

**تەسحێب:** تەسبێح.[ف] تسبیح

**تەسلەخ:** ناماقووڵ، سووک و چرووک.[ف] هرزە.

**تەسلیم بە خاک کردن:** بریتی لە ناشتنی مردوو. *(هەر شەوێ تەرمەکەی تەسلیم بەخاک کرا.)* [ف] دفن کردن

**تەسوق:** نۆبەرە، شتێک کە تازە هاتبێ و تا ماوەیەک خۆشەویست بێ.[ف] نوبر

**تەشمەلیچ:** ☜ ئاگرمەلووچ

**تەشەخوس:** هەوا، فیز، دەمار. *(هێندە بە تەشەخوسە دەماری ناهێنێ قسە لەگەڵ کەس بکا.)* [ف] متکبر

**تەشەنگ:** پڕاوپڕ، کەیل، لێواولێو. *(قاپەکە وا تەشەنگ بووە لێی دەڕژێ.)* [ف] لبریز، پر

**تەشی تەشی:** گەمەیەکی لاوانی گوندنیشینە.[ف] نام یک بازی جوانان

**تەشیشی:** چاوەڕوانی کردنی کەسێک بە دڵنیگەرانییەوە.[ف] انتظار پر از تشویش و نگرانی

**تەفتە:** چەفتە، چەفیە، جۆرێ دەسماڵە لە ملی دەهاڵێنن.[ف] چفیە

**تەفروتوونا:** تەرتووتوونا، هەرنەماو، لەنێوچوو، فەوتاو بە یەکجاری.[ف] تارومار و نابود

**تەڤزین:** (+) نەخۆش کەوتن و کەلەلا بوون .[ف] بیمار شدن و از پا افتادن

**تەقاندن:** هەڵبڕین، ڕاونان، ڕەپێنان، ڕەتاندن. *(دەمتەقێنن چەشنی ڕێویی بەندەنێ/ ئەو*

*کەسانەی لای کونێشم نادەنێ. «هێمن».)* ف دنبال کردن.

**تەقتەقان:** ڕەقەن، زەویی بەردین، کێوێک کە سەرەکەی تەختەبەرد بێ. ف زمین یکپارچه سنگ

**تەقتەقە تاوێر:** تەختە بەرد، تاوێرە بەرد. ف تخته سنگ

**تەققە:** ) تەقە، وێک کەوتنی دوو شتی ڕەق؛ ) دەنگی تفەنگ. ف ) صدای بەهم خوردن دو چیز سفت؛ ) صدای تفنگ

**تەقلان:** شۆڕش، ڕاپەڕین، ڕاسان. *(خەڵکەکە گشتی تەقلان کردن وە دژی شا)* . ف قیام.

**تەقڵوشەقەڵ:** بێگار. ڕەتاندن و کار پێکردن بە زۆر و بەلاش. ف بیگار

**تەقڵۆکە:** گیایەکە نیو مەتر لە زەوی بەرز دەبێتەوە لاسقەکەی سپییە و گوڵی زەردە، گیا ترۆقەشی پێدەڵێن. ف اسم گیاهی است

**تەقلە:** گیا ترۆقە، گیایەکە وەک گوێ بەرخۆلە وایە بەرێکی ورد دەگرێ دەستی پێدا بێنی دەتەقێ، تەلۆکە. ف اسم یک گیاه

**تەقڵەدەو:** تەقڵەکوت، هەڵاتن بە پرتاو. ف با سرعت دویدن

**تەقەتۆرە:** تەقەفیرە، بەلەفیرە، سکەشۆرە. ف اسهال

**تەقەز:** تەنانەت، تەنانە، هەتاکە. ف حتی

**تەقەڵ ترۆزی:** تەقەڵی خراپ و درشت و خواروخێچ لە درومانندا، ترتەقەڵ. ف بخیەی درشت و کج و کوله در دوزندگی

**تەقەوەستان:** ئاگربەس، تەواو بوونی شەڕ. ف آتش‌بس

**تەقین:** (+) هەڵاتن، ڕا کردن. ف فرار کردن

**تەکاری:** چارۆکە، کۆڵوانە، پارچەیەکی چوارگۆشەیە ژنان بە شانیا دەدەن. ف پارچەی چهارگوشەای که زنان بر دوش می‌اندازند

**تەکمیش:** (+) پەرازێتی ڕادیۆ و تیڤی. ف پارازیت رادیو و تلویزیون

**تەکوو:** وچان، پشوودان، سانەوە. *) فره مانوو بووگین چکێ تەکوو بەین خاسه.)* ف استراحت

**تەگرەجیلە:** تەرزەلووکە، تەرزەی ورد. ف تگرگ ریز

**تەگەر:** تایە، چەرخی ئوتۆمۆبیل. ف چرخ و لاستیک اتومبیل

**تەلان:** کۆلانی باخ. ف کوچەباغ

**تەڵچن:** گوڵبژێر، هەڵبژاردە. ف گلچین

**تەڵخەک:** بریتی لە قەڵەو و ناقۆڵا، شلەپەتە و قەلافەت نالەبار. ف کنایه از سنگین و شل وول

**تەلدروو:** ئاسندرک، تێلی وارشی درکدار. ف سیم خاردار

**تەڵوەنە بوون:** شەلاڵ بوون، خووسان. *(سەری تەڵوەنە بووگە لە خوون.)* ف آغشته شده

**تەڵوەنە کردن:** شەلاڵ کردن، شڵتانی خوێن کردن، خووساندن. ف آغشته کردن

**تەڵوەنە:** شەلاڵ، شڵتان، *(تەڵوەنە بووگن لە خوونی خوەیان.)* ف آغشته

**تەڵە کردن:** هەڵچەقینی بەرد لە بنی پێی یەکسم لە کونی ناڵەکەیەوە. *(ماینەکە تەڵەی کردووە*

*بۆیە دەشەلێ.)* ف فرو رفتن ریزه سنگ در پای اسب و الاغ

**تەلەسەنگ:** تەختە بەرد، بەردی پانی گەورە. ف تخته سنگ

**تەلیزە:** تەلیس. گۆنیە. ف گونی

**تەمایر:** تەمایەر، بەتەما، بەهیوا. ف خواستار، مشتاق.

**تەمایەر:** ☜ تەمایر

**تەمبار:**( بەرزایی کەم، تەپک، تیرەگ.( تەم لێنیشتوو (بەفری تەواوەی سەر شاخی تەمبار/دەبێ بەفرمێسک چۆڕچۆڕ دێتە خوار«ڕەحیم لوقمانی».) ف ( تپه (مه گرفته.

**تەمباسک:** تەپۆڵکە، تەپۆکە، کۆگای گڵ. ف تپەی کوچک

**تەمتێل:** تمتێل، سەر و پۆتراک، بیچم، سەر و سەکوت. *(بەلالەی تەمتێلەت وارێ.)* ف سروسیما

**تەمدار:** داری قالی، دار تەون، دار هەنە. ف دار قالی

**تەمساڵ:** تەنبەڵ، تەوەزەل، لەشگران، تەمەڵ، تەپ. ف تنبل

**تەمساڵی:** تەمەڵی، تەوەزەلی. ف تنبلی

**تەمۆرێ:** کاکۆڵ، قژی چەپک کراو. ف گیسوی دسته شده

**تەموورکە دان:** ئاپۆڕە دان، کۆزیلکە بەستن، تەموورە دان، *(خەڵکێکی زۆر لە دەوری کانییەکە تەموورکەیان دابوو.)* ف ازدحام مردم

**تەمەرێز:** شەڕەکەڵ. ف جدال گاومیش نر

**تەمیرە:** تەنبوور، سازێکە وەک سێتار وایە دوو سیمی هەیە و سازی مەزهەبیی ئەهلی هەقە. ف تنبور

**تەنتەنە:** پووڵەکە، ئۆییە، خشل و زمبەر. ف زیورآلات.

**تەندووراو:** گێژاوی گۆمی زۆر قووڵ. ف گرداب

**تەندوورەزەنە:** بە پێچ و لێک هاڵان وەسەر کەوتن وەک دووکەڵ و گێژەڵووکە. ف بەهم پیچیدن و بلند شدن گرد و خاک و دود

**تەنکە بە دۆ:** دۆیەک کە لە تۆراغی وشکی ساز دەکەن و دەیخۆنەوە. ف دوغ کشک.

**تەنگ پێ هەڵێنان:** تەنگ پێ هەڵچنین، زۆر بۆ هێنان. *(خەیاڵ و خەون و تاسە هاتوونە ژوانگە بۆ دڵ/ هومێد و شادی تەنگی بە ژان و خەم هەڵێنا «ئەمین گەردیگلانی».)* ف در تنگا قرار دادن

**تەنگاوەر:** دۆڵ، گەڵی، شیو. ف دره

**تەنگە ئەستوور:** زگزل، زگهانک، گەدەزل. ف شکم گنده.

**تەنگەبان:** تەقڵەباز، *(کوترێکی تەنگەبانم هەیە.)* ف معلقزن

**تەنگەزکری:** تەمبەڵی، تەمساڵی، لەشگرانی. *(چەنێ لەکار تەنگەزکری کەیت.)* ف تنبلی

**تەنگەلان:** تەنگەبەر، شوێنی تەنگ و چکۆڵە. *(لەو ژوورە تەنگەلانەدا شەش کەس دەخەون.)* ف مکان تنگ و کوچک

**تەنگەوتیلکەدان:** شەتەک دان، توند بەستن (کۆڵەکەی لەپشتی تەنگەوتیلکە داو وەڕێ کەوت.) ف محکم گره زدن بار

**تەننگ:** ) تەنک. *(ئاوەکە تەننگە.)* ؛ ) ناسک. *(پارچەکە تەننگە.)* ف) آب کم عمق؛ ) نازک

**تەنەشۆر:** تاتەشۆر، ئەو تەختە بەردەی مردووی لەسەر دەشۆن. ف تختە سنگی کە روی آن مردە را غسل می‌دهند

**تەنەوە:** بڵاو بوونەوە، تەنینەوە، پەرە گرتن. ف سرایت

**تەنیمۆک:** قورم، دوودەی بنمیچ و دیواری سەر تەندوور. ف دودە

**تەوازوو:** تەوازی، عوزرمایی، داوای لێبوردن. ف معذرت خواهی.

**تەون:** بەرد، کوچک، سەنگ. ف سنگ

**تەوەرە:** (+) مێحوەر. ف محور

**تەوەکل:** ئاونگی لە دار دورست کراو بۆ کوتان و ورد کردنی دانەوێڵە. ف آونگ چوبی

**تەوەلا:** لانەواز، تەرە، دەڵە. ف پرندەای کە از لانەاش گریزان است.

**تەوێشق:** تەشق، حەوێق، پەرپەرۆچکە، بەرزایی ئاسمان. ف اوج

**تەهلووکەرێ:** رێگای سەخت و هەڵەمووت، رێگای هەوراز و ئەستەم. ف راه سخت

**تەیاخ:** کۆپارە، شانی بەرزەوە بووی گا و جوانەگا. ف گردەی پشت گردن گاو

**تەیروتواڵ:** پەلەوەر، تەرەوڵ، باڵندە بە گشتی. ف طیور

**تەیڤەز:** ساز، تەیار، ئامادە. *(خەڵکی بۆ ئەوکارە خۆ تەیڤەز کرن.)* ف حاضر

**تەیڤەزین:** خەبابەت، ساز بوون، خۆ تەیار کردن. ف حاضر شدن

**تێ تووراندن:** فوو کردن بە شمشاڵدا. شمشاڵ لێدان. *(تێ تووڕێنە لەو شمشاڵە.)* ف نی زدن

**تێ راخوڕین:** بە سەردا نەڕاندن و لێ تووڕە بوون. *(هەرکە چاوی پێم کەوت تێم ڕاخوڕی.)* ف داد کشیدن بر سر کسی

**تێ قلّماندن:** تێ قوڵپاندن، لە سەرەوە تێڕژاندنی ئاو. ف از بالا ریختن آب در چیزی.

**تێ قووچاندن:** بە پرتاو هەڵاتن و خۆ دەرباز کردن. *(فیزماڵکێکم لێدا و بە دۆڵێدا تێم قووچاند.)* ف با سرعت دویدن و در رفتن

**تێ قوولاندن:** ) بریتی لە هەڵاتن، تێ قووچاندن. *(بە پرتاو تێی قوولاند.)* ؛ ) هاوار کردن، نەڕاندن. *(کاتێک چاویان بە گورگەکە کەوت تێیان قوولاند و هەڵیانبری.)* ف) با سرعت دویدن؛ ) با صدای بلند داد کشیدن

**تێ گرتنەوە:** سەرلەنوێ تێ هەڵکردنەوە، هاویشتنی دووبارە. ف پرتاب کردن دوبارە

**تیا هێشتنەوە:** کەسێک کە زۆر تووڕە دەبێ لە شەڕدا و قسەی پیس دەکا، پێی دەڵێن بە تاقەت بە شتێکی تێدا بێڵەوە ف اندازە نکاه داشتن.

**تیاح:** وشەی واقوڕمان و سەرسووڕمان. *(تیاح لەو فیلەتەنە.)* ف کلمەی تعجب

**تیانە:** (+) وانی حەمام، حەوزی چکۆڵەی حەمام. ف وان حمام

**تیتاڵ:** (+) شیتاڵ، کوتە پەڕۆ. *(تیتاڵی پەڕۆ دەس ناکەوێ.)* ف تکە پارچە

**تێچزان:** تێزان، *(بەردێکم دا بە قامکی خۆما*

خوێنی *تێچزا.)* ف خون دويدن زير پوست براثر ضربه

**تێخوڵ**: توێکڵ، توێخڵ، تێکوڵ. ف پوست

**تیخە**: تیغە، دیواری تەنکی نێوانکەر. ف تیغە.

**تیخە کردن**: تیغە کردن، دیواری تەسکی نێوان دوو هۆدە. *دیوەکەمان لە نێوەڕاستدا تیخە کراوە.)* ف تیغە کردن دیوار.

**تێدا چوون**: فەوتان، لەبەین چوون. ف از بین رفتن

**تێر و پڕ**: تەواو تێر. *(تێر و پڕمان گڕکە خوارد لە بێستانەکە.)* ف سیر شدن

**تێڕامان**: چاو لێ کردن و بیر لێ کردنەوە. *(ماوەیەک بوو تێم ڕامابوو.)* ف نگاه کردن و اندیشیدن

**تێربەز**: قەڵەو، گۆشتن. ف چاق، قربه

**تیرفرنگ**: پەلەپیتکە. ف تلنگر

**تێڕۆ هاتن**: رفاندن بە پەلە، پەلامار دان. *(خۆی لە هەر دۆڵ و دەراڵێ مات بکا کەروێشکی قوز/ بێئەوی مەودای بدا تێی ڕۆ دێ دالاشی گونم.)* ف ربودن با شتاب

**تیروپشک**: قورەکەشی، پسوولەی بەخت تاقی کردنەوە. ف قرعه

**تیروچەقەڵ**: شتێک بووە وەک خێشک بە گا یان ولاخ ڕایاندەکێشا بۆ ڕاگوێستنی شتی قورس، وەک بەرداش و هتد و ... ف نوعی سورتمه برای جابجا کردن وسایل سنگین

**تیرۆژک**: تیشک، پرشنگ. ف نور

**تیروو**: توورگ، چەقەڵ. ف شغال

**تیرهاوێ**: تیراوێ، سیخوڕ، جۆرێ ژیشکی گەورەیە کاتێک خۆی وێک دێنێتەوە دڕووەکانی وەک تیر دەهاوێ و دەڵێن لە هەر کەس بدرێ دەبێتە برین و چاک نابێتەوە، بە برینەکەش دەڵێن تیراوێ. ف جوجەتیغی بزرگ

**تیرەشان**: گردەشان، لاپاڵی کێو، قەدی کێو. *(بە تیرەشانەکەدا داگەڕاین.)* ف سینەکش کوه

**تیرەگ**: یاڵ، کەڵک، ترۆپک. ف تپه

**تیری لێدان**: وەردێنە لێدان، نان کردنەوە. ف نورده زدن در نانوایی

**تیری لێدەر**: وەردێنەچی، نانکەرەوە. ف نوردەچی در نانوایی

**تیری نەبەدی**: گوللەی وێڵەکی، گوللەیەک کە بەبێ ئامانج دەهاوێژرێ و لە کەسێک دەرێ. ف گلولەی بدون هدفگیری شلیک شده.

**تیزوفیز**: ئەستوونی یەکتر بڕ، دوو هێڵی ڕاست و چەپ، عەلامەتی زەرب. ف دو خط متقاطع

**تیزماڵ**: ☜ تیزماڵک

**تیزماڵک**: لەتە پەڕۆ، تیسماڵک. ف تکه پارچه

**تیژەمار**: توولەمار، جۆرێک ماری باریک و درێژە زۆر بە توندی دەخوشێ. ف نوعی مار که سرعت زیاد دارد

**تیسقوفلاسق**: بەرگی شەڕکەر و ڕاوچی. ف وسایل و برگ شکارچی و جنگجو

**تیسماڵک**: ☜ تیزماڵک

**تێسووەبزنە**: توێسییە بزنانە، جۆرێ توێسیی لاسق باریکی سپی واشە. ف گیاهی خاردار

**تێسووەکەرانە**: توێسییەکەرانە، جۆرێ توێسیی

لاسق ئەستوور و مەیلەو سپییە.[ف] گیاهی است خاردار

**تێسووەگایە**: جۆرێ توێسییە لاسقەکەی پاک دەکەن دەخورێ، زۆرخۆشە و تامی جەعفەری و گێزەر دەدا.[ف] گیاهی خاردار و خوراکی

**تێشتەچا**: قاوەڵتوون، قاوەڵتی، قاوەتوون، نان و چایی بەینی بەیانی و نیوەڕۆ.[ف] چاشت هنگام

**تیشک**: (+) تویشک. ☜ تویشک

**تیشکەڵە**: مرۆی قەد باریک و لەبار، بەلەباریک. [ف] باریک اندام

**تیشەشاخ**: بەردی زەق و دەرپەڕیوی کێو، زنار. [ف] سخره

**تێغەرە**: بڕبڕەی پشت، مۆغەرە، بڕبڕاگە.[ف] ستون فقرات

**تیفیک**: کوورەی ئاسنگەر، مووشەدەمە، دەمەی ئاسنگەر.[ف] کوره آهنگری

**تێک قرمان**: تێک ڕووخان، تێک تەپین.[ف] ویران شدن

**تێک قرماو**: تێک ڕووخاو، تێک تەپیو.[ف] ویران شده

**تێک قژقژان**: بە یەکدا دران و تێک هاڵان، ورووژان و تێکەڵ بوون، *(ئاپۆرەی خەڵک لەو مەیدانە تێک قژقژا بوون.)* [ف] به هم پیچیدن جمعیت

**تیک**: (+) بریسک، تەزووی بە ژان.[ف] درد زیاد

**تیک**: (+) میتکە، میتک، بەلوو[ف] چوچوله

**تێکست**: دارشتنەوەی دەقی نووسراوە، نووسینەوەی دەق.[ف] ساختار

**تێکلقان**: بەنێو یەکدا چوون، تێک پەڕین، پێکدا چوون.[ف] در هم فرو رفتن

**تێکوڵ**: تێخوڵ، توێخڵ، توێکڵ، تۆکڵ.[ف] پوسته

**تیکە خۆشە**: تیکەی دوایی لە نان خواردندا کە شتێکی خۆش دەخۆن بۆئەوەی تامی زار خۆش بێ. *(جنچکێ گۆشت بێڵەوە بۆ تیکە خۆشە.)* [ف] خوردن لقمەی لذیذ بعد از غذا

**تێڵەکێش**: کارەکەر، کرێکار، ناوەکێش، کرێکارێک کە تەشتە قوڕ دەکێشێ.[ف] کارگر

**تیلەگ**: کێوی چکۆڵە، تیرەگ.[ف] تپە

**تێلیسان**: تەیلەسان، قایشێکە وەک پێشی شەپکە بۆ خۆ پاراستن لە تیشکی خۆر لە نێو چاوی دەبەستن.[ف] سایەبانی کە مانند لبەی کلاە پیشانی دارد

**تیمان**: کەوپێچ، ئەو شوێنەی پۆلی کەو پێیدا دەڕۆن و ڕاوچییان ڕاویان دەکەن.[ف] محل عبور دستەی کبک

**تینتینۆکە**: ئەوک، قوڕقوڕاچکە، قورگ.[ف] حلقوم

**تینی**: (+) گەروو، ئەوک، قورگ، قوڕوو.[ف] گلو

**تیوار**: تەنگ، دژی گوشاد، تەنگ و تیوار.[ف] تنگ

**تیووز**: کاژیلەی یەک ساڵە کە ئاوس دەبێ، بیژووکەزا.[ف] بزغالەی یک سالە کە بچە بزاید

**تێوەچوون**: دەم بە دەمە کردن، شەڕە قسە. *(لەگەڵی تێوە مەچۆ، بۆ لەگەڵ ئەوە تێوە دەچی؟)* [ف] جدال لفظی

**تیەنگ**: تینوو، تونی.[ف] تشنە

**تیەنگی**: توونییەتی، تینوێتی.[ف] عطش، تشنگی

**تێ‌هەڵکردن**: (+) بۆهاویشتن، تێ‌گرتن. *(بەردێکم تێ‌هەڵکردن داخەم نەیگرت.)* [ف] پرتاب کردن

# ج

**جابه:** دۆڵ و شیوی قەدی کێو. *(بە ڕەشە ڕێحانێ کە شین دەبوو لە جابە جابەی دەلەندی «فۆلکلۆر».)* ف دره

**جاجوو:** نەیار، دوژمن، *(ئەر دوو برایە بوونە وە جاجووی یەکتری.)* ف دشمن

**جاڕوجڕ:** زەوییەک کە دووساڵ لەسەر یەک بکرێ بە گەنم. ف زمینی که دو سال پشت سر هم گندم بکارند

**جاڕەوجاڕ:** بریتی لە چاندنی دووبارەی جاڕە گەنم بە گەنم. ف کنایه از کاشتن مکرر

**جاش:** (+) مەوج، جاجم. ف جاجیم

**جاشکەوش:** کەوشی لە چەرم دروست کراوی هەرزان بایی، کاڵە. ف کفش ارزان قیمت

**جاعێر:** جحێڵ، هەرزەکار. گەنج، لاو. ف جوان

**جافی:** پاتۆڵی فشوفۆڵ، جۆرێک شەرواڵی تایبەتی جافان. ف نوعی شلوار مخصوص جافها

**جاقی:** ) لووس، بریقەدار، سواو؛ ) بریتی لە منداڵێک کە زۆری لێدرابێ و بە لێدان ڕاهاتبێ. *( بە لێدان چاک نابێ تازە جاقی بووە.)* ف ) ساف شده؛ ) بچه بد ادا

**جامەلووسکێ:** زمانلووسی، جامەلووسی، دەمتەڕی. ف چاپلووسی

**جامەمەڕی:** جامی مەڕ دۆشین، مەڕدۆش، جۆرێ سەتڵی چکۆڵە بوو بێری دەیبرد بۆ مەڕ دۆشین. ف سطل

**جانبێزار:** ناوی جۆرێ تفەنگی قەدیمی بوو، ڕەشاش. *(دۆست ئەو دۆستەیە حەساوی ڕێک بێ/ وەک تیر جانبێزار یەک لەدوای یەک بێ «فۆلکلۆر».)* ف نوعی اسلحه قدیمی

**جانیک:** جوانوو، جانی، بەچکەی ماین. ف کره‌اسب

**جاوەجاو:** ژاوەژاو، هەرا هەرا، گاڵوبوغر. ف سروصدا

**جببە کردن:** جەریمە کردن، تاوان لێ ساندن. ف جریمه کردن

**جڕوجانەوەر:** ) (+) گیانلەبەری ورد و درشتی زۆر، *(وڵات پڕ بووە لە جڕوجانەوەر.)* ؛ ) بریتی لە خەڵکی ناحاڵی و خراپ و بێڕەحم. *(پیاو لەو بازاڕەدا لەگەڵ ئەو هەموو جڕوجانەوەرە پێوە دەبێ.)* ف ) جمع جانوران؛ ) کنایه از مردم بد و حیوان صفت

**جڕ:** گیانلەبەری وردیلە و بێخوێن. ف حشره

**جـرپن:** (+) ترکـەن، تـرن.ف کـسی کـە زیـاد میگوزد

**جرەو:** توورە، ئاڵەتی، قەڵس.ف عصبانی

**جریت:** (+) فیچقە، فیشقە کردنی شتی ئاوەکی.ف فوران و بیرون زدن مایع از سوراخ کوچک

**جزیا:** عازاو، ئازار، عەزاو.ف عذاب

**جسان:** زستان، زمسان.ف زمستان

**جـسانەزێ:** بـەرخـێ کـە لـە زسـتاندا لـەدایـک بـووبێ.ف برەای کـە در زمـستان بـەدنیـا آمـدە باشد

**جستان:** زستان، ئەستان.ف زمستان

**جـستانە:** زسـتانە، جـستانی، شـتێ کـە تایبـەتی جستان بێ.ف زمستانی

**جفتـوو:** گـورپـە، کـێبـەرکـێ، رقـە، ململانـێ.ف مسابقە

**جفنە:** تەشتی دارین بۆ هەویر شیلان.ف ظرفی چوبی برای خمیر کردن آرد

**جککـە:** چۆلـەکـە، چێشکە، چـووک، مـەلووچـک، مەلیچک، پاساری، سواندووکەف گنجشک

**جگەرەی قامیش:** جۆرێ جگـەرەیـە لـە کاغـەزی تایبەتی دروست دەکرێ قونچکەکەی کاغەزێکی نـەختـێ ئـەستووری تێدەخـرێ. هـەر دە دانـەی لـەنێـو یـەک ڕا دەکـرێ و وەک قـامیش دەچـێ، دوای پـڕ کردنـی لـە تـووتن دەبێتـە جگـەرە.ف نوعی سیگار دستپیچ.

**جڵغە:**(شوێنی پێوەندیی تیغ و مشتووی خـەنجـەر و شمشێر.( جەغەتە، ئاوێک کە تـەواو نـەبووبێ بـە سـەهـۆڵف (محـل بـەهـم رسـیدن تیـغ و دەستەی شمشیر( آبی کە هنوز منجمد نشدە است

**جلە:** (+) گیایەکی ئافـەتـە وەک داموسـکی زەرد وایــە لــە گــژ و گیـا ودرووە شـینە دەهــاڵێ وزەردی هەڵدەگێڕێ.ف یک آفت گیاهی

**جلـەگـوێنی:** جۆرێـک گـوێنیی درووو وردە بـە عـەرزدا پـان دەبێتـەوە و لـە دوورەوە هـەر لـە ژیشک دەچێ.ف نوعی گون

**جلەلاوێن:** گیایەکی زەردە وەک داموسک وایـە لـە گـەڵا و لاسـکی وێنجـە و بێـستان دەهـاڵێ و وشکی دەکا.ف انگل نباتی

**جنچـک:** چنچـک، بڵێـسک، پلـە گۆشـت.ف تکـە کوچک گوشت

**جنێـر:** ئاسـۆ، ئاسـۆگ، سـوێ. *(مانـگ تـازە لـە جنێرەوە سەری دەرهێنا بوو.)* ف افق

**جۆ رووتـە:** جـۆرێ جۆیـە. گوڵـەکـەی قـەڵتاسـی نییە.ف نوعی جو

**جۆ هەشت دان:** جۆی هەشت پەڕ، جۆرێ جۆیە گوڵـەکــەی چوارسـووچە.ف نـوعی جـو کـە خوشەاش چهارگوشە است

**جـوانپـەرسـت:** کـەسـێ کـە شـەیدای جوانییـە. *(جوانپەرستم، جوانپەرستم/ بە دیداری جوانان مەستم «هێمن».)* ف زیباپرست

**جوانکیلە:** جوانکیلانە، جوانکەڵە.ف زیبای کوچک

**جوانەزمە:** جوانەزووە، جوانەژۆ، زیپکەی دەم و چاوی تازە لاو.ف جوش صورت جوانان

**جوانەژۆ:** جوانەزمە.ف ☜ ئازەوانە

**جـوانیناسـی:** لـە ئیـستلاحی هونـەریدا بـەکـار

دەبرێت.واتە ناسینی جوانییەکان لە هونەر و ئەدەبدا.ف زیبایی‌شناسی

**جۆخۆر**: ناوی تیرەیەکە لە هۆزی مامەش.ف نام یک عشیرەی کرد

**جۆدان**: (+) تەقەڵی درشت و قیچەلفاچ، جۆرێ تەقەڵە لە کڵاوی دەدەن و بەن لە بەینی تەقەڵەکان هەڵدەکێشن.ف نوعی بخیە در کلاە

**جودایەز**: جیاواز، جیاکار.ف جداگانە

**جودایەزی**: جیاوازی، جیاکاری.ف متفاوت

**جۆرابێن**: گۆرەوی‌بازی، گۆرەوابازی، کاڵەمستێن.ف جوراب‌بازی

**جۆراوێن**: ☜ جورابێن

**جوربزە**: غیرەت، ورە، نەترە.ف غیرت

**جورڕە ماسی**: جۆرێک ماسی.ف نوعی ماهی

**جورە قازاخی**: جورە قازلاخی، جۆرێ چۆلەکەی کێوییە لە جورە کڵاونە گەورەترە و دەنگی زۆر خۆشە.ف چکاوک

**جورە مێرگی**: جۆرێک جورەیە لە جورە کڵاونە و جورە قازلاخی چکۆڵەترە و کڵاوی نییە.ف نوعی چکاوک

**جورەناڵ کردن**: بریتی لە فێڵ و گزەی یەکجار زۆر. *(هێندە فێڵاوییە لە مامەڵەدا جورەناڵ دەکا.)* ف کنایە از کلاهبرداری در معاملە

**جۆش**: (+) خشتی زۆر برژاوی نێو کوورەخانە، گووراسن.ف آجرجوش

**جۆشقان**: گۆرتێن، گۆرتە، جۆرێ مێشێنی بە هەڵماتی زۆر گەورە.ف نوعی تیلەبازی با تیلەی بسیار بزرگ

**جۆفا**: مەیل، مگێز، ئیشتیا.ف اشتها

**جۆڤان**: پەیمان، بەڵێن، قەرار، وەعدە.ف پیمان

**جوققە**: جوقنە، مەلێکی بۆرە لە چێشکە بچووکترە. زیاتر لەنێو قۆرغ و قۆپیدا دەژی.ف پرندەی کوچک کە در بیشە زندگی می‌کند

**جۆگەت**: ڕچە، ڕێچکەی نێو بەفر.ف راە میان برف

**جۆلین**: جاجم، مەوج، جاش، چارشێونوێن.ف جاجیم

**جومێ تەنکە**: جاڵجاڵووکە، داوەتەنە، داپیرۆشک. ف عنکبوت

**جۆمیلکە**: قاناو، جۆگە ئاوی قەراغی شەقام.ف جوی کنار خیابان

**جووت پەروانە**: جۆرێک هێلیکوپتەرە دوو پەروانەی هەیە.ف نوعی هلی‌کوپتر کە دو پروانە دارد

**جووت‌بازن**: کەلەپچە، دەستبەندی ئاسنی تاوانباران.ف دستبند زندانی

**جووتە کردن**: شوێنی کەروێشک لەسەر بەفر کە دوو جێ پێ لە پێشەوەیە و جێگا پێیەک لە دواوە.ف ردپای خرگوش روی برف کە روی هم افتادە باشد

**جووتە لە ئەستێرە دان**: ☜ لەقە لە ئاسمان دان

**جووتەی خێر و شەڕ**: بریتی لە دوو هاوڕێ کە هەمیشە پێکەوەن و بەبێ یەک هەڵناکەن.ف کنایە از دو رفیق کە همیشە با هم هستند

**جووکی**: فیسقەڵ، کەسێ کە ترسەنۆکە و لە کاتی شەڕدا دەنەڕێنێ و هاوار دەکا.ف ترسو

**جووڵەوەر**: زیندەوەر، جانەوەری ورد، جڕ. ف حشره

**جۆیەلە**: جۆگەلە، جۆگەی چکۆڵە. ف جوی کوچک

**جەبوون**: سەقیل، ڕژد، چکووس، قرنیس، چکوود، چرووک، نینۆک وشک، دەس قووچاو. ف خسیس

**جەتان**: چەقەن، ڕەقەن، تمتمان، بووره. ف زمین سنگلاخ

**جەجاڵ**: مرۆڤێکی خەیاڵییە دەڵێن لە کاتی دنیا ئاخر بووندا دێ، کەرێکی پێیە و کەرەکەی هەر تەرسەقول دەکا و خەڵکی وە دەزانن خورمایە و وەدوای دەکەون، جرجاڵ، چجاڵ. ف دجال

**جەخار**: (+) داخ، مخابن. ف افسوس

**جەخماخە لێدان**: چەغماغە دان، برووسکە. ف آذرخش

**جەڕ دان**: بەستنی ئاو بە تەوژمی سەرما. *(سایەقەیەکە وڵات جەڕی داوە.)* ف انجماد آب براثر سرمای شدید

**جەڕ لە دەم**: بریتی لە تازە و دەست لێنەدراو. ف کنایه از تازه و دستنخورده

**جەرجهە**: کارچاک، شارەزا، لێزان. ف ماهر

**جەرگ ئاوس بوون**: بریتی لە داخ لە دڵدا کۆ کردنەوە، کۆ کردنەوەی داخ و ڕق لە ناخدا (ئەو هەتیوە بەو کارانەی جەرگ ئاوسی کردووم.) ف خودخوری و حرص و جوش

**جەرگە گڕە**: تەبی زۆری جەرگ. ف التهاب جگر

**جەرگە**: (+) دەستە، تاقم. ف گروه

**جەڕمەجووڕێ**: دەمەقاڵێ، دەمقره، چەلەحانێ شەڕەچەقە. ف جدال لفظی

**جەڕە**: (+) ) چەپکە، دەستە، جەڕەچێو، زیاتر بۆ دەستە چیلکە و دار و ... دەگوترێ؛ ) تاقمێ لە خەڵک، دەستەیەک پیاو، جەڕە ئایەم. ف ) دستەچوب؛ ) گروه مردم

**جەز**: کۆی گەنمی سوور، کۆ. *(بێژی ئەم جەزە چەند تەغار بێ؟)* ف گندم برهم انباشته

**جەزیا**: ☜ جزیا

**جەغجەغە**: کۆل و بیر، چەرخ و تەنافی ئاو هەڵگوێستن لە بیر. ف چرخ آبکشی از چاه

**جەغەتاو**: ئاوی چەوری قاورمە. *(تۆزێکم لەو جەغەتاوەی بۆ تێکە.)* ف آب چرب قورمه

**جەغەتوو**: ) جەڵغە، جلغە، ئاوی نیوه سەهۆڵ؛ ) ناوی چۆمێکە لە کوردستان کە ناوچەی هەوشار و فەیزوڵڵابەگی لێک جیا کردۆتەوە. ف ) آب نیمه یخ؛ ) نام رودخانه زرینه

**جەغەتە**: ) جەغەتوو، ئاوی نیوه سەهۆڵ؛ ) خوێنی مەییو، قەتماغە، *(خوێن بە دەستییەوە جەغەتە بووە.)* ) آب نیمه یخ؛ ) خون کبره شده

**جەڤلاندن**: هەژاندن، داچڵەکاندن. *(بەو دەنگە هاتینە جەڤلاندنێ.)* ف ترساندن

**جەفلین**: سیس بوون، ژاکان، وشک بوون. ف پژمرده شدن

**جەفەنگ**: گاڵتە و شۆخی، ڕابواردن. *(بۆ دەبێ بێت و بکا مەیخانە تەنگ/ شوێنی دیکە زۆرە بۆ گاڵتە و جەفەنگ «هێمن».)* ف شوخی

**جەفەنگباز**: شۆخیباز، کەسێک کە گاڵتە و گەپی

پیخۆشە، قسەخۆش.ف شوخی‌باز

**جەفەنگ لێدان**: گاڵتە کردن، شۆخی کردن.ف شۆخی کردن

**جەڵد**: (+) چالاک، گورجوگۆڵ.ف چابک.

**جەلسە**: جەرسە، جلسە، پارچەیەکی قەدیمی بوو ژنان دەیان کردە کلۆنجە.(جەلسە کاری تارانێ/تەڕ نابێ بە بارانێ/جەلسە کاری میاندواوێ/تەڕ نابێ لە بن ئاوێ«فۆلکلۆر») ف نوعی پارچەی قدیمی

**جەمات گرتن**: کۆڕ بەستن، کۆ بوونەوە.ف تشکیل جلسە

**جەماڵە**: ناوی تیرەیەکە لە هۆزی مامەش.ف نام یک عشیرەی کرد

**جەمبوورە**: دەورە گرتن، ئاپۆرە، .ف ازدحام

**جەمجاخ**: حەشامەت، ئاپۆرە، کۆمەڵی خەڵک، جڤات.ف جمعیت مردم

**جەمخۆنە**: شوێنی کۆ بوونەوە و ڕێ و ڕەسمی ئایینی ڕێڕەوانی مەزهەبی یارسان.ف عبادتگاه پیروان اهل حق

**جەموجۆر**: ڕێک و پێک، بەجێ و لەبار.ف جمع و جور

**جەمە خوێڕیلە**: ژەمە خوێڕی، عەسرۆژە، نان و چایی خواردنی دوای بانگی عەسر.ف خوردن غذا هنگام عصر

**جەمەک**: کرێ، مزە، پێمزک.ف دستمزد

**جەنجەنەک**:نقوستان، ئیفلیج، مجرۆ.ف فلج.

**جەنگەری**: شەڕانی، شەڕاشۆ.ف جنگجو

**جەوجەوێن**: هەیجۆ هەیجۆ. تووت و فەراقەت، خازەڵێ، هەیجۆ هەیجۆیێن.ف نام یک بازی بچەها مانند قایم‌وشک

**جەور**: زەحمەت، ئازار.ف جور

**جەوگ**: جیوە، جەوی، شیلەی دار.ف انگم

**جەهەنگ**:جۆرێک کوانی گەورەیە لە لەشی ولاخ دێ.ف نوعی دمل پوستی حیوان.

**جەیران**: (+) کیسەڵ، کیسۆ، کسڵ.ف لاک‌پشت

**جیاخواز**: مەیل بە جیایی.ف جدایی طلب

**جیاخوازی**: مەیل بە جیایی کردنف جدایی طلبی

**جیاوازی کردن**: فەرق لە بەین دانان. فەرق خستن. *(ئەورا جیاوازی لە بەین کوڕەکانت کەی؟)* ف فرق نهادن

**جیاوازی**: فەرق، جودایەز. *(هیچ جیاوازییەک لە بەینیاندا نییە.)* ف تفاوت

**جێژنی بەرانان**: جێژن و شادیی کاتی بەران تێ کردن.ف جشن و سوری کە هنگام جفتگیری قوچ و گوسفند برپا می‌کنند

**جێژوان**: ژوانگە، ئەو شوێنەی دوو دڵدار یەکتری لێ دەبینن.ف میعادگاه

**جیفرک لەخۆ دان**: دەرپەڕین، هەڵبەزین و هەڵاتن.ف پریدن و فرار کردن

**جیفنە**: تەماح، چاوچنۆکی، چاونەزێری، چاو برسییەتی.ف آز و طمع

**جیک جیکە**: شیڕ شیرە، جانەوەرێکی چکۆڵەی باڵدارە وەک کوللە وایە بە گیا و گژەوە دەنیشێ و دەجیکێنێ.ف زنجرە

**جینات**: ☜ جەمجاخ

**جینگز:** جینگن.ف لجاج

**جینگنۆکـــە:** شـــەڕانـــی، جیـــنگن، شـــەڕاشـــۆ، شەڕخواز.ف لجاج

**جینۆک:** کوان، دمەڵ، زیپکەیەکی بە ژانە، قونێر. ف دمل چرکی

**جیـواز بـوون:** گۆڕان، جیَگۆڕان. *(شـوونەکـەم جیواز بووگە.)* ف عوض شدن

**جیواز کردن:** گۆڕین، جێگا گۆڕین. *(کی جیوازی مێزەگەم کرد؟)* ف عوض کردن

**جێـوان:** جێوبـان، لێفـە و دۆشـەک و سـەرینـی خەوتن، پێخەف.ف رختخواب

**جیوە تێکران:** بریتی لە هەدا نەدان و نەحەجمین لـە شـوێنێک. *(سـرەوتنـی نییـە دەڵێـی جیـوەی تێکراوە.)* ف کنایە از آرام و قرار نداشتن



**چاپانەسەرێ**: گیایەکە وەکوو کەرتەشی وایە بەڵام درووی نییە.ف نام گیاەی است

**چارشا**: داهاتوو، ئایندە.ف آینده

**چارشێوشـان**: کۆڵوانە، چـارەکـە، چارۆکـە.ف رودوشی زنانه

**چارشێونوێن**: جاش، جاجم، مەوج.ف جاجیم

**چارقەڵەمباز**: ئەسپی دەست و پێ سپی.ف اسب چهار دست و پا سفید

**چارۆخ**: کەوش، پێڵاو، سۆل، پێتاو.ف کفش

**چارێز**: چایی دان، قوتووی چایی وشک. *(چاوت چارێزی چایی/ بۆ خۆم دەتبەم بۆ شایی/ دەست و پـەنجـەی زۆر جوانـە بـۆ گـۆرەویـی میرزایـی «گۆرانی».)* ف قوطی چای

**چـاڤشـەیتـانۆک**: قـەرا قـەرا، خۆشـارکێ، ڤەشارکۆ، چاوشارکێ.ف قایموشک بازی

**چاکەکار**: کەسێک کە پیاوەتیی لەدەست دێ.ف نیکوکار

**چاڵ و بلۆق**: چاڵوچۆڵ، کەندولـەند. *(زەوییەکە چاڵ و بلۆقە.)* ف چال و چوله

**چـالاغ**: (+) دارێکـی درێـژە گـەمیـەوان لـەنگـەری گەمییەی پێ دەگرێ.ف چوب مخصوص لنگر گرفتن قایق

**چاڵوزەقێن**: کایەیەکە بە دوگمە دەکرێ وەک شێروخەت وایە.ف بازی مانند شیرو خط که با دگمه انجام می‌دهند

**چاڵـە پیرۆشـک**: قووڵکـە پیرۆشـک، قووڵکـەی پیرێژنۆکە.ف چاله خرخاکی

**چالەکە**: چوالوو، چوارلوو.ف گورکن

**چامە**: یەکێ لـە قاڵبـە شێعرییەکانـە، قەسیدە.ف قصیده

**چـاو بـە بـەفر کـەوتـن**: تاریک بـوونی چـاو لـە زسـتاندا، کـەسـێک کـە لـە دەرێ ڕا دەچێتـە ژووری لە زستاندا چاوی نابینێ، دەڵێن چاوی بە بەفر کەوتووە.ف تاریک شدن چشم براثر سفیدی برف در زمستان

**چاو بە پۆرگ**: بەر چاو هەڵمەساو، چاو ماسیو.

ف چشم آماسیده

**چاو به مۆڵەق وێستان:** ڕەنگی مردن لە ڕوو نیشتن و زەق و سپی بوونەوەی چاو لەبەر نەخۆشی. *(هەتا نەمردووم ماوم، وەرە هێزی هەناوم/ کەوتوم لە نەخۆشخانە چاو بە مۆڵەق وێستاوم «ماملێ»)*. ف باز ماندن و سفید شدن چشم براثر بیماری

**چاو پڕ بوونەوە:** خیز و خۆڵ لە چاو کەوتن، *(گێژەڵووکەیەک هات و چاوم پڕ بۆوە.)* ف افتادن خاک و شن توی چشم

**چاو داهاتن:** چاو یەشە گرتن و سوور بوونی چاو بە تیشکی خۆری هاوین. *(مەهێڵە ئەو کوڕە چکۆڵە بچێتە بەر خۆر چاوی دادێ.)* ف چشم درد براثر نور خورشید

**چاو ڕاخستن:** ڕوانین بە وردی، بە وردی چاوگێڕان. ف بەدقت دنبال چیزی گشتن

**چاو سپیلکە:** جۆرە درووییەکی سپیواشە گوڵەکەی زەردە و نێوەڕاستی گوڵەکەی سپییە. ف نام یک خار کە گل زرد دارد

**چاو سوور:** ) (+) بریتی لە پیاوکوژ، هاربوو، یاغی و لەخۆبایی. *(لەبەر توورەیی چاوی سوور بووە.)* ؛ ) کەسێک کە چاوی سوور بێ. ف ) کنایە از کسی کە یاغی شدە و ممکن است کسی را بکشد؛ ) کسی کە چشمش سرخ باشد

**چاو کونە شووژن:** چاو چکۆڵە، خووتەکە، چاو مژمۆر. ف کوچک چشم

**چاو کونە مەتە:** بریتی لە مرۆڤی چاو چکۆڵە، چاو مژمۆر. ف کوچک چشم

**چاو لە چاو هاتن:** بریتی لە نەدیتنەوە، چاو پێ نەکەوتنەوە. *(دەبڕۆ با چاوم لە چاوت بێ.)* ف دوبارە ندیدن

**چاو لەسەر هەڵنەگرتن:** چاوەدێری کردن، لەسەر قاسید بوون، ئاگاداری لێ کردن. *(خەمت نەبێ چاوی لەسەر هەڵناگرم.)* ف چهار چشمی مواظب بودن

**چاو لێ هاتن:** بریتی لە بەغیلی پێبردن. *(چاوت لێدێ توانیومە ئەو کارە بکەم؟)* ف حسادت

**چاو نووساندن:** کاری ناتەواو و دەغەڵانە. *(هەروا چاوی نووساند و دایەوە دەستی.)* ف کنایە از کار ناتمام و دغلکارانە

**چاو و ڕوو نەهێشان:** شەرم نەکردن، بێچاو و ڕوویی، ڕوو هەڵماڵدراوی *(چاو و ڕووی لە کەس ناهێشێ)* .ف کنایە از رودربایستی نداشتن

**چاوپانکە:** چاوکوتکە، ناوی گیایەکی گەڵا خڕە گوڵی زەردە بە سورەوەکراوی دەخورێ. ف نام گیاهی خوراکی

**چاوتێر:** دەوڵەمەند، بێنیاز، دژی چاوبرسی. ف بێنیاز، متضاد حریص

**چاوچوو:** بریتی لە بەخیل، چاوبرسی، بەتەماح، چاوچنۆک. ف حریص

**چاوزەقە:** چاوپانکە، چاوکوتکە، گیایەکی گەڵا پانی گوڵ زەردە وەک قازیاخە و گێلاخە دەخورێ. ف نام گیاهی خوراکی

**چاوزەقە:** ناوی یارییەکی لاوانە، هەر دوو سەری پشتێنێک بە یەکەوە گرێ دەدەن، دوو

کەس ڕووبەڕووی یەکتر دادەنیشن و پشتێنەکە لە ملیان دەکەن و بەری پێیان بە یەکەوە دەنێن، هەر کەس بە هێزتر بێ ئەوی دیکە هەڵدەستێنێ و دەیکێشێ بۆلای خۆی.ف نام یک بازی جوانان

**چاوغاین**: چاوحیز، کەسێک کە بە چاوی خەیانەت و حیزانە تەماشای ماڵ و نامووسی خەڵک دەکا.ف هیزچشم

**چاوقایم**: کەسێک کە گوێ ناداتە خەڵکی و ئەوەی پێی خۆش بێ دەیکا. *(لەبەرچاوی خەڵکی لەو کۆڵانەدا لەگەڵ کچە قسەی دەکرد هێندە چاوقایم بوو پێی وابوو کەس دیار نییە.)* ف نترس

**چاوکەسک**: گیایەکی گەڵا پانە وەک سێوەرە وایە بنجی بە زەویدا پان دەبێتەوە.ف نام گیاهی است

**چاومێل**: کلچێوک، کلچۆک، مێل، میل، کلج، میلچۆک.ف میل سرمەکشی

**چاوەجاخ**: ئاگردان، کوانوو.ف اجاق

**چاوەچرێ**: چاو لەوەڕاندن، تۆلازی.ف چشمچرانی

**چاوەڕاو**: چاوگێڕان، ڕوانین بۆ دۆزینەوەی شتێک.ف نگاه کردن برای پیدا کردن چیزی

**چاوەڵچاو**: چاوەچاو، چاوەڕوانی، چاوەچرێ.ف به هر سو نگریستن

**چاوی ڕەش کاڵ بوونەوە**: بریتی لە خەجاڵەت بوونەوە، تەریق بوونەوە و ناهومێد بوون. *(بە هیوا بووی کارەکەت بۆ بکا چاوی ڕەشت کاڵ بۆوە.)* ف کنایه از شرمنده و ناامید شدن

**چپخوز**: دەست قووچاو، چرووک، چکووس، ڕژد، قرنیس، سەقیل.ف خسیس

**چپڕ**: چڕ، لێڕەواری پڕ لە دار و دەوەن، چڕ و پڕ.ف بیشەی انبوه

**چراغ پێ**: بریتی لە تووڕە بوون و ڕق هەستان. *(بۆ خێرا چراغ پێ دەبی؟ تۆزێ تاقەتت بێ.)* ف کنایه از عصبانی شدن

**چراوگ**: چۆڵەچرا، چراوڵە، ئەختەرمە، مێڵەدە.ف مشعل

**چرپا**: قەرەوێڵە، تەختی خەو.ف تختخواب

**چرچسین**: داچڵەکین، ڕاچەنین لەبەر ترس.ف یکه خوردن

**چردۆ**: مانگایەک کە کاتی دۆشین گوانی توند دەکا و بە باشی شیرەکەی دانادا.ف گاو مادەای که به خوبی شیر نمیدهد

**چردەرپێ**: بریتی لە ژنی سارد و سڕ کە درەنگ ڕازی دەبێ. *(هێندە چردەرپێیە هەتا دەیدا دیق دەکەی.)* ف زن سردمزاج

**چرژانە**: گەرم بوونەوە لە پاش سەرمای زۆر، میلوورە کردنی پێستی لەش لەدوای گەرم بوونەوەی لەش. *(سەرما وای کار تێ کردبووم دوای ڕۆژێکێش لەشم هەر چرژانەی دەکرد.)* ف مورمور کردن پوست بدن

**چرڤ**: بڵاو، پرژ و بڵاو، شێواو. *(هەمی لاپەڕەکان چرڤ کرن.)* ف برهم زدن

**چرکەژمێر**: میلەی سانیەژمێری سەعات.ف ثانیەشمار

**چڕگـەن**: (زەویـی پـڕ گـژ و گیـا و فریـزوو کـە بـەزەحمـەت دەکێڵدرێ( شـوێنێ کـە گیـا و گژی لێکی دابێ. *(لـەو چڕگـەنـە دەرنـاچین)* .ف (زمینی که برای شخم زدن دشوار باشد(علفزار انبوه.

**چڕنـووق**: چڕنـووک، نینـۆکی تیـژی درنـدە و فڕندە.ف چنگال

**چڕنـووک گـرتن**: ڕنـین، چڕنـووک لێدان، وەک پشیلە چڕنووک دەگرێ.ف خراشیدن با ناخن

**چڕنـە و پڕنـە**: هـەرچـی و پـەرچـی، تێکـەڵ و پێکـەڵ. *(چڕنـە و پڕنـە تـێ ڕژاون.)* ف نـاچیز و بی‌ارزش

**چڕنەمـوورە**: نـاوی دێـوێکی ئـەفسانەییـە دەڵێن هەزار جاری بکوژی دڵۆپێ خوێنی بڕژێتە سەر عەرز زیندوو دەبێتـەوە.ف نام دیوی افسانه‌ای که می‌گویند اگر هزار بار کشته شود یک قطره از خونش روی زمین بریزد زنده می‌شود

**چڕۆکـۆ**: بێـشە، دارسـتان، لێـرەوار، مێـشە.ف جنگل، بیشه‌زار

**چڕووسـاوە**: (+) کرووسـاوە، ڕووت و قـووت بوونەوەی دار و گیا.ف ریختن برگ درخت

**چڕووسـکە ڕاو**: جـۆرێ ڕاوە کـەو، بـە شـەودا ئـاور دەکـەنـەوە و کاتێـک کـەوەکـان دێـن بـۆ دەوری ئاورەکە شـەوارە دەبن و دەیانگرن.ف نوعی شکار کبک

**چرەوە**: چرۆ، شکۆفەی دار.ف شکوفه

**چـرێش**: گیایـەکـە شـەش حـەوت گـەڵای بـەقـەد قامک پان دەردەکا، بستێک بڵیندە سرێشی لێ دروست دەکەن.ف گیاه سریش

**چریکە**: ژانی پەیتا پـەیتـای لـەش. *(تـاو نـا تاوێک چریکەیەک لـە پشتم هـەڵدەستێ.)* ف تیر کشیدن بدن

**چغۆ**: چەقۆ.ف چاقو

**چڤاتگە**: کۆمەڵگە.ف جامعه

**چفتەلێس**: چڵپەخۆر، کاسەلێس، زگەڕۆ، چڵێس، زگهانک.ف شکمو

**چقیر**: چەقەرە، چەکەرە. *(پیازەگە چقیر داگـە.)* ف جوانه

**چک**: چەکەرە، چەقەرە.ف جوانەی تازەی گیاه

**چکر**: نینۆخ، نینۆک، نووخان.ف ناخن

**چکرە**: منداڵ، زارۆ.ف کودک

**چکڵ لـە قنگـە**: پـووشبـەقوونـە، پـووشبـەقنگـە، زەلبەقوونە.ف سنجاقک

**چکڵ**: چقڵ، دڕوو، دڕک.ف خار

**چکنەر**: چەوەندەر، چۆنەر.ف چغندر

**چل تیکـە**: ) جـۆرێ پـادەرییـە لـە کـاموای چـەند ڕەنـگ یـان پـەڕۆی ڕەنگـاوڕەنـگ دروسـتی دەکـەن؛ ) ڕانـک و چۆخـەی پارچـەیی کـە وەک بووزو شوێن شوێن دەکرێ؛ ) هـەر شتێک لـە پەڕۆی ڕەنگاوڕەنگ و لەتوکوت دروست کرێ وەک: لێفە و پەردە و سـەرچادان و پـادەری و ... ؛ ٤) جۆرێ نارنجەک، نارنجەکی چل تیکە.ف ) پـادری درسـت شـده بـا پارچـه‌ی رنگارنـگ؛ ) لباسـی کـه ماننـد شـال تکـه‌تکـه بدوزنـد؛ ) هـر چیزی که از پارچه‌ی رنگارنگ درست کنند؛ ٤) نوعی نارنجک.

**چـڵاک**: ڕەختـاوێز، تـەختـەیـەکە قیتکە و قـولاپی

پێوەیە جل و بەرگی پێدا هەڵدەواسن.ف لباس‌گیر

**چڵپەخۆر**: بریتی لە خۆفرۆش و نۆکەری بێگانە. ف کنایە از آدم خائن و خدمتگذار بیگانە

**چڵدرۆ**: بریتی لە کەسێک کە زۆر درۆ دەکا، درۆزنی گەورە.ف دروغگو

**چلقلۆک**: بەترووسکە، تریشکدار، پرشنگدار، بە بریقە، درەوشاوە.ف درخشان

**چڵک**: (+) ماکەو، کەوێ مێ.ف کبک مادە

**چڵکبەر**: ئەو دەرمانەی چڵک و تەشەنی لەش یان برین دەڕەوێنێ.ف آنتی‌بیوتیک

**چڵکتاو**: چڵک هەڵگر، جلکی ڕەش و شین و بۆر کە چڵکیان پێوە دیاری نادا.ف چرکتاب

**چڵکن دەوڵەمەند**: دەوڵەمەندی پیسکە و ڕژد و شرەپۆش.ف ثروتمند خسیس

**چللک**: پۆڵا، ئاسنی ئاودیدە.ف فولاد

**چڵمە چڵم**: فمەفم، چڵم هەڵلووشینی زوو زوو . ف بالا کشیدن پی‌درپی خلم

**چلمێردە**: شەوژەن، چۆڵەپێچەن، داری پشت درگا بۆ قایم کردن، شەوبەن.ف چوبی کە پشت در نهند برای بستە شدن

**چلوان**: چلەکانی ساڵ، چلە گەورە و چلە چکۆڵە. *(مانگی کانوونێ بە چلوان دەرکرام/ وەک برایمۆک لەو وڵاتە ڕاونرام «هێمن».)* ف چلە

**چلۆسک**: چلووسک، چڵیسک.ف هیزم نیمە سوختە

**چلۆنک**: چڵەپۆپەی دار، ترۆپکی دار. *(سێوێک بەسەر چلۆنکی دارەکەوە مابوو.)* ف شاخەی بالایی درخت

**چلوورە**: (+) چیلکەی سەر بە ئاور، چلووسک، بزووت، سەلکەبزووت، داری نیوە سووتاو.ف چوب نیم‌سوز

**چلووگیر**: نەخۆش کەوتنی منداڵی ساوا لە تەمەنی چل ڕۆژەدا.ف مریض شدن طفل در چهل روزگی

**چڵەپاندن**: دەم تەقاندن بە دەم خواردنەوەی شتی ئاوەکییەوە. ئاو خواردنەوەی سەگ. *(دەمی لە ئاوەکە ناوە و دەیچڵەپێنێ.)* ف خوردن مایعات و صدای لب و لوچە

**چڵیتاو**: بەفر و قوڕی تێکەڵاو.ف برف و گل قاتی شدە

**چمچمەکۆڵە**: کەوچکە قوڵە، کلکەتەشی، بەچکە بۆقی لاق دەرنەهاتوو.ف بچە قورباغەی دست و پا درنیاوردە

**چنارەکەڵە**: چنارەکڵە، گیایەکە گەڵاکەی وەک چنار وایە دەیکوتنەوە و لەسەر بیرۆی دادەنێن بە تەواوی شوێنی برینەکە دەسووتێنێ و پێستی دادەماڵێ و دوایی چاک دەبێتەوە. چەپچەپی.ف اسم گیاهی دارویی

**چنجری**: خانەخانە، پارچەی دامەیی.ف پارچەی شطرنجی

**چنگ لە ئاسمان گیر کردن**: بریتی لە ڕق هەستان و تووڕە بوونی زۆر *(وا ڕقی هەستابوو چنگی لە ئاسمان گیر دەکرد)* ف کنایە از عصبانیت زیاد

**چنگانە**: درمەغ، گوڵکێش، درمغ.ف چنگک علف

جمع کردن

**چنگڕەش:** دەسڕەش، کەسێک کە خێری بەدەستەوە نییە و کەس خێری لە دەس نابینێ. ف کسی که برای مردم منفعت ندارد

**چنگڵ:** (+) خیز و بەردی بنی چاڵاو، *(بیرەکە گەیشتۆتە چنگڵ شوکور ئاوی زۆر دەبێ.)* ف شن و ریگ کف چاه

**چنگوڕک:** چڕنووک، چنجڕووک. ف پنجول

**چنگە پڕماسکێ:** ☜ چنگە پڵماسکێ

**چنگە پشیلە:** ☜ پێ پشیلە

**چنگە پەڵماسکێ:** دەستبازی و یەکتر تلاندنەوە. *(خەریکی چنگە پەڵماسکێ بوون.)* ف دست‌بازی و غلطاندن یکدیگر

**چنگە پەڵماسێ:** چنگە پەڵماسکێ، چنگاوەش، دەستبازی و یەکتر تلاندنەوە. ف دست‌بازی و غلطاندن یکدیگر

**چنگە فلیقێ:** ) فلیقاندنەوەی میوە و شتی ئاودار بە دەست؛ ) چنگە پەڵماسێ، یەکتر خرەپاندنەوەی دوو کەس بە شەڕ یان بەیاری ف (له کردن میوه و چیزهای آبدار با دست؛ ) بر زمین زدن و غلطاندن یکدیگر

**چوارمێلکە:** چوار مێردەکی، چوار مەشقی. ف چهار زانو نشستن

**چواندن:** لە کایەی گۆرەوی‌بازیدا بە ئەو گۆرەوییانە دەڵێن کە شکیان لێیان نییە پشکیلەکەی تێدا بێ و دەستی پێدا دەنێن. *(ئەو سێ گورەوییە بچێ، ئەوەش گوڵ.)* ف جورابی که در جوراب‌بازی گمان نمی‌کنند تیله در آن باشد و حذف می‌کنند

**چۆحەل:** داری هەلووکێن، دار هەلووک. ف چوب بلند الک دولک

**چۆحەلێن:** هەلووکێن. ف الک دولک

**چوخساندن:** ئەنگاوتنی مەرمەڕ لە مێشێندا بە جۆرێک کە مەرمەڕی هاوشێتراو لەجێگەی مەرمەڕی داکراو ڕاوەستێ، بریتی لە دەرکردن و جێگە گرتنەوە. ف در اصطلاح تیله‌بازی به تیله‌ای گفته می‌شود که تیله‌ی رقیب را می‌زند و جای او را می‌گیرد

**چۆخەبازەڵە:** خەزایی، عەینەمەل، مەلێکە وەک سێرووو وایە بەلام ڕەنگی بەڵەکە. ف سار ملخ‌خوار

**چوڕ:** میز، گمیز. ف ادرار

**چۆڕاڵ:** چۆرقاڵ، چۆڕکاڵ، ئاوێکی کەم. ف جرعه

**چۆرقاڵ:** چۆڕێ، نەختێ ئاوەکی. *(چۆرقاڵێ ئاوی نەداینێ.)* ف جرعه

**چۆرکاڵ:** ☜ چۆڕاڵ

**چۆڕکە:** ☜ چۆڕاڵ

**چوڕن:** میزکەر، دەڵەمیز، کەسێک کە هەمیشە میز دەکا بە خۆیا. ف شاشو

**چوڕۆ:** ☜ چوڕن

**چورەقازلاخ:** چورەگەڵوازە. ف چکاوک

**چورەگەڵوازە:** چۆرەقازلاخی، جۆرێ چۆلەکەی کێوییە. ف چکاوک

**چوزەمار:** سوجەمار، مارێکی سەرپشت سووری بن زگ سپییە. *(خۆت تووخنی مار*

*نەکەی کەم و زۆر/ مار مارە چوزە و سپی و رەش و بۆر «مەم و زین».)* ف نوعی مار

**چوسگورگ:** پیرایشۆکە، پیرۆشک، جرێکی بۆری چکۆلەیە قوولکێکی گلە نەرمە و لووس ساز دەکا و لەبن گڵەکەیدا خۆی مات دەدا، هەر جانەوەرێکی ورد وەک میرووله و خاڵخاڵۆکەی تێکەوێ ناتوانێ بێتەوە دەرێ و دەیگرێ دەیخوا. ف خرخاکی

**چۆڤان:** ناوی گیایەکە کەف دەکا و بۆ شتنی قاپ و قاچاخ کەڵکی لێ وەردەگرن. ف نام گیاهی است

**چۆکشکێنە:** جۆرێ درووی سەخت و تیژە، واتە ئەگەر بە لاقدا بچێ هێزی رۆیشتنی لێ دەبڕێ. ف نوعی خار

**چوکلێت:** شەگەلات، نوقڵ و مینوو. ف شکلات

**چۆلاو:** ئەو چیلکانەی دوای پڕ کردنی سەوەتە لە کا و وێنجە و ... لە دەورەکەی دەچەقێنن بۆئەوەی زیاتر بەرێ. *(سەوەتەکە زۆر قورس نییە چۆلاوی بۆ بکە با زیاتر بەرێ.)* ف فرو کردن چوب در سبد برای اینکە بیشتر جا بگیرد

**چۆڵەپێچ:** ) ڕاوی ئەو دەمەی کەو خەریکی هێلکە کردنە و نێرە کەو و ماکەو زۆر جار خەریکی جووتگیری دەبن و لەو کاتەدا نێرەکە نزیکەی چارەگە سەعاتێک لە شوێنێک بە دەوری ماکەودا دەخولێتەوە ڕاوچی لەو هەلە کەڵک وەردەگرێ و ڕاویان دەکا؛ ) شەوژەن، چۆڵەپێچەن، چۆڵەچەپێن، دارێکە شەوانە دەیخەنە پشت درگا بۆ گاڵەدان؛ ) تووڵەپێچ، دەرهێنانی کەروێشک و ڕێوی لە کون بە دارێکی سەردووهاچە کە دەیکەن بە کونەکەدا و نووکی دووسەری دارەکە لە پێستی کەروێشکەکە هەڵدەچەقێنن و بایدەدەن و دەیهێننە دەرێ؛ ٤) شەتەک دانی بار و شەغرە لەسەر پشتی یەکسم و توند کردنی بە دارێکی چکۆلە، جەڕەبابەدان، واتە دارەکە لە بەینی گوریسەکە دەخەن و بایدەدەن هەتا بارەکە بە تەواوی توند دەبێ. ف ) شکار کبک هنگام جفتگیری؛ ) بستن در خانە با چوبی بلند کە بە پشتش می‌اندازند؛ ) بیرون آوردن خرگوش و روباه از سوراخ با چوب؛ ٤) محکم کردن بار با چوبی کوتاه

**چۆڵەپێچەن:** ☜ چلمێردە

**چۆلەکە سەیدانە:** جۆرێ چۆلەکەیە. ف نام پرندەای است

**چۆلەکەمشکە:** جۆرێک چۆلەکەی زۆر چکۆلە و بۆرە لەنێو لقوپۆپی داراندا دەژی. ف گنجشکی کوچک کە در میان بیشە زندگی می‌کند

**چۆڵەوانی:** چۆڵی، چۆڵگە، بێئاوەدانی. ف بیابان

**چۆلی:** (+) ژیشک، ژیژۆ، ژیژی، ژژوو. ف جوجەتیغی

**چۆلی:** چکۆڵە، چووکە، بچووک. ف کوچک

**چۆماو:** چۆمەڵ، چۆمی کەم ئاو. ف نهر

**چۆمەڵ:** چۆمی چکۆلە و کەم ئاو. *(شاهۆ ڕێخنە دەگەڕێ وا لە دەراوی چۆمەڵ/ دینی، دینی گوڵە ئەو بولبولی دڵ پڕ لە ئەوین «هێمن».)* ف

ڕودخانەی کوچک

**چووچەڵەزڕێ**: ناوی یارییەکە.ف نام یک بازی

**چووکڵـەقنگـە**: (+) نـوقڵی دەسـک دار، نـوقڵی ئەلاسکە.ف آبنبات چوبی

**چوونـە حاشـا**: حاشـا کـردن، دەسـت لـە شـوو بەردانی ژن بۆ پیاوێکیتر.ف جدا شدن زن از شوهر و رفتن به خانەی مردی دیگر

**چوونە سەر بەڕە**: بریتی لـە چوونـە خوازبێنی. *(چـەنـدجار چووینـە سـەر بـەڕەکـەی کچـەکـەی نەدراینێ.)* ف کنایه از خواستگاری رفتن

**چووە**: مووی تـازە ڕواوی سـەر و ڕوخساری گەنج. *(تـازە پشت لێوی چووەی لـێ هـاتووە.)* ف موی تازه روییدەی رخسار جوانان

**چوێر**: (+) گیایەکی کێوییە وەک ڕازیانـە لـەنێو بەفردا دەڕوێ و بونێکی خۆشی هـەیە .ف نام گیاهی است

**چوێلـەکـە**: چۆلـەکـە، سـواندووکە، پاسـاری، مەلووچک ف گنجشک

**چەپارە**: غیرەت، ورە، *(چەپارەم نەما درێژە بەو ڕێگایە بدەم.)* ف غیرت

**چەپچەپی**: چنارەکەلە، گیایەکە لـە مێرگان شین دەبێ لاسقی هلۆلە و گوڵێکی زەرد دەردەکا.ف نام گیاهی

**چەپرەک**: کۆن، لە کار کەوتوو.ف قرازه

**چەپڵەک**: چەپرەک.ف قرازه

**چەپنگ**: گێل، گەمشۆ، گەلحۆ، خول.ف ابله

**چـەپـۆق**: دەسـکە قـەنـە، لوولـەی سـەبیلـە.ف دستەی پیپ

**چـەپۆکـە سـەر**: ژێر چـەپۆکـە، دەسـت بـەسـەر، بندەست.ف تحت سلطه

**چەپۆکە سەری**: ژێر چەپۆکەیی، چەوسانەوە.ف تحت سلطه بودن

**چەپۆڵە دادان**: هەڵتووتەکانی ڕێوی و گـەمـاڵ و ....ف چمباته نشستن سگ و روباه و ...

**چەپووک**: چەپۆک، چەپەڵۆک.ف توسری

**چەپەترووک**: گیایەکە لەنێو گەنمدا دەڕوێ وەک برویش وایە.ف گیاهی بلغور مانند

**چەپەلووش**: هەڵمەقووت، لووش کردن.ف قورت دادن

**چــەتــەوڵ**: پاســەوان، کێـشکچی، قــەرەوڵ.ف پاسبان

**چــەخــس**: ڕادە بــۆ لێــدان، چــین، چــەســپ، *(چەخسێکی چاکی کوتـا.)* ف اندازه بـرای کتک زدن

**چەخماخ سارم**: جـورێ تفەنگی قـەدیمی بـوو.( سـەردەمێکی ڕاوچـی بـووم دەگـەڕامـەوە لـە ڕاوێ/ ڕاوی خۆم داویشتەوە سەری قەپەکیان بنـەبنـی مـام خـاڵێ/ هـەڵمـدەسـتاندوە کـارێ کارمـامزێ دڵـم نـەدەهـات بـە شـینکی چـەخمـاخ سـارمی پێوەنێم، دەمداوە بـەر هـەلات هـەلاتی سـواران خـڕەی ئـاوزەنگیـان / دامـدەگێڕاوە بـۆ بەر دەغڵ و دانەکەی پیرە خاڵوانێ. «فۆلکلۆر») .ف نوعی تفنگ قدیمی.

**چەدان**: (+) شـوێنی کۆ کردنـەوە و لـەتـەرەدانـی تووتن.ف محل جمعآوری توتون

**چــەرخــە**: (+) واشــە، باشـوو، ســەقـر، مــەلێکـی

ڕاوکەرە.ف قرقی

**چەرداوەڕوو:** ) چارداوەڕوو، مەڵبەندێکە لە کوردستان؛ ) بریتی لە مرۆی بێشەرم و حەیا. ف ) چرداول، منطقەای در کردستان؛ ) کنایە از آدم بیشرم

**چەرمپیس:** بریتی لە ڕژد و سەقیل و گوونەکەر، چرووک و مستقووچاو.ف کنایە از آدم ناخنخشک و خسیس

**چەرمی ئاوەسوو:** ) چەرمی ئاوەسوو چەرمێکە لە چەرمی دیکە قایمتر و باشترە و بۆ کاڵە و پێتاو زیاتر بەرگە دەگرێ؛ ) بریتی لە کەسێک کە عەیبەی پێ عەیب نییە و زۆر ڕوو هەڵماڵدراوە.( بریتی لە مرۆی خاوەن ئەزموون و سەختی دیتوو، *(هێندە گەڕاوە بۆتە چەرمی ئاوەسوو.)* .ف ) چرمی محکم و بادوام؛ ) کنایە از کسی کە بسیار رودار و بیشرم است( کنایە از آدم سختی دیدە و باتجربە.

**چەرەخۆرە:** (+) بریتی لە مرۆی زۆرخۆر و زگزل، کەسێک کە تێر خواردنی نییە.ف کنایە از آدم شکمو.

**چەرێ:** برینگ، مقەستی خوری هەڵپاچین.ف دوکارد، قیچی پشم چینی.

**چەژگە:** چێژگە، چەشکە، چێژ کردن، چێشتن.ف چشیدن

**چەژگە کردن:** چێشتن، چەشکە کردن.ف چشیدن

**چەسپ لێدان:** ڕێزی نیزامی، سڵاوی سەرباز لە فەرماندەرەکەی. *(سەرگەورەکەی دی چەسپێکی بۆ لێدا.)* ف احترام نظامی

**چەسپ:** (+) ڕادە بۆ لێدان، چەخس، چین. *(دەبێ چەسپێکت بکوتم)* ف اندازە برای کتک زدن

**چەعڤنەبار:** چاونەزێر، چاوچنۆک، چاونەبار، چاوبرسی، چاوچوو.ف حریص

**چەغماغە دان:** چەخماخە دان.ف آذرخش

**چەفتی:** حازرجواب، وریا و بە دەموودوو، کەسێک کە بۆ وەڵام دانامێنێ.ف کسی کە برای جواب دادن درنمیماند

**چەڤەر:** ناوی دارێکی نێو قۆپی و قەراغ رووبارە.ف نام درختی است

**چەڤەنگ:** ئاڵا، بەیداخ، دروشم.ف علم

**چەڤین:** سەرچاوەی کانی، چەمە.ف چشمە

**چەق و نیڕە:** هەرا و کێشە، زەنا زەنا، گاڵۆبوغر.ف سروصدا هنگام جدال

**چەقبەستن:** جێ کەوتن، شتێک کە بە یەکجاری دەبێتە باو، شکڵ و شێوە گرتن و نەگۆڕان.ف جا افتادن

**چەقچەقۆک:** چەقەنە، چەقچەک، ئامرازێکە لە ئاشدا.ف وسیلەای در آسیاب آبی

**چەقچەقە:** مەکینەی خەیاتییە دەزووی پێوە دەکرێ و هەڵبەز دابەز دەکا.ف شیطانک

**چەقرۆزە:** ناوی گوڵێکە.ف نام گلی است

**چەقرە:** گا و کەڵ و گامێشی نێوچاوان سپی، بەش، قەشان قەشقە، ف حیوان پیشانی سفید

**چەققەلۆ:** چەقەش، جۆرێ شنگی شاخییە چەققەی لێدەگرن، گەڵاکەی وەک لۆ وایە.ف اسم گیاهی است

**چەقولوور**: ) سەگوەڕ و لووره لووری زۆری سەگەل. *(سەگەل لە دەوری ماڵان چەقولوورینە.)* ؛ ) بریتی لە نەڕەنەڕ و هەڵڵاوبگری زۆر. *(ئەرێ تاوێ بێ دەنگ بن ئەو چەقولوورەتان لە چییە؟)* ف ) صدای پارس و زوزەی چند سگ با هم؛ ) کنایە از سروصدای زیاد.

**چەقەدووکەڵ**:چەڕەدووکەڵ، چەڕەچەمان ف دود غلیظ

**چەقەسرۆ**: چەقاوەسوو، زۆربلێ، چەنەوەر، دەمەوەر. ف پرگو

**چەقەش**: گیایەکە وەکوو گیا کولکنە وایە بنەکەی دەبڕن و چەقەی لێ دەگرن. ف نام گیاهی

**چەقەلۆ**: گیایەکە وەکوو لۆ وایە ساقەتەکەی زەردە، ماڵات نایخوا. ف نام گیاهی است

**چەقەنە**: دارێکە لەسەر بەردی سەرەوەی ئاشی ئاوی لەنگەر دەگرێ و هەڵبەز دابەز دەکاو دەبێتە هۆی دارژانی دانەکە. ف وسیلەای در آسیاب آبی.

**چەقی ڕەش کردن**: بریتی لە زۆر هەوڵ دان، ئەختوچار کردن. *(چەقی ڕەشم کرد لەگەڵم نەهات.)* ف کنایە از کوشش کردن زیاد.

**چەکچەکوولە**: چەکچەکیلە، شەمشەمەکوێرە، پارچک ف خفاش

**چەکچەکی**: (+) قۆچەقانی، قەڵماسک، بەردەقانی، کەهنیک. ف فلاخن

**چەکچەکیلە**: ) چەقچەقە، گیایەکە؛ ) بریتی لە ملی زۆر باریک، ملی دەڵێی چەکچەکیلەیە. ف ) کاسنی؛ ) کنایە از گردن باریک و لاغر.

**چەکمە سوورە**: باڵدارێکی لاق درێژ و سوورە لە کەنار چۆم دەژی. ف نام پرندەای

**چەکمەجە**: داخڵەی مێز، خوانچەی مێز. ف کشو میز

**چەکمەڕەش**: گیایەکی کوێستانییە چڵەچڵە دەڕوێ گەڵاکەی وەک چنوور وایە و لاسقی وەک کەما دەچێ، ڕەنگی لاسقەکەی مەیلەو ڕەشە. ف نام گیاهی است

**چەکوچۆڵ**:تفەنگ و کەرەسەی شەڕ، چەک و تەقەمەنی. ف سلاح و وسایل جنگ.

**چەکە**: بەستە پووڵ، بەستەی پارە. *(چەکەیەک هەزار تمەنیی شینی لە گیرفانیدا بوو.)* ف *بستەپول.*

**چەکەخاڵانە**: دابێکی کۆنە لەنێو هۆز و عەشیرەتەکاندا باو بوو کاتی ژن خواستن دەبوو دیارییەک وەک ئەسپ یان چەک بدەن بە خاڵی بووک بۆئەوەی ڕازی بێ. ف رسمی کهنە میان عشیرتها کە هنگام خواستگاری از یک دختر باید یک اسب یا تفنگ بە دایی عروس می‌دادند کە راضی شود

**چەکەرە لێ کردن**: بریتی لە سڵ لێ کردن و مەترسی لە کارێک. *(چەکەرە لە هیچ کارێک ناکا.)* ف پرهیز کردن از کاری

**چەلەبان**: ) چەلەوان، هاروهاج، شەیتان؛ ) تەنافباز، کەسێک کە بەسەر تەنافدا دەڕوا. ف ) ناآرام و بازیگوش؛ ) طناب‌باز

**چەلەحانێ**: دەم بە دەمە، : شەڕەدەندووکە،

دەمقڕە، شەڕە قسە.ف جدال لفظی.

**چەڵەگە:** (چەڵاگ، داری درێژی مێوە تەکاندن. (دارێکی درێژە لە نێوەڕاستی خەرمان دەیچەقێنن.ف ( چوبی که در وسط خرمن قرار می‌هند(چوب بلندمیوه چینی.

**چەلینگ:** گۆچان، وەکاز.ف عصا

**چەماوەسوو:** بەردی لووسی چۆم کە ئاو سوویەتەوە، ئاوەسوو.ف سنگ صاف شدەی رودخانه

**چەمچارکی:** ☜ چیەمچارکی

**چەمچڤین:** چاوپەڕین، پیلوولەرینی بێئیختیار. ف لرزش پلک

**چەمرە:** بنتا، وەچی شلک و نەرمی دارەبی، کە دوای بڕین هەڵدەداتەوە.ف جوانەی نرم و تر درخت که بعد از بریدن شاخه می‌روید.

**چەمرە:** چەمیلە، ترۆزی.ف چنبر خیار

**چەمک:** (+) سووچ، گۆشە. *(بەڵام کاتێ کە با چەمکی عەباکەی لادەدا تاوێ/ دەڕێژێ پووزی نایابی لە سیحری خوایی لافاوێ «هەردی».)* ف گوشه

**چەمەرچۆپی:** هەڵپەڕین و گۆرانیی خەماوی لە دەوری مردوو، چەمەری.ف مرثیە و نوحەخوانی برای مردە.

**چەمەرگە:** شیوەنگا، جێگای شین و زاری.ف شیونگاه.

**چەمەرگێڕ:** شینگێڕ، عازیەتبار، تازیەبار.ف عزادار

**چەمەڕێ:** چەمەڕا، چاوەڕێ، چاوەڕوان.ف چشم بەراه

**چەمەڵۆکە:** چەپۆک.ف توسری

**چەمیاگ:** چەماوە، خواربوو.ف خمیده

**چەناکە:** چەناگە، چەنە، ئارچەن.ف چانه

**چەناگە:** چەنە، چەناگە، ئارچەن.ف چانه

**چەناگە درێژ:** ☜ چەناگە شکاو

**چەناگە شکاو:** چەناگە درێژ، بریتی لە زۆربلێ، چەنەوەر.ف وراج

**چەنەبەچەنە وێستان:** دمبەدمە کردن و جوابەجەنگی، ( گەورە و چکۆڵە نازانێ چەنەبەچەنەی باوکیشی دەوێستێ.) ف جدال لفظی.

**چەنەبەری کردن:** جوابە جەنگی کردن، شەڕە قسە کردن.ف جدال لفظی

**چەنەبەرنەهاتن:** دەرەقەت نەهاتن، کەسێک کە زۆر دەم پیس و بێ حەیایە وقسەی لەگەل نایە. ف کسی کە بسیار دهن کج است و نمیتوان حریفش شد.

**چەنەوێرغە:** چەنەوەر، هەڵەوەڕ، دەمەوەر، چەقەسرۆف وراج

**چەوان:** گیایەکە وەک قومام وایە بۆ باقەبێن دەبێ.ف نام گیاهی است

**چەوبازە:** چاوبازە، چاوپانکە، چاوکوتکە.ف نام گیاهی خوراکی

**چەوبەس:** چاوبەست، چاوبەند، دەستبڕ، فێڵباز، خاپینۆک.ف حیلەگر

**چەوبەن:** چەوبەس.ف حیلەگر

**چەوپیس:** چاوپیس، چاڤینۆک.ف شورچشم

**چەوچە**: نەزیلە، مەتەڵۆکە، مەتەڵ.ف معما، چیستان

**چەورینە**: ناوی گیایەکە دەخوری، چەورۆکە، چەورچەورۆکە.ف اسم گیاهی خوراکی

**چەوماخ**: چەخماخ، چەخماخی تفەنگ.ف گلنگدن تفنگ

**چەوەندەر بە ترش**: چێشتێکە لە چەوەندەر و سماق ساز دەکری.ف غذای چغندر و سماق

**چەوەندەرە کێویلە**: جۆرێک گیا دۆکولیوە وەک گەڵاچەوەندەر وایە.ف نام گیاهی است شبیه برگ چغندر برای آش دوغ.

**چەوەنوور**: چاوەنۆڕ، چاوەڕێ، چاوەڕوان.ف چشمبەراه

**چەوین**: ناوی گیایەکی بۆن خۆشە.ف نام گیاهی خوشبو

**چیالیک**: شلیک، تووفەرەنگی.ف توت‌فرنگی

**چیاو**: چیاگ، ئاوی سارد، ئاوی چیاو.ف خنک

**چیتاڵ**: چێوشەق، شەقە، دارشەق.ف چوب پا

**چیچگ**: چیکڵ، جیکڵ، جیقڵ.ف چینەی هضم نشده در سنگلاخ مرغ

**چیچگدان**: جیکڵدان، جیقڵدان. *(چەنی بی چیچکدانی.)* ف سنگدان

**چیچیلە**: چیچڵە، بەلگی گوێ، شلکەی گوێ، بەڵگ.ف نرمەی گوش

**چیرتۆق**: ڕیپۆق، چڵکی چاو.ف ژفک

**چێرگ**: (+) برینگ، مقەستی مەڕ برینە.ف دوکارد.

**چێرە**: چەرێ، برینگ، مقەستی خوری هەڵپاچین.ف دوکارد

**چیق**: ترس، خۆف. *(تۆ چیقچەتە ناوێری تەکمانا بێی؟)* ف ترس، یارا

**چیق چوون**: زاور چوون، زۆر ترسان، زیلک ڕژان، بریتی لە زۆر ترسان و تۆقین.ف بسیار ترسیدن، زهرەترک شدن

**چێکرۆک**: دروست کراو، داتاشراو، چێکراو.ف درست شده

**چێکولانە**: چوکلێت، شەگەڵات، نوقڵ و مینوو.ف شکلات

**چێڵک**: (چڵک، ماکەو، ژەرەژی مێ. (دەرزیی گەورە، تەبەنە. .ف (کبک مادە ) سوزن بزرگ

**چێم**: چاو، چیەم، چەعڤ.ف چشم

**چین**: ) تاقم، بەشێک لە کۆمەڵ، چینی کرێکار، چینی بازاڕی و ...؛ ) چەخس. ڕادە بۆ لێدان. *(دەبێ چینێکت بکوتم.)* ف) قسمتی از اجتماع؛ ) اندازه برای کتک زدن

**چێنک**: ناوکی میوە. *(ئەو خورمایەی تۆ خواردووتە من کایەم بە چێنکەکەی کردووە.)* ف هستەی میوە

**چێو لە تاریکی کوتان**: لەخۆڕایی قسە کردن و لانی کەسێک گرتن. *(تۆ خۆ خەبەری هیچت نییە لەخۆرا چێو لە تاریکی مەکوتە.)* ف بدون آگاهی داوری کردن

**چێوار**: چۆدار، چێودار، کەسێک کە مەڕ و ماڵات دەکرێ و دەفرۆشێ. *(خاڵی نێو سینەی کەوتەسە قەتار/ ئەیژی پەزێکە تێ لەدوای چێوار «فۆلکلۆر».)* ف چوبدار

**چێوپاساری**: گوێسوانە، سواندان، گوێسەبانە، داری ڕەت بووی لێواری سەربان. ف چوب بیرون آمدەی لبەی بام

**چێوەچزە دان**: جەزرەبە دان، ئازار دان. ف اذیت کردن

**چێوەخرتە دان**: دواندن، سەر خستنە سەر کەسێک بۆئەوەی قسە بکا، *(هەرچی چێوەخرتەمان دا قسەیەکی نەکرد.)* ف سربەسر کسی گذاشتن برای اینکه به حرف بیاید.

**چیەرگ**: برینگ، مقەستی مەڕ بڕینەوە. ف دوکارد

**چیەم**: چەم، چاو، چەعڤ، چاڤ. ف چشم

**چیەمچارکی**: چاوەچڕێ، چاولەوەڕێنی، تۆلازی. ف چشمچرانی.

**چیەم دەژین**: چاو یەشە، نەخۆشیی چاو. ف چشم درد.

**چییەتی**: ئەسڵ و ڕیشەی شتێک. ف ماهیت



**حاپوولــک**: دەرفــەت، نــۆرە، نۆبــە لــە کایــەدا. *(حاپوولکی تۆیە کایەت بکە.)* ف نوبت در بازی

**حاتە**: گەمارۆ، ئابلۆقە، دەورەدان. ف محاصره

**حـاجیلۆکـە**: گیایـەکـە گـوڵی زەردە کاتێک پیـر دەبێ نێو گوڵەکەی شتێکی وەک لۆکە دەردەکا. ف نام گیاهی است

**حازر بەدەست**: ئامادە و لـەبـەر دەسـتدا، شـتێک کە لەبەر دەستدا بێ و بۆی مـەحتـەل نـەبی. ف در دسترس

**حاست**: حاند، حەنا، ئاست، شوێن، هەندەر. *(لەو حاستە دانیشە.)* ف مکان، جا

**حاسێ**: ) عاسێ، وەڕەز، جاڕز؛ ) ناوە بۆ ژنـان. ف ) عاصی؛ ) نام زنانه

**حاشــاحازری**: دوور بــێ لــە ڕووی حــازران. *(حاشاحازری دەڵێی کـەرە دەلـەوەڕێ.)* ف دور از روی حضار

**حاشار**: ☜ ئاشار

**حالۆری**: بەران و نێرییەک کە لە کاتی وەبـەران و وەتەگە هاتنی مەڕ و بزندا لـەنێو مێگـەلێکـەوە دەچێتـە نێـو مێگـەلێکی تـر؛ ) بریتـی لـە پیـاوی تـۆلاز و بـەڕەڵـڵا. ف ) قـوچی کـە از گلـەای بـە گلەی دیگر میورد هنگام جفتگیری؛ ) مردی که هیز و لاابالی و بیکاره است

**حــاوێن**: ڕاهێنــەر، کــەســێک کــە دەبێتــە هــۆی حەوانەوەی کەسانێکی دیکە. ف پرورشدهنده

**حـدوود**: مــەرز، کــەوشــەن، سـنوور، تخـووب، تخووم، سەرحەد. ف مرز

**حسری**: توونی، تینوو. ف تشنه

**حللیر**: باڵدارێکە لە لـەقلـەق چووکەترە، لاق و دەنــووکی قوڵــەتــرە و ڕەنگــی بــۆرە. ف نــام پرندەای شبیه لکلک

**حمێز**: ئامێز، باوەش. ف بغل

**حــودوود**: ) حــدوود، سـنوور؛ ) نــوعی اســب اصیل. ف ) مرز؛ ) نوعی اسب

**حورمــەت گــرتن**: ڕێـز گـرتن، قـەدر گـرتن. ف احترام گذاشتن

**حورمەتدار**: بەڕێز، بەقەدر. ف محترم

**حوسکە**: ناوی جۆرێ تفەنگی قـەدیمی بـوو. ف نام یک تفنگ قدیمی

**حۆقەباز**: فێڵەباز، گزەون، ف حقەباز، مکار

**حوکم کردن**: پەڵپ گرتن، پێ چەقاندن. *(حوکمی کردووە دەڵێ هـەر دەمهەوێ.)* ف دستور، حوکم

کردن

**حوکمات**: دەوڵەت، حوکوومەت.[ف] حکومت

**حولووربا**: کونەبا، خەفەنگ، کونی دیوار و سەربان بۆ هەواکێش. *(حولووربایە/ رووی لە خوایە (کولاوکە) «مەتەڵ».)* [ف] هواکش

**حەپوولک کێشانەوە**: لە کایەی مێشێندا ئەگەر هەڵمات لە لاقی کەسێک بدرێ سەرلەنوێ دەیهاونەوە و دەڵێن حەپوولک دەکێشێتەوە.[ف] اصطلاحی در تیله‌بازی

**حەپوولک**: دووپات کردنەوەی کایە. *(دەست پێبکەوە حەپوولکی تویە.)* [ف] دوباره بازی کردن

**حەپەحۆل**: حەپۆل. گەمژە، گەلحۆ، خول، هەپلەگون.[ف] ابله

**حەپەمێشخۆر**: بریتی لە مرۆڤی گەلحۆ و گێژ و وێژ، خول و حۆل.[ف] کنایه از آدم ساده‌لوح و گیج

**حەپەنۆت**: حەپەنتی، زەبەلاح، تەژەی پان و پۆڕ، حەیتە.[ف] لندهور

**حەپەنووس**: ) بەردێکی ڕەشی بە نرخە؛ ) بریتی لە زۆر ڕەش.[ف] ) آبنوس؛ ) کنایه از بسیار سیاه

**حەتحەتۆک**: گەڵوازە، ئەو مووروو و لەیستۆکەی بە لانکەوە هەڵیدەواسن بۆئەوەی منداڵەکە پێی ژیر بێ.[ف] اسباب‌بازی که به گهواره آویزان می‌کنند

**حەجمان**: حەجمین، ئۆقرە، تاقەت. *(لە تاوی سەرم حەجمانم نییە.)* [ف] آرام و قرار

**حەجمەت**: حەژمەت، حەیبەت. *(لە حەجمەتان وەختە بوو شێت بم.)* [ف] افسوس

**حەجمین**: حەجمان، داسەکنین. *(کوانێ ئەو شەوگارە بێدەنگەی لە ژوانگەی جێ هەوار/ کچ ڕەوەک بوو، من گوتم: هێدی بە! حەجمینم دەوێ «هێمن».)* [ف] آرام و قرار

**حەدوسەد**: هەڕەت، جنگە، کات. *(حەدوسەدی ئەوەیە بێتەوە.)* [ف] موسم

**حەرام کردن**: خەسار کردن، لە حەرام گێڕان.[ف] هدر دادن

**حەڕی ئاو**: قوڕاو، لیتەزیلاقە، چڵپاو.[ف] گل آبکی

**حەزرەت**: ) تاسە، ئارەزوو؛ ) بە پیاوی گەورە دەڵێن، حەزرەتی عیسا، حەزرەتی...[ف] ) اشتیاق ) حضرت

**حەزرەتمەن**: تاسەمەند، تاسەبار، تامەزرۆ.[ف] مشتاق

**حەزەنگ**: خەم، خەفەت، کەسەر.[ف] غم، اندوه

**حەژبەت**: حەژمەت.[ف] غصه.

**حەژمەت**: (+) حەجمەت.[ف] غصه.

**حەسەنئاوا**: دوو گوندی ناوچەی فەیزوڵڵابەگی بۆکان بوون کەوتنە بەر سەدی کورش کەبیر.[ف] دو روستای منطقه فیض‌الله‌بگی بوکان زیر سد کورش کبیر رفتند

**حەفار**: (+) هەڵم، بوغ، هوڵم.[ف] بخار

**حەفت تۆخە**: پیفۆک، کیفۆک، فیشۆک، پیشۆک.[ف] گیاهی با پیازه‌ی خوردنی

**حەگاڵ**: لەچکە، سەرپۆشی ژنان.[ف] روسری

**حەل**: (+) هەلووک.[ف] چوب کوتاه الک دولک

**حەڵاڵ و حازر**: شتی لەبەرچاو و بێتاریف لێ

کردن. *(حەڵاڵ و حازر ئەوە شتەکەیە.)* ف حی و حاضر

**حەلاوحەلاو:** هان دانی سەگ بۆسەر گورگ، تێبەردانی سەگ لە گورگ و دڕندە، حەلەلە. ف تحریک کردن سگ برای راندن گرگ

**حەللوو:** هەلووکێن، چۆحەلین. ف الکدولک

**حەلمەت:** هەڵمەت، هێرش، هۆمەن، ئیرشت. ف یورش

**حەلەمقەلەم:** ئەدا و ئەتوار، کار و قسەی تەشەراوی. ف رفتار و ادای تشرآمیز

**حەلەوێن:** مێشێن، کەلائین. ف تیلەبازی

**حەمباز:** قەڵەمباز، خۆ هەڵدان و بەرز بوونەوە لەسەر زەوی. ف پرش

**حەمرین:** ناوی زنجیرە چیایەکە لە باشووری شاری کەرکووک کە ئەم زنجیرە چیایە بە سنووری کوردستانی باشوور دادنرێ. ف نام کوهی در جنوب شهر کرکوک که مرز جنوب کردستان است.

**حەمزەڵێن:** حەمزەل، یارییەکە دەستەیەک دادەنەوێنەوە و دەستەیەکیتر بە سەریاندا باز دەدەن. ف نام یک بازی

**حەوابڕ:** وە حەوا کەوتوو، لە زەوی جیا بۆوە. ف معلق در هوا

**حەواتیلکە:** بەستنی پەتێک بە بەردێکی چکۆڵەی درێژۆکەوە و هەڵدانی بەرەو حەوا. ف بستن نخ به سنگی باریک و پرتاب کردن به طرف بالا

**حەوت ترینگە:** چێشتێکی کوردەوارییە حەوت شتی تێدەکرێ، شەلەم، نۆک، مێوژ، گۆشت، چەوەندەر، برویش، رۆن. ف یک نوع آش محلی که با شلغم ونخود و کشمش و گوشت و چغندر و بلغور و روغن می پزند.

**حەوتاو کردن:** گڵاو کردن، شتنەوەی جێ دەمی سەگ بە قوڕاو و ئاوی خاوێن، واتە حەوت جار ئاوی پێدا دەکەن

**حەوتگرێ:** گیایەکی وردە زۆر بەرز نابێتەوە جومگە جومگەیە. ف نام گیاهی

**حەوتوێلکە:** جۆرە کوانێکی بە ژانە لە جەستە دێ و تا حەوت توێخ فڕی نەدا دەرکی نابێ. ف نوعی دمل

**حەوتەوانان:** حەوبرالە، حەوتەوانە. ف هفت برادران

**حەوجۆشی:** جۆرێ کوولەکەیە وەک کوولەکە سەراوی وایە. ف نوعی کدو

**حەوجێ:** حەوجە، پێویست، حەوج. *(خەوجێی بەخێراتن نییە.)* ف نیاز

**حەودەم:** بریتی لە مرۆڤی چەنەوەر و بێحەیا، دەم چەپڵە. *(حەودەمێکە لەوانەیە پیاو بخوا.)* ف وراج

**حەول و دەول:** هەوڵ و تێکۆشان. *(لە حەول و دەولی ئەوەدا بووم کارێکی بۆ بدۆزمەوە.)* ف تلاش و کوشش

**حەیابەخۆ:** بەحەیا، بەئەدەب. ف باادب

**حەیات لێ برین:** کوشتن، سارد کردنەوە، لەنێو بردن. ف کشتن

**حەیادار:** بەحەیا، شەرمن، بە شەرم، فەدیۆک. ف شرمو

**حەیس‌وبەیس**: لەسەر قسە ڕۆیشتن، شەرەقسە. *(ئەو حەیس و بەیسەی ناوێ خەتای هەر دووکیانە.)* .ف بحث و جدل

**حەیلانکێ**: جۆلانێ، دنگلاف، هەلۆرتک، دیلانێ. ف تاب

**حیزەفێڵ**: فێڵ و گزی کردنی ترسەنۆکانە و خوێڕییانە.ف کلک زدن بزدلانە

**حیزەڵە**: حیزەڵ، ترسەنۆک، بێ‌غیرەت.ف ترسو، بزدل

**حیلاندن**: حیلە، دەنگی ئەسپ، کۆڕژن. *(ئەسپەکە حیلاندی.)* ف شیهە اسب



**خاپینۆک**: گەوج، حۆل، گەمژە، هەقمەق، گەلحۆ، گەمشۆ.ف ابله

**خاتر گەرد گرتن**: زیز بوون، رەنجان، تۆران. *(ناوێری بڵێی کشەمەمرە، خاتری گەرد دەگری.)* ف رنجیدن، دلگیر شدن

**خاتردار**: بەڕێز، بە حورمەت.ف محترم

**خاتوو زەمهەریر**: پیرێژنی ئەفسانەیی کە دەڵێن خوشکی چلەگەورە و چلەچکۆڵەیە و دوای نەمانی چلەکان شین دەگێڕێ و باران و بەفر دەبارێنێ، دە ڕۆژ بەر لە نەورۆز.ف زمهریر

**خاتوون سێمانکە**: پەپووسلێمانکە، شانەسەرە. ف هدهد

**خاجە نشین**: خواجە نشین، سەکۆی بەر درگای ماڵ بۆ دانیشتن.ف سکوی جلوی خانە

**خاچپەرست**: ئەرمەنی، عیسایی، پێڕەوی دینی حەزرەتی عیسا.ف مسیحی

**خادان**: هێلکەدان، تۆمەدان.ف تخمدان

**خارچک تەقیلە**: کارگ، جۆرێ قارچکە وەک کڵاو دەچێ.ف نوعی قارچ شبیە کلاە

**خارچک جووینە**: جۆرێ کارگە لەنێو جارە جۆدا هەڵدەتۆقێ.ف نوعی قارچ

**خارچک سەگانە**: کارگە گولانە، قارچکە گولانە. ف نوعی قارچ سمی

**خارچک گەنمینە**: جۆرێ کارگە لەنێو گەنم جاڕدا هەڵدەتۆقێ.ف نوعی قارچ

**خازیک**: داخ، مخابن، حەسرەت.ف افسوس

**خاسەخۆر**: خۆشخۆراک، تایبەتیخۆر.ف خوشخوراک

**خاسەسی**: سیخاسە، قازی دەشتی.ف غاز خاکستری

**خاسەکەش**: زەوییەک کە باش ئاو درابێ و جێگای وشکانی نەمابێ.ف زمینی کە برای شخم زدن بە خوبی آبیاری کنند

**خاشاک**: خاشاڵ، چیلکە و چاڵ، پڕ و پووش.ف

خار و خاشاک

**خاشخاشکه ماره:** جۆرێک گوڵە خاشخاشکە گوڵەکەی گەورەترە لە خاشخاشکی ئاسایی و ڕەنگەکەشی سووری مەیلەو نارنجییە، کەلووی گوڵەکەشی بەر لە پشکووتن درێژۆکەیە و. بەقەد قامکە تیتۆلە دەبن و زیاتر لە بوورە و بەر کەندەڵان و شوێنی بەردەڵان دەڕوێ.ف نوعی شقایق

**خاشخاشـۆکێ:** خاشخاشک، چارەچەقیلە.ف شقایق

**خاشەبڕ کردن:** لە ڕیشە دەرهێنان، بنبڕ کردن، دوایی پێهێنان.ف از ریشه کندن

**خاکاو:** ئاودانی دێراوی تازە هەڵدراو بەر لەوەی شەتڵ و تووەکەی تێدا بچەقێنن.ف آب دادن خاک جالیز قبل از کاشتن

**خاکەر:** هێلکەکەر، مریشکی هێلکەکەر.ف مرغ تخمگذار

**خاکەڕا:** خۆ بە کەم زان، بێدەمار.ف متواضع

**خاکەڕایی:** خۆ بە کەم زانین، بێپۆز و هەوا بوون.ف تواضع

**خاڵخاڵۆکە:** (+) شنگە مایناتە، ئەسپنگە ماینە.ف نوعی گیاه خوراکی

**خاڵۆزە:** خاڵخاڵۆکە، خاڵخاڵۆک، خاڵخاڵک.ف کفشدوزک

**خاڵوڵەد:** ☜ خاڵەوڵەد

**خاڵەخشکێ:** خلیسکێن، خشخشانکێ.ف سرسرەبازی

**خاڵەوڵەد:** منداڵێک کە زۆر لە خاڵی دەچێ، یان ئاکاری وەک خاڵی وایە.ف بچەای کە بیشتر بە داییش رفتە

**خاڵهوما:** جۆرێ کۆتری کونجی کونجی جوانە.ف کبوتر خال خال

**خاموت:** قایشی عارەبانە کە لە ملی چارەوێ دەکرێ بۆ ڕاکێشانی.ف لاستیک پیوند اسب و گاری

**خانە خشتوور:** خانە خراپ، ماڵ وێران، ماڵ کاول.ف خانە ویران

**خانەمیری:** ) ناوی هەوایەکی گۆرانیی کوردییە ) ناوی هەڵپەڕکێیەکی کوردییە.ف ) نام یک آهنگ کردی ) نام یک نوع پایکوبی کردی.

**خاو شکاندن:** دەر کردنی ماڵات لە بەهاردا بۆ ماوەیەکی کورت و هێنانەوەی بۆ ماڵێ.ف بە صحرا بردن حیوانات اهلی در فصل بهار برای مدتی کوتاه و برگرداندنش بە خانە

**خاوبەستن:** بریتی لە فریو دان، هەڵخەڵەتاندن. *(وریابە خاوت نەبەستێ.)* ف فریب دادن

**خاوە:** چەرمێکی نەرم کە شەنەی داری پێ دروست دەکەن.ف نوعی چرم نرم برای درست کردن چنگک

**خاوەماست:** ماستی شل و ئاو تێ کراو بۆ مەشکە، خاوەمێ.ف ماست آبکی برای مشک

**خاویلکە:** تەمبەڵ، کار نەکەر، دەست و پێ سپیلکە، خاو و خلیچک.ف دست و پا چلفتی

**ختوورە:** بە دڵدا هاتن، بە خەیاڵدا هاتن، غایلە. *(دڵی ختوورە دەکا.)* ف خطور

**ختیمتی:** ختیلکە، ختووکە، قانەقدیلە.ف غلغلک

**خدوو**: خووی سروشتی، تەبیعەت.ف غریزه

**خدووک**:(+) کوڵی گریان، ئۆناق.ف بغض

**خدووک هەستان**: کوڵی گریان هەستان، ئۆناق. *(زۆری خدووک هەستابوو.)* ف بغض کردن

**خڕ هەڵدان**: کۆ کردنەوە، خڕ کردنەوە. *(گارانەکەی خڕ هەڵدا و بەرەو ماڵی ڕایدان.)* ف جمع کردن

**خراپۆچکە**: بێکەڵک، کەمبایەخ.ف بیارزش

**خربرۆشک**: چیرۆک، خەبەرۆشک، هەقایەت، قەواتی.ف افسانه

**خرپەک**: دغڵی تەنک، دەغڵی لاسک باریک کە لە شوێنی کراڵ دەڕوێ.ف مزرعەی گندم کە خاکش ریگزار باشد

**خرت**: نێری و بەرانی چوار ساڵە.ف بز و قوچ چهار ساله

**خڕتک**: کەندڕ، ئاودڕ، بوودڕ، شیوی قووڵی تەنگ.ف آبکند

**خرمچوو کردن**: چوار پەل بەستنی ماڵات بۆ سەر بڕین و بە عەرزدا دانی. *(گوریسێک بێنن خرمچووی کەن دەنا ناکەوێ.)* ف بستن و بە زمین زدن حیوان برای سر بریدن

**خرمژن**: دەنگی لەرانەوە و خرمەخرمی کرمەک و بەرمورو و ژێر چەنە. *(ڕێکتر لە گەڕی ڕەشبەڵەک/ خۆشتر لە خرمژنی کرمەک «هێمن».)* ف صدای زیور آلات

**خڕناک**: لووت، کەپۆ، دفن.ف بینی

**خڕۆکە**: گردیلەی زۆر وردی نێو خوێن کە بە زەرەبین دەبیندرێ و چوار لە دەی خوێنی لەش لەو پێک هاتووە و بە هۆی سپڵ و مێشکی یەسقان دروست دەبن و دوو جۆرن: خڕۆکەی سوور و خڕۆکەی سپی، خڕۆکەی سوور تۆزێ پانکەڵەن و ژمارەیان لە لەشدا یەکجار زۆرە و لە هەر میلیمەتری مکەعەبی خوێندا پێنج ملوێن خڕۆکەی سوور هەیە. لە خوێنی ئاژەڵدا ژمارەیان جیاوازە. هەر کاتێک ژمارەی خڕۆکەی سوور لە خوێندا کەم بێتەوە مرۆڤ تووشی کەمخوێنی دەبێ و ڕەنگی هەڵدەبزرکێ. خڕۆکەی سپیش سلوولگەلێکن لە کۆمەڵێک پێرتۆپلاسم و ناوکەیەک پێک هاتوون و ژمارەیان لە خڕۆکەی سوور کەمترە و لە هەر میلیمەتری مکەعەبی خوێندا شەش هەتا حەوت هەزار دانە هەیەف گلبول

**خڕوگز**: کتومت، هەروەک، عەینەن. *(عەلی خڕوگز هەر باوگییە.)* ف درست مثل، شباهت زیاد.

**خڕەپاندنەوە**: کایە کردن و دەستبازی و تلاندنەوە. *(یەکتری دەخڕەپێننەوە.)* ف بازی کردن و غلطاندن کسی.

**خڕەکە**: (+) قوڵە دارێکی بەقەد بستێکە نەقیزەیەکی پێوە بوو بە پەتێکەوە، سوار لە مەچەکی دەکرد بۆ لێخوڕینی یەکسم.ف چوب کوتاه نوک تیزی کە سوارکار با ریسمانی بە دست میکند و با آن اسب و الاغ را میراند

**خرەنگێز**: هەنگەژاڵە، زەردەواڵە.ف زنبور زرد

**خڕێنگ**: کرۆشکە.ف غضروف

**خڕێنەبڕە**: چوار ددانە گەورەی پێشەوەی

مرۆڤ.[ف] دندان نیش

**خزمەت کردن**: کار بۆ کەسێک کردن، ڕێز گرتن و بە دەوردا هاتن.[ف] خدمت کردن

**خزیلک**: (+) جۆرێ کرمی لووس و زەردە لە جێگای شێداردا دەژی.[ف] نوعی کرم

**خشتوور**: خاپوو، کاول، وێران.[ف] ویران

**خشتە**: (+) چوارخانە، جەدوەل.[ف] جدول

**خشتەی لێکدان**: جەدوەل زەرب.[ف] جدول ضرب

**خشخشانکێ**: خلیسکێن، خاڵەخشکێ.[ف] سرسرەبازی

**خشکە**: (+) بەو هەڵماتە دەگوترێ کە لە مێشێندا بەسەر زەویدا دەڕوا، پێچەوانەی هەڵگرتە.[ف] راندن تیله بر روی زمین در تیله‌بازی

**خلخل**: (+) جۆرێ مراوی کێوییە.[ف] خوتکای سفید

**خڵم**: چڵم، ئاوی لووت. *(خڵمی لووتت بسڕە.)* [ف] آب دماغ

**خڵمن**: چڵمن، چڵمە.[ف] خلمو

**خلندۆر**: گیایەکە دەکرێ بە چێشت، گیایەکە لە لۆرکی دەکەن.[ف] نام گیاهی

**خڵێفە**: پاپۆکە، پەپکە. *(ئەوڕوو مارێکم دی خڵێفە دابوو.)* [ف] چمبره

**خڵێفە خواردن**: خڵێفە دان، پاپۆکە خواردنەوە، قەف خواردنەوە، [ف] چمبره زدن

**خڵێفەدان**: پاپۆکە خواردن، پەپکە کردن، قەف خواردنەوە[ف] چمبره زدن

**خڵێڵە**: غایلە، دڵەخورپە. *(دڵم خڵێڵە دەکا و ناحەسێتەوە.)* [ف] دلواپسی

**خلێنە**: کاکیلکە، کاکیلە.[ف] دندان آسیاب

**خمام**: تەمومژ، تەمتومان، دومان، [ف] مه

**خمڵ**: پێشبینی، مەزندە کردن بە چاو.[ف] تخمین

**خمڵ خستن**: مەزندە کردن بە چاو، پێشبینی کردن.[ف] تخمین زدن

**خمڵخەر**: پێشبینیکەر[ف] تخمین‌زن

**خمڵکەر**: خمڵخەر.[ف] تخمین‌زن

**خنجوولک**: خنجیلە، خنجیلانە.[ف] کوچولوی دوست داشتنی

**خندڕک**: بوودر، کەندڕ، ئاودڕ، شیو.[ف] گودال

**خنۆک**: ئەوک، تینتینۆکە، قوڕقوراچکە، بینەقاقا قورگ، قوڕوو، گەروو.[ف] گلو، حلقوم

**خۆ بادان**: ) خۆ هەڵسووڕاندن؛ ) سەرپێچی کردن لە کار، *(کەم خۆت بادە ئەگەر بشمری دەبێ ئەوکارە بکەی.)* [ف] ) تاب دادن خود؛ ) سرپیچی کردن از کار

**خۆ بە ئاو و ئاوردا دان**: بریتی لە حەوڵدانی زۆر. *(ئەبۆ پارووییەک نان خۆ بە ئاو و ئاوردا دەدا.)* [ف] خود را به خطر انداختن

**خۆ بە زل زانین**: لەخۆبایی بوون، غللور بوون، بادیهەوا بوون.[ف] خود بزرگ‌بینی، تکبر.

**خۆ بەدەستەوە دان**: خۆ تەسلیم کردن، خۆ خستنە بەردەست.[ف] تسلیم شدن

**خۆ تێگەیاندن**: خۆ نیشان دان، سەر لێ هەڵێنان. *(خۆی لە کەس ناگەیێنێ، پێم وا ئەو خۆی تێ نەگەیاندی.)* [ف] خود را نشان کسی دادن

**خۆ تێوەردان:** خۆ لە کارێک هەڵقوتاندن.ف مداخله

**خۆ جوان:** ژیکەڵە، جوان، ژیگوڵ، جوانی سروشتی.ف زیبای طبیعی

**خۆ دۆڕاندن:** ) وره بەردان، دەست لە خۆ بەردان، ناهۆمێد بوون؛ ) خۆ فرۆشتن.ف ) نومید شدن؛ ) خود را باختن و مزدور شدن

**خۆ ڕانان:** ) خۆ کێشان بەرەو پێشەوە، هێز لەخۆ دان بۆ ڕۆیشتن؛ ) خۆ هەڵکێشان، خۆ نواندن و پۆز لێدان.ف ) کشیدن خود به جلو و راه رفتن؛ ) فخر کردن

**خۆ ڕێک خستن:** ) خۆ شیرین کردن، خۆ یەک خستن لەگەڵ کەسێک؛ ) خۆ لە یەکتر هەڵساوین.ف ) خودشیرینی؛ ) خود را به یکدیگر ساییدن

**خۆ فرۆشتن:** خزمەت کردن بە بێگانە، جاشییەتی.ف خودفروشی

**خۆ گنخاندن:** خۆ مات کردن و کار نەکردن بۆئەوەی کات بگوزەرێ.ف وقتکشی

**خۆ لە تەپڵی گوڵێ دان:** خۆ ڕازاندنەوە، خۆ جوان کردن. *(کچێ ئەوە بۆ وا خۆت لە تەپڵی گوڵێ داوە؟)* ف کنایه از آرایش کردن زیاد

**خۆ لە خوارەبایان گرتن:** بریتی لە خۆ لێنابەڵەد کردن، خۆ لێنەدان. *(زۆر زیرەکە خۆ لە خوارەبایان دەگرێ و ئەنندەهوو هەر نەیدیوە.)* ف خود را نابلد جا دادن

**خۆ لە دەسک نان:** خۆ حازر کردن بۆ جێگایەک، خۆ بە کەسێکەوە هەڵواسین و بە زۆر لەگەڵی ڕۆیشتن بۆ سەفەر. *(خۆی لە دەسک ناوە لەگەڵیان بڕوا.)* ف خود را بر کسی تحمیل کردن.

**خۆ لە قەرە (نە) دان:** تخون کەوتن، خۆ نیشان کەسێک دان. *(ناوێرێ خۆ لە قەرەم دا، خۆ لە قەرەی کەس نادا.)* ف به کسی نزدیک شدن یا نشدن

**خۆ لە ماڵ خستن:** ) حاشا کردن. *(ژنەتیوە خۆی لە ماڵی خستووە و بۆی چۆتە حاشا.)* ؛ ) بۆ ئاشت بوونەوە چوونە ماڵێک بۆئەوەی تاوان یان خەتاکەی ببەخشن. *(تازە هاتووە و خۆی خستۆتە ماڵت دەبێ لەگەڵی ئاشت ببیەوە.)* ف ) زنی که شوهر خود را ترک می‌کند و به خانه مرد دیگری می‌رود؛ ) برای آشتی کردن به خانه‌ی کسی پناه بردن

**خۆ لەگەز دان:** بریتی لە خۆ درێژ کردن، تخێڵ بوون، ڕاست ڕاکشان، ڕەهێڵ بوون.ف دراز کشیدن

**خۆ لێ بواردن:** چاو لێ قووچاندن، خۆ لێ گێل کردن.ف اغماز

**خۆ لێ بە پشتدا خستن:** حاشا لێ کردن و خۆ بە خاوەن نەکردن، گوێ پێنەدان.ف خود را صاحب نکردن

**خۆ لێخۆش کردن:** خۆ بەتەمای شتێک کردن، کەوتنە سەر تەماح. *(خۆم لێخۆش کردبوو بیبەم بۆ خۆم.)* ف بەامید چیزی بودن

**خۆ لێدان (نەدان) :** ) خۆ پێدادان، *(گیانم خۆڵاوییە خۆتم لێمەدە پیس دەبێ.)* ؛ ) خۆ لە

کار شـاردنەوە. *(خـۆ لـە هـیچ کارێک نـادا.)* ف ) برخورد؛ ) از زیر کار در رفتن

**خـۆ مـەڵاس دان:** خـۆ حـەشـار دان، خـۆ مـات کردن.ف ساکت و بی‌حرکت شدن

**خۆ هەڵداشتن:** خۆ فڕیدان، خۆ لە بەرزایی ڕا حەوا دانە خوار.ف خود را پرتاب کردن

**خو هەڵشەنگاندن:** شانازی بە خۆوە کردن.ف بە خود بالیدن

**خواتیەلە:** خوێ تاڵە، خوێی تاڵ.ف نمک تلخ

**خوارک:** پوور، پلک، میمک.ف عمە، خالە

**خواروا:** بنژیل، بنبێژنگە.ف تەنشین غربال شدە

**خـوازبێنی کـردن:** داوا کردنـی کـچ بـۆ کـوڕ، خوازمەنی کردن.ف خواستگاری کردن

**خوازمـەنـیکـەر:** خـوازبێنیکـەر، داواکـار.ف خواستگار

**خواژن:** پەیکەرەی جوان بۆپەرەستن.(ڤێنووس خواژنی جوانییە.ف الاهە.

**خواسایی:** ئاسایی، عادەتی.ف معمولی

**خوالە:** (+) بت، خوای دەستکرد.ف بت، صنم

**خوالینـە:** ) خـوێڵێن، کانگـەی نمـک؛ ) کانیـاوی سوێر، سوێراو.ف ) معدن نمک؛ ) چشمەی آب شور

**خوباب:** بەرخەبەبە، غەوغەو، غەبغەب، پێستی داکەوتووی بەر مل.ف غبغب

**خۆبزێو:** شتێک کە خۆی کار دەکا، مەکینەیەک کە خۆی هەڵدەبێ و دەکوژێتەوە، ئوتۆماتیک ف اتوماتیک

**خۆبێژ:** خۆوێژ، کەسێک کە گۆرانییەک ڕێک دەخـا و هـەروا لـەبـەر و خێـرا خێرا دەیڵـێ.ف ترانەخوانی کە فی‌البداهە می‌خواند.

**خۆترێن:** کارێک کە پیاو بە زەرەدی خۆی بێ. *(شەڕی خۆترێن نەیکەی چاترە.)* ف کاری کە بە زیان خود باشد

**خـوتن:** (+) ڕژد، چکـووس، ڕەزیـل، قـرنیس، پیـسکە، چکـوود، چـرووک، دەسـتقووچـاو، سەقیل.ف خسیس

**خوچک:** خوشک، خوار، خویشک.ف خواهر

**خـودا خـودا:** بـە تاسـەوە ویـستن، خۆزگـە خواستن. *(خودا خودامە جارێک ببینم.)* ف آرزو کردن

**خوداوڕاستان:** ئەزقەزا، قەزائەن، بەڕێکەوت.ف ازقضا

**خودری:** خۆڕست، خۆدەر، خۆڕسک.ف خودرو

**خـوردە بـوون:** دانـەخـۆرە بـوون، دەمـەچێشتە بوون.ف چشتەخوار شدن

**خـوردە کـردن:** دانـەخـۆر کـردن، دەمـەچێشتە کردن.ف چشتەخوار کردن

**خۆرکـە:** خـۆرە، مۆرانـە، مۆریانـە، جانـەوەری دارخۆر.ف موریانە

**خورمەچیچان:** گوڵە مێلاقە، ڕەبەنۆک.ف آلالە

**خـوریشـۆر کـردن:** بریتـی لـە کوتـانی زۆر، بـە دار لە کەسێک دان.ف کنایە از چوبکاری کردن

**خۆرێکخـەر:** خـۆ شـیرینکـەر، کـەسـێ کـە جێـی خـۆی لـە دڵـی خـەڵکـدا دەکاتـەوە.ف خـود را شیرین کردن

**خـورێنی:** خـورێن، دوای لـە خـەو هـەسـتانی

بەیانی هیچ نەخواردن. *(ئەم دەوایە بە خورێنی بخۆ.)* ف ناشتا

**خوزره**: زیندووله، مێکرۆب. ف میکروب

**خوزه**: خۆ مات دانی کەروێشک لەنێو بەفردا. *(کەروێشکەکە خوزەی کردبوو.)* ف پنهان شدن خرگوش میان برف

**خوزەدان**: بە پێدزکە دەرباز بوون، رۆیشتن بە ئەسپایی و دەرە دزە پێدان. ف جیم شدن

**خۆزەو**: خۆزگە، خۆزی، خۆزیا. ف کاش

**خوزیلێک**: قوز، کوز، خەمشە. ف آلت تناسلی زن

**خوسپە**: کەسەر، خەفەت، خەم. ف اندوه

**خوسەند**: جنێو، جوێن، دژمان. ف فحش.

**خوش دادان**: مانگایەک کە بە جوانی شیرەکەی دەدۆشـرێ. *(ئـەو مانگایـە هـەتـا گوێلکـەکـەی نەلێسێتەوە خوش دانادا.)* ف گاوی کە شیری بە خوبی دوشیده شود

**خۆش هەڵکێشە**: یانجووز، گیایەکە وەک تاڵوو وایـە بـەڵام گـەڵاکـەی پـانترە لاسـقی سـپییە و گوڵی زەردە لەنێو گەنمجاڕدا شین دەبێ. ف نام. ف نام گیاهی است

**خـۆشـئاژۆ**: ئـەسـپی خـۆشڕکێف و تیـژڕۆ. ف اسب خوشرو

**خۆشـــارۆکی**: قـــەرێ قـــەرێ، چاوشـــارکێ. ف قایموشک

**خۆشامایی کردن**: ڕیـایی کردن، کلکەسووتێ، خـۆ شـیرین کـردن، ماسـتاو سـارد کردنـەوە، تەشیڕێسی. ف تملق و خود شیرینی

**خـۆشداکـەنـە**: ) بریتـی لـە ژنێک کـە زوو خـۆ بـەدەسـتەوە دەدا و دەرپێکـەی دادەکـەنـێ؛ ) نـارنگی، میـوەیـەکـە وەک پرتـەقـاڵ وایـە تیخوڵەکەی بە ئاسانی پاک دەکرێ. ف ) کنایه از زنی که زود همخوابه میشود؛ ) میوەی نارنگی

**خۆشدڕ**: بریتی لە کەسێک کە جلوبەرگی باش لەبەر دەکا. ف کنایه از کسی که لباس شیک می پوشد.

**خوشدەر**: ئافتاوە، لوولێنە، مەسینە. ف آفتابه

**خۆشڕست**: تاجییەک کە بۆ ڕست کردن ڕام و دەسـتەمۆیـە. پێچـەوانـەی بـەدڕسـت. ف یـوز شکاری که خوب رام شده باشد

**خۆشکوڵ**: شتێک کە باش دەکوڵێ، بۆ لەپە و نـۆک و باقلـە دەگـوترێ. *(کیلۆیـەکـم لـەپـەی خۆشکوڵ کڕیوە.)* ف حبوباتی که به خوبی پخته میشود

**خـۆشگلـەیـی**: کـەسـێک کـە هـەمیشـە گلـەییی بـەدەسـتەوەیـە. *(هێنـدە خـۆشگلـەییـە نـاوێری سڵاوی لێ بکەی دەست دەکا بە گلەیی.)* ف کسی که همیشه گله دارد

**خۆشمەشرەب**: ☜ خۆشمەشرەف

**خـۆشمـەشـرەف**: خـۆشمـەشـرەب، گاڵتـەچـی، زمـانخـۆش. *(پیـاوێکی خـۆشمـەشـرەفـە.)* ف خوشرو، شیرین زبان

**خۆشه کردن**: ) تێک هەڵشێلانی قوڕ بۆئەوەی خۆشە بێ بۆ دیزە و گۆزە و کۆتەڵ و تەندوور و...؛ ) ڕاهێنـانی منـاڵ بۆئـەوەی لـە کـار کـردن ڕابێ؛ ) کولاندنی نێوکە چەقالەی تاڵ بۆئەوەی

ببێتە خۆشە.ف) بەهم زدن گل رس برای کوزە و تنور و مجسمە و ...؛ ) پرورش دادن فرزند برای اینکە کار یاد بگیرد؛ ) جوشاندن هستەی تلخ زردآلو برای اینکە شیرین شود

**خۆفرۆش**: سیخوڕ، جاش، بێشەرەف، فسۆس. ف خودفروش

**خۆفک**: ڕەحەتی، ئامرازێکی زار گوشادی بن تەنگە شتی تراوی پێ دەکەنە دەفرەوە.ف قیف

**خۆفیە**: ئیشی سیخوڕ، کاری جاش، کردەوەی خۆفرۆشف جاسوس

**خۆفیەگەر**: سیخوڕ، جاش، خۆفرۆشف جاسوس

**خۆفیەگەری**: جاشێتی، سیخوڕیف جاسوسی

**خۆڵ لە پارووی خۆ کردن**: بریتی لە زەرەد لە خۆ دان، خۆ تاڵ کردن.ف کنایە از بە ضرر خود کاری کردن

**خۆڵ لە چاو کردن**: بریتی لە فریودان، بە فریو بردن، کڵاو لەسەر نان.ف کلکل زدن

**خول هەڵبوون**: بریتی لە خۆ بادان و بە پەلە ڕۆیشتن بەرەو کارێک. *(خێرا لەو لاوە خول هەڵبوو هات بۆ لامان.)* ف با عجلە رفت

**خولامانە**: (+) پەلکی گوڵی گوڵەبەڕۆژە.ف گلبرگ آفتابگردان

**خوڵقەت**: خووخدە، ئاکار، تەبیعەت.ف عادت

**خوڵقێنەر**: بەدیهێنەر، داهێنەر.ف خالق، آفریننده

**خولگە**: جەغز، گردی، بازنە. *(لە خولگەیەکی تایبەتدا هەڵدەسووڕێن.)* ف دایره

**خۆڵەپۆک**: بێستانێ کە گیای هەرزەی تێدا نەمابێ و بە تەواوی بژار کرابێ.ف جالیزی کە از گیاه هرزە پاک شده باشد

**خۆلەخۆلە**: بانگ کردنی بەرخ.ف صدا زدن بره

**خولەک**: ) عەقرەبەی سەعات؛ ) دەقیقە.ف ) عقربە ساعت؛ ) دقیقە

**خۆڵەکوو**: خۆڵەکەوە، خۆڵەمێش.ف خاکستر

**خۆڵەمژ**: خۆڵەمێش، خۆڵەکەوە. .ف خاکستر

**خۆلی کردن**: ترساندن، تۆقاندن.ف ترسانیدن

**خونچ**: قوون، کۆم، کونگ.ف مقعد

**خۆواو**: ئاوێ کە لە مەزرا دەگیری و بێ ئاودێر خۆی لە زەوییەکە ئاژین دەبێ.ف آبی کە بە صورت طبیعی زمینی را آبیاری میکند

**خوودار**: شێت، دەلوو، لێوە، دین. *(بەجاری خووداری کرد.) (هێندە ترسام لەوانە بوو خوودار بم.)* ف دیوانە

**خووزە**: خۆ شاردنەوەی کەروێشک لەبن بەفردا، کاتێک هەست بە مەترسی دەکا دەچێتە بن بەفرەوە و تەنیا لای لووتی زەرد دەبێ و بەفرەکە دەتاوێنێتەوە. *(کەروێشکە شین لە خووزەدا بوو تاجی هەڵیانساند.)* ف پنهان شدن خرگوش میان برف

**خووگەملە**:گەمەیەکی لاوانەیە دوو کەس بەری پێیان بە یەکەوە دەنێن و گوریس یان پشتێنێک دوو سەرەکەی گرێ دەدەن و لە ملی دەخەن هەرکامیان بە هێزتر بێ ئەوی تر هەڵدەستێنێتە سەر پێ.ف اسم یک بازی جوانان

**خویَچیَژ**: تام کردنی چێشت بۆئەوەی کابان

بـۆی دەرکـەوێ چێشتەکـەی بـێخوێیـە یـان سوێرە. .ف چشیدن غذا

**خـوێڕی:** (+) تـەمبـەڵ لـە دەرسخوێنـدن. *(هێنـدە خوێڕییە هیچ فێر نابێ.)* ف تنبل

**خوێڕیگر:** خوێڕی ویست، لایەنگری لە خوێڕی، پشت بە خوێڕی بەستن. *(چەن چکۆڵەن پەلەوەر لەو بەرزە/* ئاخ کە چەن خوێڕیگرە ئەم عەرزە «سوارە».) ف پستخواە

**خوێڕیگەری:** خوێڕییەتی کردن، کاری حیزانە و پەست، سووک و چرووکی.ف فرومایەگی

**خوێڕیلـە:** لات، بـۆرەکـە، بێکـارە، بـۆرە پیـاوی خوێڕی و بێکارە.ف بیکارە، فرومایە

**خوێڕییـەتـی:** خوێڕیگـەری، پـەسـتی، چرووکـی، خێڕی سفەتی.ف فرومایەگی

**خوێژنگ:** هەڵە، سووچ، نەزانکاری.ف اشتباە

**خوێگە:** شوێنی خوێ پێدانی ئاژەڵ. *(مێگەلەکە رادە بۆ سەر خوێگە.)* ف محلی کە نمک برای گلە می‌ریزند

**خوێن بـەری چـاو گرتن:** بریتی لـە زۆر تووڕە بوون، چاو سوور بوون لەبەر رق و تووڕەیی. *(خـوێن بـەری چـاوی گرتـووە حـەتمـەن کـەسـێک دەکوژێ.)* ف کنایە از عصبانیت زیاد

**خـوێنبـژی:** خـوێنبـایی، خـوێن بـژاردن، قـەرە بووی خوێنی کوژراو.ف خونبها

**خوێندکار:** قوتابی، دەرسخوێن.ف محصل

**خوێنڕێژ:** قاتڵ، پیاوکوژ، خوێنخۆر.ف سفاک

**خوێنسۆل:** خوێنبایی، خوێنبژی، خوێن بژاردن ف خونبها

**خـوێنسـووک:** سـەحـەتسـووک، ڕەزا شـیرین، *(چەندی لە کچ و ژن و لە بەربووک/ چەند لاوی لەبار و قۆز و خـوێنسـووک «مـەم و زیـن»)* . ف زیبای دوست‌داشتنی

**خەبابـەت:** خۆ ئامادە کردن، حـازر بـوون، خۆ تەیار کردن.ف مهیا شدن

**خەپ خەپێن:**ناوی یارییەکی لاوانی گوندنشینە، شەوانە لە کۆڕەکەیاندا چرا دەکوژێننەوە هـەر کـەس مـست بـۆ کـەسـێک دادێنێتـەوە، جـا هـەر کـەس وریـا بـێ جـێ خـاڵی دەکـات بۆئـەوەی مستی هاوڕێکەی وە عەرزی بکەوێ.ف نام یک بازی جوانان

**خەپان:** خەپە، خەپەتۆڵـە، جوان و نـەرم و نـۆڵ. ف تپل

**خەپلەخڕێ:** کایە و دەست بـازیی ژن و مێرد و یــەکتــر تلاندنــەوە.ف بــازی زن و شــوهر و غلطاندن یکدیگر

**خەپۆڵە:** کولێرە، ئەستوورک.ف نان‌بربری

**خەپە:** (+) جۆرێ شەنەی گەورە و پانە کـای پـێ تێدەکەن.ف نوعی چنگک چوبی.

**خەپەخان:** شەڵتان، شەلاڵ، خـەڵتان. *(خـەپـەخـان بووگە لە خوون.)* ف آغشتە

**خــەپــەخــان کــردن:** لــە خوێنـا شــەلاڵ کـردن. *(خەپەخانی کرد لە خوون.)* ف آغشتە کردن

**خــەت خــەت:** ڕێ ڕێ، خـەتـدار. *(پـانتۆڵی خـەت خەتم کڕیوە.)* ف راە راە

**خــەت کێــشان:** ) خــەت پێـدا هێنــان *(مامۆسـتا مەشقەکەی بۆ خەت کێشام.)* ؛ ) شـوێن و کـار و

بار بۆ دیاری کردن. *(ئەوە خەتیان بۆ بکێشی تەواوی دەکەن!)* ؛ ) لێگەڕان، کار پێنەبوون. *(ئەوە هەر خەت بکێشە، پیاوەتیی لەدەست نایە.)* ف ) خط کشیدن مشق؛ ) نقشەی کاری کشیدن؛ ) کسی را خط کشیدن، انتظار از او نداشتن

**خەتابار:** تاوانبار، خەتاکار.ف خطاکننده

**خەتاکار:** خەتابار.ف خطاکننده

**خەتخۆش:** کەسێ کە خەتی خۆشە، خۆشنووس.ف خوشخط

**خەتسین:** خنکان، خەفە بوون.ف خفە شدن

**خەجاڵەت بوونەوە:** شەرمەزار بوون، تریق بوونەوە.ف خجل شدن

**خەجاڵەت کردن:** شەرمەزار کردن، تریق کردنەوە.ف شرمندە کردن

**خەجاڵەتبار:** شەرمەزار، شەرمەندە، فەدیکار.ف شرمسار

**خەجاڵەتی کێشان:** هەست بە شەرمەزاری کردن.ف شرمسار شدن

**خەجلان:** عەبەسان و دەست تێکەڵ هاتن، حەپەسان و سەرلێشێوان. *(هەر چاوی بە وەستاکەی دەکەوێ دەخەجڵێ.)* ف دست و پا گم کردن

**خەرتۆڵە:** ) سەگی چکۆڵەی قەڵەوە، سەگی خڕپن؛ ) منداڵی جوان و خڕکەڵە، منداڵی خەپەتۆڵە.ف ) سگ کوچک و تپلی؛ ) بچە تپل و زیبا

**خەرسەخول:** تەرسەقول، تەرسی یەکسم.ف مودفوع اسب و الاغ

**خەرسەک:** تەوەزل، قون قورس و لەش گران. *(دەڵێی خەرسەکە لەجێی خۆی نابزوێ.)* ف تنبل

**خەرگە:** (+) دۆشەکی ئەستوور و گەورە لە پەڕۆپاڵی کۆن.ف تشک کلفت و بزرگ از پارچە و لباس کهنه

**خەرمانەستێر:** تەرازووکۆ، کۆتەرازوو، پۆلێ ئەستێرە.ف خوشەی پروین

**خەرمێز:)** کەرمێز، لە شوێنێک کە گویدرێژێک میزی کردبێ، هەتا ماوەیەک هەر کەرێک بەوێدا بڕوا ئەویش میز دەکا؛ ) بریتی لە کەسێک کە زۆر چاولێکەری دەکا و لاسایی ئەم و ئەو دەکاتەوە.) ف ) جایی کە الاغ ادرار می‌کند و بقیە الاغها تا مدتی در آن محل ادرار می‌کنند؛ ) کنایە از آدم چشماچشم

**خەرنووک:** خرنووک، بنچکێکی درکاوییە بەرێکی وەک قەزوان دەگرێ. *(خەڵکی گەییە جەلبی ڕۆح و ئەم خەریکی شانەیە/ حەز لە تەسبیحی گڵین و خەرنووک و قەزوان ئەکا «قانع».)* ف بوتەای خاردار

**خەرووک:** خرنووک، بەرێکی دار مازووە.ف نوعی ثمر درخت مازوج

**خەروەن:** خەربەنگ، خەربنگ، ناوی گیایەکە، قاپقاپۆکە.ف اسم گیاهی است

**خەرەزەنگ:** غەرەزەنگ، خەرەزەن، قامچی کەڵ و گا ئاژۆتن.ف تازیانه

**خەزخۆ:** خەزگان، قازان، بەرۆش، مەنجەڵ.ف دیگ مسی بزرگ

**خەساراو:** قوونا‌و، پاشاو، ئاوێک کە لە زەوی

ئـاژین دەکرێ و لـەو سـەری دەردەچـێ و بـە فیڕۆ دەڕوا.ف آبی که از زمین بیرون می‌رود و ضایع می‌شود

**خەسجر:** شێواو، ئالۆز، شپرێو.ف آشفته

**خەسووتەقێنە:** ناوی کراسێکی ژنانەیە.ف اسم پیراهنی زنانه

**خەشەخوری:** گۆنییەی زۆر گەورە کە خوریی تێ دەخەن، هۆر.ف گونی بسیار بزرگ برای پشم

**خەشەماسی:** ماسییە خاتوون، جۆرێ ماسیی پنۆک پنۆک.ف نوعی ماهی

**خەفۆک:** (+) کەسێ کە هەمیشە خەوالووە و لە وەخت و بێوەختا دەخەوێ، خەوخەو.ف خواب‌آلود

**خەفەتخان:** خەفەتبار، خەمبار.ف اندوهگین

**خەفەنگ:** هەواکێش، پەنجێرەی چکۆلە لەلای سەرەوەی ژوور بۆ هەواکێش، دەلاقە.ف هواکش

**خەڵاتی:** کفن، بەرگی مردوو.ف کفن

**خەلەسکوو:** ئامانج، ئاوات، هیوا.ف آرمان، آرزو

**خەمسارد:** خەمسار، گوێ نەدەر، کەمتەرخەم، کەترەخەم. *(ئەرا ئی قەرە خەمساردی؟)* ف لاقید

**خەمساردی:**کەمتەرخەمی، بێموبالاتی.ف لاقیدی

**خەمەرە:** گرفت، ئینتەلا، نەخۆشیی هەزم نەکردنی خۆراک.ف بیماری امتلا

**خەنگ:** خەندە، کەنین، پێکەنین.ف خنده

**خەنەپوولی:** خەنەبەندان، شەوی بەر لە گوێستنەوەی بووک کە قاپێ خەنە لەسەر کەشەفێک دادەنێن و دەیگێڕن، هەر کەس بە پێی خواستی خۆی بەری دەستی لە خەنە دەدات و برێ پارە دادەنێ.ف حنابندان.

**خەنەپێچ:** دەسماڵێکی سێگۆشەیە کاتێک ژنان سەریان لە خەنە دەدەن لە سەری دەپێچن.ف دستمالی که هنگام حنا زدن به سر می‌پیچند

**خەنەتیلکە:** خەنەتیڤک، کرێژەبەرد.ف گلسنگ

**خەنەزاری:** شەرمەزاری، تریق بوونەوە، خەجاڵەت بوونەوە.ف شرمسار

**خەنەک:** (+) نیری شل کە ملی کەڵ و گا ئازار دەدا. *(نیرەکە خەنەک بووە ملی گایەکەی هەموو برینداز کردووە.)* ف یوغی که شل شده باشد و گردن گاو را آزار دهد

**خەوپەرژێن:** لێکدەرەوەی خەون.ف معبرخواب

**خەور:** (+) هەویر، هەڤیر.ف خمیر

**خەورترش:** هەویرترش.ف خمیرمایه

**خەوڕۆ:** کەسێ کە بە دەم خەوەوە دەڕوا.ف کسی که در خواب راه می‌رود

**خەوەر:** خەبەر، هەواڵ.ف خبر

**خەوەردار:** خەوەردار، هەواڵ پێ گەیشتوو. *(کەس لەی کارە خەوەردار نەوو.)* ف باخبر

**خەوەردان:** خەبەردان، هەواڵ پێدان. *(کەی خەوەردان پێمان.)* ف خبر دادن

**خەوەردەر:** هەواڵدەر، کەسێ کە خەوەر دەدا. ف خبررسان

**خیچەهێڵ:** خەتی خوار، هێڵی خوار و خێچ.ف خط خمیده

**خیزخوڕ:** خوڕێن، بەستێنی چۆم کە ئاوەکەی

خـوڕە و خیـزی وەسـەر کـشاوە.ف جـایی از رودخانـە کـە جریـان آب سـریع اسـت و شـن و ماسە بیرون زدە است

**خیزکەڵان:** خیزەڵان، زاخێر، زیخەڵان.ف ریگزار

**خیزگـان:** خلیسکێن، قوونـە خلیـسکێ، *(لـەسـەر بـەفـرەکـە خـەریکـی خیزگـان کـردنن.)* ف سرسرەبازی.

**خێزەر:** (+) بەزین، بۆڕ خواردن، *(کەڵەپیرە لە خێزەرە.)* ف شکست خوردن

**خیسکان:** خیزەڵان، زیخەڵان.ف شنزار

**خیسکن:** ڕەنگی خیز، گڵێک کە بەشی زۆری خیز بێ.ف خاکی کە بیشترش شن باشد

**خێشمە خێشم:** خێشەخێش، ڕاکێش ڕاکێش، (بە نهـێم ڕاکێـشان بـەسـەر زەویـدا.) ف کـشیدن برروی زمین

**خیشەسەر:** سەرقورس، ڕق ئەستوور و دەغەڵ. ف خیرەسر

**خێڵخانە:** بارگە و بنە. *(ئەو خێڵخانەیە بۆ کوێ دەبەن.)* ف بار و بندیل

**خیلەسەر:** خیشەسەر، سەرقورس.ف خیرەسر

**خێوان:** گونجان، ڕێک و پڕ بە پێست، شتێک کە بیخـەیتـە جێیـەک یـان نێـو شـتێکی تـرەوە بـە تەواوی جێگیر بێ. دەڵێن بە باشی خێوایتێ، ئەگەر جێگیریش نەبێ دەڵێن نایخێوێتێ.ف در هم جا گرفتن

**خێواندن:** لێدان، داهێنانەوەی زەبر. *(زللەیەکی خێواندە لا ڕوومەتی.)* ف زدن.



**داباش**: (+) ئامۆژگاری، مۆجیاری. ف نصیحت

**دابەستن**: (+) شەڕە قسە، شەڕە چەقە. *(لەگەڵم دامەبەستە/ دەمت دەڵێی مەقەستە.)* ف جدال لفظی

**داپچکوڕان**: ژاکان، بزرکان، زەرد هەڵگەڕان. ف پژمرده شدن

**داپۆکان**: پڕووکان، ڕزین، پرتووکان. ف پوسیده

**داتووکان**: هەڵترووشکان، هەڵتووتەکان، وشەیەکی ناحەزی فەرمان پێدانە بۆ دانیشتن. *(وەرە لێرە داتووکێ.)* ف بتمرگ

**داچکە**: بنێشت، جاچکە، چەققە. ف آدامس

**داخ پێ ڕشتن**: ڕق پێ ڕشتن، لێدانی کەسێک کە زۆرت ڕق لێی هەستابێ. *(خۆ دیقی پێ کردبووم، وەڵڵا داخی دڵی خۆم پێ ڕشت.)* ف کتک زدن کسی که داغ توی دل ریخته

**داخدار**: ☜ داغدار

**داخستن**: بەرگرتنی بێستان. *(بێستانەکە دایخستووە.)* ف به بار نسشتن جالیز

**دادڕەمردم**: پارچەیەکی ژنانەی ڕێڕێ بوو دەیانکردە کراس. *(یارم گوڕووی لێ گرتووم بۆ کراسی دادڕەمردم.)* ف نوعی پارچەی زنانه

**دادیار**: دادوەر، قازی. ف دادستان

**دار هەنە**: ئەو دارەی تەونی لەسەر دەچنن، دارە تەون. ف چوب قالیبافی

**داربەلەک**: داهۆڵ، داوەڵ. ف مترسک

**دارپیتار**: پیتار، داری بە تەمەن و نێو هەڵۆڵ، پیرەدار. *(خەمین و بیکەس داخ لە دڵ بار بێ/ قامەت خەم وێنەی داری پیتار بێ.)* ف درخت کهن سال و پوسیده

**دارجۆخین**: داری چەقێندراو لە نێوەڕاستی خەرمان کە گێرە بە دەوریدا دەخولێتەوە و کاری گای بنە دەکا. ف چوبی که در وسط خرمن به زمین میکوبند

**دارچەڵە**: چەڵەک، قیسپ، ئەو دارە ئەستوورەی چیغی پێوە دەبەستن. ف میلەی چوبی

**دارکلۆرە**: دارکونکەرە. ف دارکوب

**دارگوڵە**: تیرەگی چادر، ئەستوندەکی خێوەت، گەورەترین ئەستوندەکی ڕەشماڵ. ف تیرگ چادر

**دارمێشە**: جۆرێکە لە دار بەڕوو. ف نوعی درخت بلوط

**دارنووک:** قەڵەم، پێنووس، قەڵەمی دار.[ف] مداد

**داروبار:** (+) نیر و ئاموور، یەرەق و نێڵە.[ف] خیش

**دارەبۆق:** دارێکی دڕکاوییە وەک شۆڕەتووو وایە.[ف] نام درختی خاردار

**دارەت:** بوار و مەسەلە، بارودۆخ. *(خۆی لەو دارەتە نەدا.)* [ف] مورد

**دارەتەرم:** دارەمەیت، تابووت.[ف] تابوت

**دارەتەقێنە:** دارکونکەرە، دار کلۆرە.[ف] دارکوب

**دارەڵۆسک:** دەست پێوە گرتن و هەستان. *(منداڵەکە تازە خەریکە پێ دەگرێ و بە دار و دیوارەوە دارەڵۆسک دەبێ.)* [ف] دست به چیزی گرفتن و برخاستن

**دارهەنە:** کەوانی پەڕەکەر، کەوانی هەلاجی.[ف] کمان حلاجی

**داژەن:** خەسوو، دایکی ژن.[ف] مادرزن

**داساکین:** داسەکنین، هەدا دان، ئۆقرە گرتن، داسرەکان.[ف] آرام گرفتن

**داسرەکان:** داسەکنان، داسرەفتن، داسرەوین، داساکین.[ف] آرام گرفتن

**داشقە:** ) هێلینگە، گاری، عارەبانەیەک کە یەکسم ڕایدەکێشێ؛ ) عارەبانەی دەستی، ئەو عارەبانەی کەلوپەلی پێدەگوێزنەوە و بەدەست پاڵی پێوە دەنێن.[ف] ) گاری که با اسب کشیده می‌شود؛ ) گاری دستی

**داخ لە دڵ:** ) ڕق لە زگ، دڵ بە داخ، *(زۆری لێ داخ لە دڵە بیگرێ هەر دەیکوژێ.)* ؛ ) خەمبار، داغدار، دڵبەسۆ، دڵبریندار.[ف] ) کینەتوز؛ ) داغدار

**داغدار:** داخدار، دڵبەسۆ، دڵبریندار.[ف] اندوهگین

**داغە:**ناوی هەڵپەڕکێیەکی کوردییە.[ف] نام یک رقص کردی.

**داڵ داڵ کردن:** لەت لەت کردن، بەش بەش کردن، داڵبەخش کردن.[ف] تکه تکه کردن

**داڵبەخش:** دابەش، بەسەردا بەخشینەوە.[ف] تقسیم کردن

**داڵغە:** زەین، بیرگە، فکر.[ف] ذهن

**داڵقان:** شۆڕ بوونەوە.[ف] آویزان شدن

**داڵکەپیران:** کەنگری لاسق باریک و تاڵ. *(داڵکەپیران/ بۆ دەزگیران.)* [ف] کنگر تلخ با ساقەی باریک

**داڵگۆشت:** کز، لاواز، بنێس.[ف] لاغر

**داڵەڕووچکە:** خۆ پێوە هەڵواسین، پیا هەڵڕووچکان.[ف] خود را به چیزی آویزان کردن

**دالیا:**( گوڵێکی خۆماڵی کراوە لە باخچەی ماڵەکاندا دایدەچێنن.( ناوی کچانە[ف]( نام گلی است( نام دخترانه.

**دامردوو:** ) دامرکاو، داسەکناو؛ ) کوژاوە، خامۆش کراو.[ف] ) آرام گرفته؛ ) خاموش

**دامرکاو:** ☜ دامردوو

**دامژین:** هەناسە دەردانەوە، پشوو لە سینەدا کۆ کردنەوە و دەردانەوە.[ف] پس دادن نفس

**دامسقە:** داموسک، داموس، مووی بادراوی کلکی یەکسم.[ف] موی دم الاغ و اسب

**داموسک:** (+) بەنێکی پلاستیکی باریکە چەند لۆ بایدەدەن دەبێتە شریت و کەندر.[ف] نخ رشتەی

بەهم تابیده

**داناش:** گەنمێک کە دەیبەن بۆ لێ کردن لە ئاشی ف گندمی که برای آرد به آسیاب می‌برند

**داناو:** (+) یەکەم ئاو کە لە مەشکەی دەکەن. ف اولین آب که در مشک می‌ریزند

**دانپەڕ:** ئاژەڵێک کە ڕۆژێک نەیدۆشی یا بێچووەکەی نەیمژێ و وشک بکات پێی دەڵێن دانپەڕ بووە. ف خشکیدن شیر گوسفند یا گاو

**داندۆقە:** کەرەکێوی، خەرگوێلک، کەرەکێفی. ف گورخر

**دانگۆیی:** بە تێکڕایی، بە گشتی، نان خواردنی چەن کەس پێکەوە. ف غذا خوردن چند کس با هم

**دانە لەقلەق:** تۆڵەکە، کولێرەی حاجی لەقلەق، نانە حاجیلە. ف گیاه پنیرک

**دانەبێرە:** کاتی نیوەڕۆ کە شوان مەڕ دێنێتەوە بۆ دۆشین. *(مەشکەبژێ چ خێرە/ مەڕ گەییە دانەبێرە/ کابان دەڵێی کەنێرە «فۆلکلۆر».)* ف آوردن گله از صحرا هنگام ظهر برای دوشیدن

**دانەپاڵ:** (+) گوناە پێوە بەستن. *(بێچارە بێ‌تاوان بوو، تۆمەتیان دایە پاڵی.)* ف تهمت زدن به کسی

**دانەڕووتە:** دانەڕۆکە، دانوولەی نۆک و گەنم دروست کردن بۆ دەرهاتنی ددانی منداڵ. *(کوڕەکەت خەریکە ددانی دێ دانەڕووتەی بۆ بکە.)* ف گندم و نخود آب‌پز

**دانەڕەشکە:** گیایەکە گەڵاکەی وەک گوێ بەرخۆلە وایە بستێک لە زەوی بەرز دەبێتەوە و گوڵی چێرەیی دەر دەکا و دانەکەی وەکوو ڕەشکە وایە. ف نام گیاهی

**دانەکەوە:** دانەخۆرە، چەشە خواردوو، دەمەچێشتە. ف چشته‌خوار

**دانی خێر پێدا نەهێنان:** بە چاکە باس نەکردن، بە خراپە نێو بردن. ف خوب تعریف نکردن

**دانیغلان:** خپ بوون، بێ‌دەنگ و جووڵە، کرۆکپ، مات بوون. ف مبهوت شدن

**داواکار:** خوازبێنی. *(کچەکەمان داواکاری هاتووە.)* ف خواستگاری

**داواڵ:** ) داوەڵ، داهۆڵ؛ ) چڵە گەنمی بەجێماو لەپاش دروێنەوان. ف ) مترسک؛ ) شاخه گندم درو نشده در عقب دروگر

**داوداوە کۆستە:** شوان هەڵخەڵەتێنە، شوان خەڵەتێنە. ف بوتیمار، پرنده‌ای است

**داوک:** بۆسە، کەمین، ڕەبەت. ف کمین

**داوک:** دەزوو، بەنی بادراو. *(ئای لە بێوەژن دەڵێ بێ داوکم/ کیژێکم دەوێ بگاتە ناوکم «فۆلکلۆر».)* ف نخ

**داوکە:** داوگە، شوێنی داونانەوە. ف دامگه

**داوەتەنە:** جۆڵاتەنە، جاڵجاڵووکە. ف عنکبوت

**داوەڵ:** (+) ☜ داهۆڵ

**داوێن:** (+) دامێن، بناری کێو، پێدەشت. ف دامنه‌ی کوه

**داوێن‌شل:** بریتی لە ژنێک کە زوو خۆی بە دەستەوە دەدا و دەرپێکەی دادەکەنێ، خۆش داکەنە. ف کنایه از زنی که زود برای همخوابگی تسلیم می‌شود

**داهاتوو:** (+) ئاینده. ف آینده

**داهۆ:** دهۆ، فێڵ، گزی.ف حیله، نیرنگ

**داهـۆڵ:** (+) لقه گـه‌نمی بـه‌جێ‌ماو و بـه پێوه و دروێنه نه‌کراو.ف گندم جا مانده از دروگر.

**داهه‌ژ:** ته‌ڤگه‌ڕ، جووڵه.ف تکان

**داهێنه‌رێتی:** توانایی داهێنان.ف خلاقیت

**دایکبرا:** برایه‌ک که دایکیان یه‌که و باوکیان جیایه.ف برادرانی که مادرشان مشترک است

**دایه‌مه‌دده به‌گورگێ:** ناوی یارییه‌کی منداڵانه‌یه. ف اسم یک بازی بچه‌گانه

**دایه‌گه‌وره:** نه‌نک، دایکی دایک و دایکی باب.ف مادربزرگ

**دایـه‌نگـه:** شـوێنی پـه‌روه‌رده کردنـی منـداڵان، دایه‌نخانه.ف مهدکودک

**ددان بـه جـه‌رگـدا گـرتن:** سـه‌بر کردن، پشوو درێژی، دان به‌خۆدا گرتن.ف کنایه از تحمل و صبوری زیاد

**ددان به جه‌رگدا نان:** ددان به جه‌رگدا گرتن.ف کنایه از تحمل زیاد

**ددان شاش:** که‌سێک که ددانی که‌لێنی هـه‌یه و لێـک دوورن.ف کـسی کـه دنـدانهایش از هـم فاصله دارند

**ددان گرسـاندن:** ددانــه چیـره، چیرکردنـه‌وه‌ی ددان له‌به‌ر ڕق و قینی زۆر.ف دندان کروچه

**ددانـه:** (+) ئـامرازێکی مـه‌کینـه‌ی بـه‌رگـدرووه پارچه‌که ڕاده‌دا.ف کار پیش‌بر

**دانـــی خێرپێدانـــه‌هێنـــان:** ☜ ددانـــی هـــه‌ق پێدانه‌هێنان.

**ددانی هه‌ق پێدا نه‌هێنان:** دانی خێر پێدانه‌هێنان، به چاکه باس نه‌کردن. *(هـیچ کـه‌س ددانـی هـه‌قی پێدا نامێنێ.)* ف به خوبی از کسی تعریف نکردن

**دڕپێدان:** خۆ بـه‌نێو ئـاپۆره‌ی خـه‌ڵکدا کـردن و ڕێ بـازکردن. *(دڕی بـه خـه‌ڵکـه‌کـه‌دا و هاتـه ژووری.)* ف توی انبوه مردم راه بازکردن

**دڕکـان:** لاراو، دژاو، زه‌وینـی نابـار و لێـژ کـه ئاوی پێوه گیر نابێ.ف زمین ناهموار

**دڕکه‌ڵان:** دڕکه‌جاڕ، مه‌زرای دڕوواوی.ف زمین پوشیده از خار

**دڕگاوان:** ده‌رکه‌وان.ف دربان

**دڕگاوبـان:** ده‌رک و بـان، ده‌وروبـه‌ری مـاڵ.ف اطراف خانه

**دڕگه‌نه:** که‌لله ڕه‌ق، ڕقئه‌ستوور، خیشه‌سه‌ر.ف لجباز

**درماز:** به‌رانی پێنج ساڵه.ف قوچ پنج ساله

**درمناسی:** په‌تاناسی ف آفت‌شناسی

**دروشـــم:** (+) شـــوعار، شـــێعری دژایـــه‌تـــی وبه‌رخۆدان.ف شعار

**درۆکامین:** به درۆ، درۆیین، درۆیینه، به‌ده‌ڵ.ف دروغین.

**دڕوو ماميلکـه:** گیـا دڕوو، وه‌سـتا مـسته‌فـا، نه‌رمه‌به‌دۆ، گیایه‌که بۆ دۆکوڵیو ده‌بێ دڕووی هه‌یه.ف نوعی سبزی برای آش دوغ

**دڕووله:** ☜ نه‌رمه‌به‌دۆ

**دڕووه پوورایشێ:** دڕکێکی شینه په‌پووله پایزه ده‌رده‌کا.ف نام خاری است

**دڕووه زه‌رکه:** دڕووه زه‌رده، دڕووه کاخڵی

**دڕووه کـاخڵی:** دڕوویـه‌کـی زه‌رده گوڵـه‌کـه‌ی

وەک کاخڵی وایە.ف نوعی خار

**دڕووه کەڵەوه:** چۆکشکێنە، سەپانترێنە، ناوی دڕوویەکە لە بەراوان شین دەبێ دڕکەکەی زۆر سەخت و تیژە.ف نوعی خار

**درۆیینە:** درۆکامین.ف دروغین

**دڕەبا:** ڕەشەبا، بای تووش.ف طوفان

**دریژنە:** ڕۆچنە، کولاوکە، کڵاوڕۆژنە، کولانچکە، کولانجە.ف روزنە بام

**دز کۆشـکە:** (+) دزی خۆمـاڵی، خـاوەن مـاڵی شەریکە دز.ف عضو خانوادە و شریک دزد.

**دزاودز کـەوتـن:** پێـک گـەیـشتنی دوو دز لـە شوێنێک و لە یەکتر ترسان و هـەڵاتن. *(هەر تۆ قەولت دا من شەو نەخەوتم/ هاتمە درگاکەت دزاودز کەوتم «فولکلۆر».)* ف بە هم رسیدن دو دزد در یک محل و از یکدیگر ترسیدن و فرار کردن

**دزەباوانی:** دابێکە لە هێندێ شوێنی کوردەواری کاتێک بووک باوەخوێن دەکرێتەوە شتێک لە ماڵی باوکی دەدزێ.ف رسمی کە دختر بعد از عروسی بە خانەی پدر برمی‌گردد و چیزی می‌دزدد

**دژ کـردن:** (+) قرتاندنی مووی کلکی جوانووە ئەسپ بۆ ئەوەی پڕ و جوان بێ.ف بریدن دم کرەاسب برای اینکە پر پشت شود

**دژ کـردەوە:** هـەڵوێـست گـرتن لـە بـەرانبـەر کارێکدا.ف مخالفت

**دژاو:**( کەسێک یان حەیوانێک کە زۆر کەم ئاو دەخواتەوە، دوودڵ لە ئاو خواردنەوە. ( لاراو زەویی لێژ و نابار کە ئاوی تێ ئاژین ناکرێ.ف (زمین ناهموار ( مردد در آب خوردن

**دژدانــەوە:** ڕەنگدانــەوە بــەشــێوەی ســەلبــی، ڕەنگدانەوەی نیگەتیڤ.ف تاثیر منفی

**دژکار:** نەیار، دوژمن، دژ.ف مخالف

**دژوار:** پێچـەوانـەی ڕازی، نـاکۆک، دژایـەتـی. ف تضاد

**دژوێـن:** (+) جنێـو، دژمـان، دژمـێن، جـوێن.ف فحش، دشنام

**دفنان:** خێرکردن بۆ مردوو، هـەقی کفندروو و گۆڕهەڵکەن.ف پول گور و کفن و دفن

**دگلدگانە:** وشەیەک بۆ هاندانی کەڵەشێر دەیڵێن لە کاتی شـەڕدا. *(دگلدگانە، دگلدگانە/ کەڵەشێرە سوور شەڕە مەیدانە.)* ف *کلمەای کە برای تحریک خروس هنگام جنگ می‌گویند*

**دڵ ئاوخواردنەوە:** دڵ حەسانەوە.ف خاطرجمع شدن

**دڵ بە سێڵەوە دان:** دڵ بە کوچکەوە دان.ف داغ روی دل گذاشتن

**دڵ بە کوچکەوە دان:** داخ لەسـەر دڵ دانـان، دڵ سووتاندن.ف داغ بە دل گذاشتن

**دڵ بە گـەرداو:** دڵ بە خـەم، دڵ نیگەران، *( ئای لـە خـۆم غـەریـب و دڵ بـە گـەرداوێ/ مـن دەڵـێم سووک بڕۆ سووک شەقاوان باوێ/ دەس بدەوە گۆزەڵە بە بیانووی سەر ئاوێ/ مەمکۆڵانت بە من بمێنێتەوە بە باغی میرانی بایزبەگی/ کە بەرانبەر و پێشاوپێشە لەگەڵ کاولە شەقڵاوێ «حەیران».)* ف اندوهگین، نگران

**دڵ پێدان:** (+) گوێ پێدان، *(دڵ ناداتە هیچ کارێک بۆیە فێر نابێ.)* ف توجه کردن

**دڵ تێک هاڵان:** دڵ تێکەڵ هاتن. ف دل به هم خوردن

**دڵ خاو بوونەوە:** دڵ بوورانەوە، بریتی لە برسییەتی زۆر. ف کنایه از گرسنگی زیاد

**دڵ سوار:** دڵەدوا، نیگەران نگران. ف دلواپس

**دڵ سوار بوون:** خەمباری، دڵەدوا بوون. *(لەو کاتەوە ڕۆیشتووە دڵم سوارە.)* ف دلواپسی

**دڵ لە بوورەوە چوون:** دڵ لە خۆ بوونەوە، لە سەرخۆ چوون لەبەر برسییەتی، بوورانەوە. ف از حال رفتن بر اثر گرسنگی

**دڵ لە ژێڵڵا هاتن:** هێڵنج دان، ڕشانەوە، دڵ لە خێڵەوە هاتن. ف دل به هم خوردن

**دڵ لەخۆ بوونەوە:** بوورانەوە، لە هۆش خۆ چوون. ف غش کردن

**دڵاودڵ بوون:** دوودڵ بوون، خاترجەم نەبوون. ف تردید داشتن

**دڵاودڵ کردن:** بیرەبیرە، دوودڵی، دڵلەدڵ دان. ف تردید

**دڵبەسۆ:** دڵسووتاو، خەمبار، جەرگ سووتاو. ف دلسوخته

**دڵحەسانەوە:** خاترجەم بوون، دڵ ئاو خواردنەوە، ئەرخەیان بوون، دڵنیابوون. ف خاطرجمع شدن

**دڵدۆز:** کار لە دڵ کەر، دڵ ئازار دەر. ف آزارنده دل

**دڵسان:** بەخشندە، دەهەندە. ف بخشنده.

**دڵفەرێح:** جێگای با سەفا و دڵکەرەوە *(دەشتێکی خۆش و دڵفەرێحە.)* ف دلگشا

**دڵقایم:** بەئیمان، بەورە، بەتاقەت. ف بااراده

**دڵکۆچەر:** بێدین، بێباوەڕ. ف بی‌دین

**دڵکەر:** کەردڵ، کەسێ کە خەمی هیچی نییە. ف خردل

**دلمج:** بازنەی شووشە. ف النگوی شیشەای

**دلۆف:** خەونووچکە، کوتکە خەو، وەنەوز، پینەکی. ف چرت زدن

**دڵەخورپە:** دڵەوڕێزە. ف نگرانی

**دڵەشێر:** گیایەکە دوو گەڵای پان دەر دەکا و لە بەینی گەڵاکانیدا دوو دەنک تۆو دروست دەبێ بە یەکەوە دەنووسێن. ف نام گیاهی است

**دڵەوڕێزە:** دڵەخورپە، دڵەخورپێ، دڵەلەرزە. ف نگرانی

**دڵەیسۆ:** پێکەوە ڕوان، پێکەوە ڕوانی سەگ و تاژی لە کاتی جووت بوندا. ف بهم چسپیدن سگ و تازی هنگام جفتگیری

**دلیمە:** کەڵە، گیایەکی بێگەڵای گوڵ شینە لەنێو بێستاندا دەڕوێ و بێستانەکە وشک دەکا. ف نام نوعی انگل گیاهی در جالیز می‌روید

**دڵێنی:** دڵداری، ئەشقێنی، حەز لێکردوویی. ف عشقبازی

**دمازا:** پاشەبەرە، دوایین منداڵی بنەماڵە. ف آخرین فرزند خانواده

**دماوەر:** دمپاراو، زمانپاراو، قسەزان. ف سخندان

**دمبەڵ:** دمەڵ، کوان، قونێر. ف دمل چرکی

**دمپاراو:** دماوەر.[ف] سخندان

**دمقورس:** دەمقورس.[ف] رازدار

**دملەقووت:** لە خواردن دابڕان.[ف] از خوردن افتادن

**دمەچێشتە:** دەمەچێشتە، دانەخۆرە.[ف] چشتەخوار

**دمەداچەقە:** دەمەداچەقێ، ئاویلکە دان، بریتی لە کاتی سەرەمەرگ. *(کەوتوتە دمەداچەقی لە گیانەڵلادایە.)* [ف] کنایە از هنگام مرگ

**دمەک دڕاو:** ناو زڕاو بە خراپە و دەنگ دانەوە. ☜ تەپڵ دڕاو

**دند:** دەندە، ئەو دارەی ئامووره کە گاسنی پێدا دەکرێ.[ف] وسیلەای درخیش

**دندووک سوور:** جۆرێک باڵدارە لاق و دەندووکی سوور و درێژە لە گوێ چۆمان دەژی و ماسی دەگرێ.[ف] صدفخوار

**دنگلاڤ:** دنگهلەڤ.[ف] تاب

**دنگهلەڤ:** هەلۆرک، جۆلانێ، دیلانێ، هێزۆک، هێلەکان.[ف] تاب

**دنیا بە کۆڵەوە گرتن:** بریتی لە دڵ بە دنیا خۆش کردن و تەماحی زۆر.[ف] کنایە از دوست داشتن دنیا و آز و طمع زیاد

**دنیا قوونە کەو کردن:** بریتی لە تاقیکاری و ئەزموونی زۆر.[ف] کنایە از جمع کردن تجربە

**دۆ هەڵێنانەوە:** کولاندنی دۆ بۆ کەشک.[ف] جوشاندن دوغ برای کشک

**دوامەتی:** کۆتایی، ئاکام.[ف] عاقبت

**دوای کلاوی با بردوو کەوتن:** دوای کلاوی لار کەوتن.[ف] دنبال کار بیسرانجام رفتن

**دوای کلاوی لار کەوتن:** بریتی لە قوون بە گێچەڵ و دوای فێڵ و تەڵەکە و کێشە کەوتن، وەدوای کاری نابەجێ کەوتن.[ف] دنبال کار بیسرانجام رفتن

**دۆبڕاو:** ئاژەڵێک کە شیرەکەی وشک دەکا *(مانگا مرد و دۆ بڕا.)* [ف] مردن گاو شیر دە.

**دۆبردە:** جۆرێک نەخۆشیی پاتاڵە.[ف] یک مرض احشام

**دۆپ:** (+) مێرگ، لەوەڕگە.[ف] چراگاه

**دۆتەڵەمیران:** دەروێشەمارە، کرمەتوکنە، تەتەڵەمیران.[ف] نوعی کرم گیاهخوار کرکدار

**دۆچن:** توورەکە دۆ، کیسە دۆ، توورەکەیەکە دۆی تێدەکەن و دەیپاڵێون.[ف] پالونە

**دۆخەستە:** درووله، گیا دۆکولێویکە.[ف] نوعی سبزی برای آش دوغ

**دوراج:** کەو، ژەرەژ، دورگ، کوەک.[ف] کبک

**دوراجی:** ) کەوباز؛ ) قەرەچی، دۆم. *(مەسخەرەی دۆم و دوراجی ئەو سەر و ئەو خوارە خوم «ئاوات».)* [ف] ) کبکباز؛ ) کولی

**دوربە:** قوژبن، پەنا، پەسیو.[ف] پستو

**دورج:** مجری، سندوقی چکۆلە کە شتی بایی‌داری تیا هەڵدەگرن.[ف] صندوقچە

**دورچ:** قەفەز، ڕکە، تووله.[ف] قفس

**دورگ:** کەو، ژەرەژ، دوراج.[ف] کبک

**دوروبا:** بەردێکی قیمەتییە ڕەنگەکەی قاوەییەکی تۆخە.[ف] سنگی قیمتی بە رنگ قهوەای

**دۆزەر:** کەسێک کە شتێک دەدۆزێتەوە.[ف]

کاشف

**دۆژ**: دۆزەخ، جەهەندەم، دۆژهـ.ف جهنم.

**دۆسـوڵ**: تـۆراخ، دۆسـوێر، تـۆراغ.ف دوغ آب گرفته شده

**دۆسوێر**: ☜ دۆسۆڵ

**دۆش‌دابـردن**: مـووش‌کـردن، دۆش‌دامـان، مان‌کردن پیش‌خواردنەوە.ف مات و پکر ماندن

**دۆش‌دابـردوو**: مـووش‌کـردوو، دۆش‌دامـاو، پیش‌کردوو.ف مات و پکر شده

**دوشمین**: دوژمان، جوێن، جنێو، دژوێن، دژمێن. ف دشنام

**دۆقلێشە**: گیایەکە وەک ئاڵەکۆک وایە بزن لە چیا تووشی بێ بە سمی دەیداتەوە بنەکەی دەردەهێنێ و دەیخوا.ف نام گیاهی است

**دۆک**: ئـەو خلتـەی وەک کـەفـەڵووکـە وایـە لـە کەرەی تاواوە دەگیرێ.ف تفالەی کره

**دۆلاب**: (+) خشڵێکی بەرۆکی ئافرەتانە. *(دوگمە و دۆلابـی زێـڕین لـەسـەر دوو سـێوی کاڵـە.)* ف نوعی زیور زنانه

**دۆلاو**: (+) ئەو ئاخوڕەی لە دار یان لە تەنەکە دروستی دەکەن بۆ ئاو خواردنەوەی مالات.ف آخور آب

**دۆڵدر**: پڕ، لێواولێو، لیپاولیپ. *(ئەستێرەکە دۆڵدر بووە کەلاو دەکا.)* ف لبریز

**دۆڵکـێش کـردن**: بریتـی لـە بـەزیـن و بـە سەرشۆڕی گەڕانەوە. *(دۆڵکێشیان کرد و حیزانە ڕۆیشتن.)* ف کنایـه از شکسـت خـوردن و دور شدن

**دۆلووێز**: هەڵواسراو، ئاوێزان.ف آویزان

**دۆڵەدۆڵە**: وشـەیەکە بۆ ڕاداشـتنی منـاڵ دایک دەیڵێ بۆ ئەوەی میز و گووەکەی بکا.ف کلمەای که مـادر هنگـام گرفتن بچـه بـرای دفـع ادرار و مدفوع می‌گوید

**دۆڵـمـە**: دەڵـمـە، دەڵـمـێ، پـەنیـری هێـشتا نەگوشراو.ف لخته، دلمه

**دۆمبەران**: دۆمبەلان، دمەلان، گیایەکە بنەکەی وەک سـێبنـەعـەرزیلـە وایـە دەخـورێ.ف نـام گیاهی است

**دومەرکۆڵ**: دەمارەکۆڵ، دووپشک.ف عقرب

**دۆنقە**: جگی ڕەشە ولاغ.ف شتالنگ گاو

**دوو ئـاژۆ**: پاشـەنـگ، کـەسـێک کـە لـە دواوەی کـاروان دەڕوا.ف کـسی کـه در عقـب کـاروان می‌رود.

**دوو ئـاو بـوون**: مالاتێـک کـە کاتێـک دەم بـە ئاوەوە دەنێت نـاهێڵن تێر بخواتـەوە و لـە ئـاوی دەکەن، جاری دووهەم کە دەیهێننەوە سەر ئاو، ناتوانێ بە جوانی ئاوەکەی بخواتەوە. *(لێیگەڕێ با تێر بخواتـەوە دوو ئـاو دەبـێ.)* ف حیـوانی کـه بـار اول نمـی‌گذارنـد سیراب شـود و بـرای بـار دوم دیگر نمی‌تواند به خوبی آب بخورد.

**دوو چاوەکی**: ڕقەبـەرایـەتی، ڕەقـەبـەری، ئێنکە بەرایەتی.ف چشم هم چشمی

**دوو قامکە**: جۆرێ مێشێنە بە هـەڵمـاتی گـەورە دەکرێ و بە دوو قامک دەیهاون.ف تیلەبازی با نوعی تیلەی بزرگ

**دوو قـوز و دوو قنـگ**: ☜ دوو قـوز و دوو

قوون

**دوو قوز و دوو قوون**: بریتی له مرۆی دووڕوو و دووزمان. ف کنایه از آدم دورو و متملق

**دووات**: داوەت، زەماوەند، شایی. ف عروسی

**دوواتوونه**: پۆیلانه، کادۆ، دیاریی شایی. ف کادوی عروسی

**دووبنەکی**: کەسێک کە ماڵی هەم لە شارە و هەم لە دێیە. کەسێک کە لە دوو شوێن ماڵ و مەزڵی هەیە. ف کسی که در دو مکان خانه و کاشانه دارد

**دووبەدەر**: دیواودەر، کوناودیو. ف دیوار سوراخ شده

**دووپشکه**: دووپشک، دەمارکۆڵ، دمارەکۆڵ. ف عقرب

**دووچک**: ) کلک، دۆڤ؛ ) جووچک، جووجەڵە. ف ) دم؛ ) جوجه

**دووحاچە**: دووپەل، دووهاچە، دووفلیقانە. *(سەر مەخمەری بن دووحاچە/ پەلەپیتکەی هەیە وەک دەمانچە «قوز» "مەتەل".)* ف دوشاخەی نزدیک بەهم

**دووخۆر**: چەقەڵ، تیروو، توورگ. ف شغال

**دوودەسرۆکە**: دوودەسماڵە، جۆرێ سەما کردنە بە دوو دەسرە. ف نوعی رقص

**دوورنە**: چەڵتووک، دەنکێکی بۆرە لەنێو برنجدا دەبیندرێ. ف دانەای شبیه شاهدانه که در میان برنج دیده میشود

**دووره زەین**: شتێک کە جێی باوەڕ نییە و لە زەین دوورە. ف باور نکردنی

**دۆوک**: (+) سپیایی ئارەقە کە لە جلوبەرگ دێتە دەرێ، دۆکە. ف سپیدک عرق بر روی لباس.

**دووکان**: (+) کەرتە زەویی ڕێک و چوارگۆشەی سەوزی و پیواز و ... *(سەوزیخانەکەم دوازدە دووکانە چواریانم کردووە بە تەڕەتیزە.)* ف زمین سبزیکاری

**دووکەرێسە**: گورەویلکە، گۆرییەچنە، باڵدارێکی چکۆلەیە لە بولبول چکۆلەترە هێلانەی وەک گۆرەوی ساز دەکا و بە لقە دارانەوە شۆڕی دەکاتەوە. ف پرندەی چرخریسک.

**دووکەڵ ئاوسە**: جۆرێک قالۆنچەی وردی باڵدارە لە دەوری دووکەڵ و ئاور کۆ دەبنەوە. ف نوعی سوسک بالدار که به دود آتش نزدیک میشود

**دووکەڵ ژۆ کردن**: قانگ دان، دووکەڵ کردنە نێو کونە ڕێوییەوە بۆئەوەی بێتە دەرێ. ف پر از دود کردن جایی

**دووکەڵدان**: (+) ئێکسۆزی ماشێن و تەراکتۆر و ... ف اکسوز

**دووگ قەڵەشێنە**: گیایەکی شینی مەیلەوسپیە وەکوو وێنجە وایە و خۆرسکە ماڵات بەتایبەت مەڕ چاکی دەخوا و پێی قەڵەو دەبێ. ف نام گیاهی است

**دوولینگە**: شاڕواڵی عەجەمی، پانتۆڵ. ف شلوار

**دووندا**: عەولاد، ڕۆڵە، ئۆجاخ. ف فرزند

**دوونیا**: چاڵایی، زەویی ناتەکووز، زەوییەک لە چاڵاییدا هەڵکەوتبێ. *(ئەم زەوییە دوونیایە تۆوی زۆر دەوێ.)* ف زمین ناهموار

**دووپینە**: دوودانەیی، دووشتی پێکەوە نووساو، ف دوگانە.

**دووە**: بەرانی قۆڕ، بەرانی گون داچۆڕاو. ف قوچ فتقی

**دووهاچە**: دووفلیقانە، دوولک، دووفلیچقانە. ف دوشاخە

**دووەلەقێ**: کلکەسووتێ، ڕیایی کردن. ف تملق

**دوێر**: ژووری دانیشتن، وەتاغ، ژوور. ف اتاق

**دوێز**: دز، چەتە، جەردە. ف دزد

**دویکێل**: دووکەڵ، کادی. ف دود

**دویندان**: دووندا. ف فرزند

**دوینە**: (+) دوێنی، ڕۆژی ڕابردوو. ف دیروز

**دەئیفە**: دەعبا، دێو، مێردەزمە، دێوەزمە، ڕمووزن. ف هیولا

**دەبار**: (+) ئاڵف و کاوتفاقی وشککراو بۆ زستان. ف علف و کاه برای زمستان

**دەبنە کردن**: نیشانە کردن، شوێن پەیدا کردن. *(وەرە با بڕۆین لەو قەدی کێوە دەبنەم کردووە.)* ف نشانه کردن

**دەبنی**: چەشنی، وەکوو، وێنەی. ف مانند، مثل

**دەبۆتخانە**: دەبۆخانە. ف انبار مهمات

**دەبۆخانە**: دەبۆتخانە، هەمباری چەک و تەقەمەنی. ف انبار مهمات

**دەبە**: (+) گایەک کە یەختە کرابێ. ف گاو اخته شده

**دەبەر**: دەڤەر، دەوەر، ناوچە، ناوەقە. ف منطقه

**دەبەگولوو**: شتێ کە لە دوو بەرابەرەوە بووبێ بە چەند بەرابەر. ف چیزی که از دو برابر به چند برابر رسیده باشد

**دەبیە کردن**: دەبە کردن، گزەکردن، فێڵ کردن. ف کلک زدن

**دەبیە**: دەبە، فێڵ، تەڵەکە، گزە. ف کلک

**دەبیەکار**: فێڵەباز، گزیکار. ف کلک‌باز

**دەپیس**: ) چکووس، قرنیس، ڕژد؛ ) دز، خاین بە ئەمانەت. ف ) خسیس؛ ) خائن به امانت

**دەحە**: جار، کەڕەت، چەل، *(دوو دەحە چووم جواویان نەدامەو.)* ف دفعه

**دەخۆ نووسان**: لەخۆ نووسان، فشار بۆ خۆ هێنان، قەوەت لەخۆ دان. ف به‌خود فشار آوردن

**دەخووس گرتن**: دەخووس نان، خووساندن. ف خیساندن

**دەخووس نان**: دەخووس گرتن *(مەشکەکەمان دەخووس ناوە نەرم بێتەوە.)* ف خیساندن

**دەخەز**: ڕق، قین. ف کینه

**دەراندن**: (+) درکاندن، ئاشکرا کردن. ف افشا کردن

**دەراو**: (+) جۆری ڕاوێژ، هەوای دەم *(ببیوێنە بزانە دەراوی دەمی چۆنە.)* ف طرز ادای کلمات

**دەرج هاتن**: چارە هاتن. *(ئەوانە دەرجیان دێ، دەردی گەورەتر هەیە.)* ف چاره شدن

**دەرد تێدا نەبوون**: بریتی لە ڕق هەستان و داخ و حەسرەتی زۆر. *(لە داخانا دەردم تێدا نەبوو.)* ف کنایه از حسرت زیاد

**دەردەس:** دەسگیر، دیل، گیراو.ف اسیر

**دەرزیقژ:** دەرزیلە، قردێلە.ف سرخارە

**دەرک بوون:** (+) دەر هاتنی چڵک و کێمی برین و دمەڵ. *(برینەکەی دەرکی بووە.)* ف بیرۆن آمدن چرک دمل

**دەرکەزا:** خانەزا، نۆکەرێک کە لە ماڵی ئاغاکەیدا لەدایک بووبێ.ف خانەزاد

**دەرماڵە:** مووچە، هەقدەست.ف حقوق

**دەرمەجێڵە:** چەپەر، دەرمەنجڵە، درگای بە تووڵ تەنراو.ف درب چپر

**دەرنارد:** ئەو کاڵا و کووتاڵەی دەنێرردرێ بۆ دەرەوەی وڵات.ف صادرات

**دەروون کۆڵی:** پشکنینی بیر و باوەڕ و ناخ ف تفتیش عقاید.

**دەروێشەمارە:** کرمەتووکنە، جۆرێ کرمی تووکنە بەسەر یەکدا ئاپۆرە دەدەن و تۆڕێکی تەنک بەسەر خۆیاندا دەکێشن.ف کرم کرکدار

**دەرە دزە پێدان:** خۆ دزینەوە، خوزەدان.ف جیم شدن

**دەرە:** (+) چەقۆی گەورەی قەسابی، کێرد.ف چاقوی بزرگ قصاب

**دەرەبوار:** سەرەتای بەهار.ف اول بهار

**دەرەتان:** مەودای دەرباز بوون، دەرفەتی ڕزگار بوون. *(چاوم لە لکی هومێدە بۆم دانایە/ ئەی خۆزگە کە داشدەهات بەری هەبوایە/ زیندانە ژیانم دەرەتان نابینم/ ئاڵۆز و گرێپووچکەیە ئەم هەودایە «خەیام».)* ف فرصت رهایی

**دەرەدزە پێدان:** خۆ دزینەوە لە کار. *(نیو سەعات کار دەکا و بە پەنایەکدا دەرەدزەی دەداتێ.)* ف جیم شدن هنگام کار

**دەرەڤۆک:** هەقایەت، خەبەرۆشک، خربرۆشک، ئەوسانە.ف افسانە

**دەرەوشار:** شاربەدەر، لە شار وەدەرنان بە زۆری *(بۆ دەرەوشارم دەکەن لە سەر هیچ و خۆڕایی؟)* ف نفی بلد

**دەرەوێر:** درۆزن، چەلدرۆ، دەرەوێن، دەلەسەباز.ف دروغگو

**دەزوولە:** (+) مۆخی نێو مۆغەرەی پشتی مرۆڤ.ف نخاع

**دەژین:** ) ئێش، ئازار، ژان؛ ) یەشان، ژان کردن. ف ) درد؛ ) درد کردن

**دەس قوچیاگ:** مست قووچاو، ڕەزیل، قرنیس. ف خسیس

**دەس لەوەڕ:** بەدەست لەوەڕدان بە حەیوان *(ئەو بەرخە وا دەستەمۆ بووە بە دەس لەوەڕ نەبێ دەم بۆ گیا نابا.)* ف دادن علف بە حیوان

**دەسبار:** دەست پێکەوە دانی دوو کەس بۆ هەڵگرتنی تا گەنم و...، بار کردن. *(وەرە با بە دەستبار تایەکە سەرخەین.)* ف دست بە هم دادن برای بار کردن بار سنگین

**دەسپیچک:** (+) بەهانە، پەڵپ، بیانوو، ورک.ف بهانە

**دەستاژۆ:** (+) فەرمانی ترۆمبیل و پاپوڕ و...ف

سکان، فرمان.

**دەستاونگ**: دەسکاونگ، ئاونگ بە دەسکەکەیەوە، ف هاون با دستەاش.

**دەستاوێژ**: (+) بەڵگە، دەلیل. ف مستمسک.

**دەست بە دەم ڕانەگەیشتن**: ) کەسێ کە کاسپی باشی نییە و بەشی خەرجی خۆی پەیدا ناکا؛ ) کەسێ کە زۆرخۆرە و تێرخواردنی نییە. ) کسی که دخلش کفاف خرجش را نمی‌کند؛ ) کنایه از آدم شکمو

**دەست بە زەرەد**: کەسێک کە دەست بۆ هەر کارێک ببات خراپی دەکا. ف کسی که هر کاری بکند ضرر می‌زند

**دەست تێکەڵ هاتن**: سەرلێشێوان، هەوڵبوون. ف هول شدن

**دەست چەور کردن**: دەم شیرین کردن، بەرتیل پێدان، دەم چەور کردن، سمێڵ چەور کردن. *(تا دەستی چەور نەکەی کارەکەت بۆ جێبەجێ ناکا.)* ف رشوه دادن

**دەست خەرۆ**: بەردەست بوون، خۆ بەدەستەوەدان. ف تسلیم شدن

**دەست ڕاست**: کەسێک کە لە تیرەندازیدا بە باشی نیشانە دەپێکێ، ئەنگێوە. *(هێندە دەستی ڕاستە موو دەپێکێ.)* ف تیرانداز ماهر

**دەست ڕۆیشتن**: دەسەلاتداری، دەست ڕۆیین *(دەستم کە بڕۆیشتبا خودا ئاسایی/ گەردوونێ ترم دەخستە ڕوو سانایی «هەژار».)* ف قدرت

**دەست ڕۆیشتوو**: بە دەسەلات. ف مقتدر

**دەست ڕۆیین**: دەست ڕۆیشتن. ف قدرت

**دەست ڕەقاس بوون**: ڕاهاتنی دەست بە کار. *(دەستم ڕەقاس بووە.)* ف مهارشدن دست درکار

**دەست سارد بوونەوە**: ناهومێد بوون لە کار *(کە ئەو قسەم بیست، دەستم سارد بۆوە)* ف سرد شدن در انجام کاری

**دەست شل بوونەوە**: ناهومێد بوون و سارد بوونەوە لە کار، دەست بۆ کار نەچوون. *(کە ئەو قسەی کرد دەستمان شل بۆوە.)* ف نومید شدن از کاری

**دەست فریای دەم نەکەوتن**: ☜ دەست بە دەم ڕانەگەیشتن

**دەست گرۆیی**: یارمەتیدان، یاریدەدان، هاریکاری. ف امداد

**دەست لە دڵ (نە) بوونەوە**: ڕازی (نە) بوون، مل (نە) دان. *(هێندە سەختە دەستی لە دڵی نابێتەوە.)* ف کنایه از تردید زیاد

**دەست لە دەست نان**: ) تۆقە کردن، دەست و مشتاخ؛ ) مارەبڕینی کچ لە کوڕ، *(نەمرم دەستتان دەنێمە دەستی یەک.)* ف ) دست دادن؛ ) عقد کردن دختر برای پسر

**دەست لە ڕەش و سپی نەدان**: بریتی لە کار نەکردن، بێکار دانیشتن *(هەمیشە لە ماڵێ دانیشتوە و دەست لە ڕەش و سپی نادا.)* ف بیکار و تنبل

**دەست لە گۆزەدامان**: بریتی لە هیوابڕاو بوون. ف کنایه از نومید شدن

**دەست لە هەمبانە بەر بوون**: ناهومێد بوون، هیوابڕاو بوون. ف ناامید شدن

**دەست لەدڵ بوونەوە:** دڵ نەرم بوون، ڕازی بوون بۆئەوەی کارێک بکەی. *(دەستی لە دڵی نابێتەوە خێرێک بکا.)* ف *کنایه از راضی شدن.*

**دەست لەڕوو نان:** داخوازی کردن، داواکاری *(من قەت دەست لەڕووی پیاوی وا نانێم.)* ف خواهش کردن

**دەست لێ داشتن:** ناهومێد بوون، هیوا پێنەمان. *(تازە بە هیوای نیم دەستم لێ داشتووە.)* ف از چیزی دل کندن

**دەست لێ ساندن:** بەزاندن *(بەجارێ دەستی لێ ساندووە.)* ف شکست دادن

**دەست لێڕاگرتن:** مۆڵەت پێدان، لەسەر ڕاوەستان. ف مهلت دادن

**دەست لێوەرێنان:** باوەش پێداکردن، لە ئامێزگرتن *(وەرە کوڵمەم لە کوڵمەی تۆ خشێنم/ وەرە با دەست لە باڵاکەت وەرێنم«هێمن».)* ف درآغوش گرفتن

**دەست لێهەڵێنان:** بریتی لە پەلە کردن لە کار *(ئەگەر دەستی لێهەڵێنن بۆ ئێوارێ تەواو دەبێ.)* ف عجله در کار

**دەستبار:** بار هەڵگرتن بە دوو کەس کە دەستیان پێکەوە دەگرن و تایەکەی دەخەنە سەر و بەرزی دەکەنەوە( شەنگەبێری یار و دەستباری کوڕی کۆچەر نەبێ/چۆن دەگاتە جێ هەوار و هۆبە، ئەو بارگەوبنە. «هێمن») . ف برداشتن بار به وسیلەی دو نفر

**دەستبەند:** (+) دەستەوانە، دەستبەندی زێڕ. ف دستبند طلا

**دەستتێر:** دەستێر. ف ثروتمند

**دەستحیز:** دەستپیس، دز. ف دزد

**دەستدا:** ژێرچەپۆکە، ملکەچ، ژێردەستە، ف زیردست

**دەستدرێژ:** دەسدرێژ، داگیرکەر. ف متجاوز

**دەستدرێژی:** دەسدرێژی، زۆرداری کردن. ف تجاوز

**دەستمژ:** دەستبڵاو، دەست شاش، هەڵەخەرج، دەسباد. ف ولخرج

**دەستودڵباز:** دڵاوا، دڵفراوان ، بەخشندە، سەخی. ف سخاوتمند

**دەستەچز:** تێ هەڵچەقان، دڕوو لە دەست هەڵچوون. ف خلیدن

**دەستەخۆ:** دەستبەجێ، خێرا، لەڕێوە. ف فوری

**دەستەسڕ:** دەسڕۆکە، دەسماڵدەست. ف دستمال کوچک

**دەستەک:** (+) دەست نیشانکراو، دیاری کراو. ف نشانه شده

**دەستەکوتکێ:** دەستەکوتێ، پەل کوتان، بەکوێرەکوێرە بۆشتێک گەڕان. ف کور مانند با دست جستجو کردن.

**دەستەڵێن:** دەستەمۆ، دەسەڵێن، کەوی. ف رام

**دەستەملە:** زۆرانی دەست، زۆرەزمێ. ف پنجه انداختن و امتحان قدرت.

**دەستەوا:** (+) خوازە، ئیستعارە، ناوی خوازراو لە شێعردا. ف استعاره

**دەستەوام:** دەستەوا، یاریدەدانی یەکتر بە نۆبە. *(مامە مامە دنیا دەستەوامە.)* ف کمک کردن به

همدیگر

**دەستەوانە**: (+) دەستبەند، لیزگە مووروویی کە لە دەستی دەکەن. ف دستبندی که با مهره‌های رنگی به دست می‌کنند

**دەستەوبەجێ**: دەسبەجێ، لەڕێوە. ف فوری

**دەستەوخۆ**: دەستەخۆ. ف فوری

**دەستەوداوێن**: پاڕانەوە، تکا و ڕجا *(دەستەوداوێنی مەلا و شێخ بووم.)* ف خواهش و تمنا، دست به دامن شدن

**دەسەوستان**: (+) دەسەوسان، سست و تەمبەڵ، بەساوە ساو(ئەی میللەتی مەزڵووم و فەقیر و دەسەوستان/ ئەی کوردی پەڕاکەندە لە گەرمێن و لە کوێستان «مەلا مارف کۆکەیی») . ف سست، ناچار، لاعلاج.

**دەستی تەڕ لە دوو دان**: بریتی لە فریو دان و بە ناهومێدی بەڕێ کردنی کەسێک.*(دەستێکی تەڕی لە دوودا و بەڕێی کرد.)* ف کنایه از فریب دادن رد کردن کسی.

**دەستێر**: دەستپڕ، دەوڵەمەند، بێنیاز. ف دارا، ثروتمند

**دەسچن**: ) بەدەست چندراو؛ ) میوەی بەدەست لە دار کراوە. ف ) دستباف؛ ) دستچین

**دەسچێن**: شیناوەردی تۆم وەشاو، بەرانبەری خۆڕست. ف کاشته شده

**دەسحیز**: ☜ دەستحیز

**دەسدار**: سەیدا، مامۆستا. ف معلم

**دەسرازە**: ئەو پەتە پانەی بە بەنی ڕەنگاوڕەنگ وەک کەژوو دەیهۆننەوە بۆ بەستنەوەی دەست و لاقی منداڵ لە لانکەدا. *(لەنێو کورد نەبێ دەسرازە نییە/ ئەو بەند و قوڵف قەڕازە چییە؟)* ف *نواری پشمی دستباف برای* بستن نوزاد در گهواره.

**دەسرە**: (+) شاشک، مێزەر، پێچ *(دەسرەکەت لە سەرت پێچە با بڕۆین.)* ف دستار

**دەسڕەش**: ☜ چنگڕەش

**دەسگرۆ**: ) دەستەمۆ، کەوی؛ ) یاریدە، یارمەتی، دەستگرتن. ف ) رام؛ ) کمک، یاری

**دەسگۆڕ**: دەسەنقەس، بەقەستی، ئانقەست. ف عمدا

**دەسمییەت**: یاریدە، یارمەتی *(مەمنوونم لەی کارە دەسمییەتم دان.)* ف کمک

**دەسنیا**: دانان لەسەر کار، دامەزراندن، کەسێکی کە بە تایبەتی لەسەر کارێکی دادەنێن. *(هیوا دەسنیای خۆمە لەو ئیدارەیە.)* ف دستنشانده

**دەسەبەر**: ) زامن؛ ) ناوە، ئەستەملێ، دەفری قورکێشان، تەشتی قوڕ؛ ) عەرەبانەیەک کە بەدەست لێیدەخوڕن. ف ) ضامن؛ ) ظرف گل‌کشی؛ ) گاری دستی

**دەسەر**: دەستار، دەسار، بەردی دانەوێڵە هاڕینەوە. ف دستاس

**دەسەک**: (+) بیانوو، بەهانە، پەڵپ، ورک. ف بهانه

**دەسەڵێن**: دەستەمۆ، دەس گورۆ. ف رام

**دەسەنقەس**: بە ئانقەست، لە قەستی، هەڵە لە ڕووی ئاگادارییەوە. ف عمدا

**دەسیاو**: دەستخۆشانە، پاداشی کاری جوان. ف انعام

**دەشپوول:** پێشی شووشەی ماشێن، جەعبەی بەردەمی شۆفیر.ف داشبرد

**دەغـەز:** ) وەرهـەم، گریمانـەی سـەر دڵ؛ ) رق، قین.ف ) ورم؛ ) کینه

**دەغـەزدار:** وەرهـەم هـەڵێناو؛ ) رق لـە زگ.ف ) ورم کرده؛ ) کینه‌توز

**دەغـەڵکار:** گزیکار.ف کسی کـه وجدان کاری ندارد

**دەفرێکەوە چوون:** ☜ دەکورێکەوە چوون

**دەڤن:** لووت، کەپۆ.ف بینی

**دەفە:** (+) کەرکیت، خەپە، ئامرازی کوتانی پۆی فـەرش لـە تـەونـدا، هـەپـە، هـەپـک.ف شـانەی پودکوبی در فرشبافی

**دەقن:** قورِ و زیلاقە، باتڵاق، زۆنگ. *(لەو دەقنـەدا کەوشەکانم بەجێما.)* ف باتلاق

**دەقـودۆغر:** قسـەی راسـت و تـەواو، راسـت و بێپەردە قسە کردن. *(ڕووداوەکەم دقودۆغر بۆ گێڕایەوە.)* ف حرف رک و پوست‌کنده

**دەکودەهو:** فێڵ و تەڵەکە، فروفێڵ، گزە.ف کلک.

**دەکورێکەوە چوون:** سڵەمینەوە *(کە چاوی پێمان کەوت دەکورێکەوە چوو.)* ف رم کردن

**دەگـەڵـە:** کـەپـەنکی لـە بـەرە دروسـت کـراو.ف پالاپوش درست شده از گلیم

**دەلا:** هـــەڵمـــاتی گـــەورە، مـــەرمـــەڕی زەلام، دووقامکە.ف تیله‌ی بزرگ

**دەلان:** ناودەلان، پلەی پەیژە.ف پله‌ی نردبان

**دەلانـە:** پلـەی نیردیـوان، پلـەی پـەیـژە.ف پلـه‌ی نردبان

**دەلدەلەکانێ:** هەقلیمەقۆ.ف الاکلنگ

**دەللە:** (+) ئامرازی کون کردنی کراس و بەرگ بـۆ قرتێنـە.ف وسـیله‌ای بـرای سـوراخ کـردن پارچه برای قرته

**دەلم:** دۆڵچە، دەولک، سەتڵی جیر.ف دلو

**دەڵنگـان:** پلـەنـدەر، بـێئـابڕوو، بـێنـامووس، ڕووسیا.ف بی‌آبرو

**دەڵۆ:** ناوی هۆزێکی کوردە.ف نام یک ایل کرد

**دەڵـە:** (+) تـەوەلا، لانـەواز.ف پرنـده‌ای کـه از لانه‌اش بیزار می‌شود

**دەڵـەشڕ:** بە تانە و تـەشـەرەوە بـە کـچ دەڵێن. *(قوڕ بە سەرە بە چوار دڵەشڕەوە چیکا.)* ف کنایه از دختر

**دەڵەمە:** (+) وڵوڵـە، هێلکـەی تێکوڵ نـەکردوو کـە زووتر لە کاتی خۆی مریشک دەیکا.ف تخم‌مرغ بدون پوسته که مرغ زودتر از وقت می‌گذارد

**دەڵەمیز:** کەسێک کە میزی بۆ ڕاناگیرێ و زوو زوو دەیکا بە خۆیدا، میزەڵ.ف کسی کـه بسیار بشاشد و خود را خیس کند

**دەلـین:** ســەرســام بــوون، ســەرســوورمان، واقوڕمان.ف متعجب

**دەم بە قوتەوە گرتن:** ) هیچ نەخواردن، دەم لـە هـیچ نـەدان؛ ) قـسە نـەکـردن، ڕاوەسـتان لـە قسەکردن یان نان خواردن *(ببیرت لە کوێیە ئاوا دەمت بە قوتەوە گرتووە.)* ف ) لب به غذا نزدن؛ ) حرف نزدن

**دەم بـە هـاوار:** کـەسێک کـە هیچـی لـە دەمـدا ڕانـاوەسـتێ، دەم ڕانـەوەسـتاو. *(هێنـدە دەم بە*

*هاوارە بۆئەوە نابێ هیچی لەلا بدرکێنی.)* ف کسی که راز نگهدار نیست

**دەم پان کردنەوە:** بریتی لە پێکەنینی گەوجانە و حیزانە. *(داوەشێی مەگین هەر دەمت پان کەیەوە.)* ف تبسم هیزانه

**دەم تەشی:** بریتی لە دەم باریکی زۆربڵێ، دەم تیژ و چەنەوەر. ف دهن باریک وراج

**دەم چەپڵە:** دەم شڕ، زۆربڵێ، زۆر وێژی قسە پیس. ف وراج

**دەم چـەورکـردن:** دەم شـیرینکـردن، سـمێڵ چەورکردن، بریتی لە بەرتیل پێدان. ف کنایە از رشوە دادن

**دەم کردنەوە:** پێشکەش کردنی مەڕ یان بزن لە لایەن خەزوورەوە بۆ بووکەکەی بۆئەوەی قسە بکـا. *(مـەڕێکـم پێـدا دەمـی بکاتـەوە دوو مـەڕی دەدەمـێ بیبـەسـتێتەوە.)* ف هدیـەای از طـرف پدرشوهر برای عروس که شروع کند بـه حرف زدن با پدرشوهرش.

**دەم گـاوس:** بریتـی لـە دەم زل، *(دەمـی دەڵێـی گاوسە/ لە عالەمێ ئاوسە.)* ف کنایـه از آدم دهـن گنده

**دەم گەنیگ:** زار بۆگەن، دەم بۆگەن. ف کسی که دهنش بو میدهد

**دەم گیرفان:** کەنارەیەکی پارچەیە کە بە قەراغی زارکی گیرفانی پاتۆڵیدا دەدروون. ف نواری که دور دهنەی جیب شلوار میدوزند

**دەم لـە پـووش:** ناهومێـد، ناکـام، بـەئـاوات نـەگەیشتوو. *(لـە ژیانێ دەمێنـەوە کـە چووشـن/ بێچارە بەجارێ دەم لـە پووشـن «مـەم و زین».)* ف ناامید

**دەم لـە جـەرگ نـان:** بریتـی لـە زۆربڵـەیـی و مـزاحیم بـوونی زۆر، چـەقـەسـرۆیی زۆر کـە دەبێتـە هـۆی ئـازاری گـوێگران. *(دوو سـەعاتـە دەمی ناوەتە جەرگم. هەر دەیرێسێ و دەمی شل نابێ.)* ف کنایه از وراجی زیاد

**دەم لە دەم نـان:** شـەڕە دەنـدووکێ *(کـوڕە دەم مەنێ دەمی ئەو هەرزەیە.)* ف دهن به دهن شدن

**دەم لەسەر پشت:** ☜ دەم لەسەر قنگ

**دەم لەسەر قنگ:** دەم لەسەر پشت، هـەڵبڕین و وەدوا کەوتن. *(دەم لەسەر قنگ لەولاوە هێنای.)* ف دنبال کردن

**دەم مردوولـــە:** ) منـــداڵێک یـــان بـــەرخ و کاژیلەیـەکی کە ناتوانێ و هێزی مژینی دایکی نییـە؛ ) کـەسێک کـە زۆر شـەرمێونـە و نـازانێ قسە بکا ) بچەای کـه نمیتواند پستان مـادر را بمکد؛ ) کسێ که نمیتواند حرف بزند

**دەم هەپک:** دەمەوەر، چەنەوەر، چەقەسرۆ، دەم هەراش. ف وراج

**دەم هێنانە پێشێ:** بریتی لە خۆ تێ هەڵقووتاندن و قسە کردن. *(تۆ چکارەی ئـەوەنـدە دەم دێنییـە پێشێ؟)* ف مداخله کردن

**دەمار فرۆش:** بە پۆز و هـەوا، بادیهـەوا، بـەفیز. ف متکبر

**دەمباریک:** جۆرێک ئامووردەستی نووک باریکە ف دمباریک

**دەمبڕ:** گۆترە، گۆترمـە. *(هـەر دەمبڕ بیڵـێ بزانم*

*نەزەری چەندت هەیە.)* ف تخمین بدون اندازەگیری

**دەمبزێو:** بریتی لە کەسێک کە دەمی ڕاناوەستێ و قسە دەکا، دەمچەپڵە. ف وراج، پرگو

**دەمبۆر:** ناوی تیرەیەکە لە هۆزی مامەش. ف نام طایفەای در ایل مامش

**دەمبەڵ:** دمەڵ، کوان، قونێر، دەمەڵ. ف دمل

**دەمپەڵوولە:** قسە نەزان و گێژوولکە، کەسێک کە ددانی لە دەمدا نییە و قسەی بۆ نایە. ف کنایە از کسی کە حرف زدن بلد نیست

**دەمحیز:** کەسێک کە هەمیشە قسەی سووکی لەسەر دەمە و بەدەم ئەم و ئەوەوە پێدەکەنێ. ف کسی کە همواره می‌خندد و حرف زشت می‌زند

**دەمدەمان کردن:** دەم لەنێو دەم نان بۆ ماچ کردن. *(دەمەکت بێنە دەمدەمانی کەم/ دەم و ساحەب دەم بە قوربانی کەم.)* ف دهن در دهن گذاشتن

**دەمڕووت:** بریتی لە لاوی موو لێ نەهاتوو، لووسکە، هەرزە. ف کنایە از جوان

**دەمڕەش:** کەسێ کە قسەی باش ناکا و شوومی باش نییە. ف کسی کە گفتارش شوم باشد

**دەمسارد:** (+) تاجییەک کە کەروێشکی بۆ هەڵناگیرێ بیهێنێتەوە بۆلای ڕاوچی. ف تازی کە نمی‌تواند شکارش را بردارد

**دەمسپی:** کەسێک کە قسەی جوان دەکا و قازانجی خەڵکی تێدایە. ف حرف آدم خیرخواه

**دەمشڕ:** ) جنێوفرۆش؛ ) کەسێک کە قسەی لە دەمدا ڕاناوەستێ. ف ) بد زبان؛ ) دهن لق

**دەمقڕە:** دەمە قاڵێ، شەڕە دەندووکە. ف جدال لفظی

**دەمقورس:** ڕاز هەڵگر، کەسێک کە ڕازی کەس ئاشکرا ناکا. ف رازدار

**دەمکوت بوون:** بێدەنگ بوون، مت بوون. ف ساکت شدن

**دەمکوڵ:** دەم قوڵە، دەم بچکۆلانە. *(شەوە لەو سەوزەزارە لەو دەم ئاوە/ مەکۆی خەم لاچووە دەمکوڵ چماوە؟/ مەکەو لاچۆ دەمانبینن بیانوون/ بەیانە دەم بنێ دەم، دەم نەماوە «هەژار».)* ف کوچک دهان

**دەمکون:** بریتی لە کەسێک کە ددانی پێشەوەی کەوتبێ. ف کنایە از کسی کە دندان نیشش افتادە باشد

**دەمگۆ:** واتەوات، دەنگۆ. ف شایعە

**دەمە تێخەڵە:** دەمی چەقۆی دەسک شکاو. ف چاقوی دستە شکستە

**دەمە دەمە:** دەم بە دەمە، کێشە و هەرا، شەڕە دەندووکە، دەم لە دەم نان. ف جدال لفظی

**دەمەچێشتە:** چەشەخواردوو، دانەخۆرە. *(دەمەچێشتە بووە دەست هەڵناگرێ.)* ف چشتەخوار

**دەمەداس:** لەتکی تیغی داس کە پەڕیبێ. ف تیغ شکستەی داس

**دەمەدۆ:** ئاژەڵێک کە ڕایگرن بۆ شیرەکەی. *(مانگایەکیان هەیە بۆ دەمەدۆ.)* ف نگهداری گاو

ماده برای استفاده شخصی از شیرش

**دەمەژەنی:** چێژکردن، چێشتن *(دەمەژەنی چێشتەکە بکە بزانە خوێی چۆنە.)* ف چشیدن از غذا برای امتحان نمک

**دەمهەلار:** دەمهەراش، دەمەوەر، چەنەوەر، زۆربڵێ، چەقەسرۆ. ف پرگو

**دەندووک بێڵە:** باڵدارێکی بەقەد لەکلەکە سەری دەنووکی پانە لە تەنکاوان ماسی و بۆق دەگرێ. ف نام مرغی ماهیخوار

**دەندووک قاژوویی:** جۆرێ گوێزی درێژۆکەیە کاکڵەکەی باش دەرنایە. ف نوعی گردو

**دەندەلووشک:** قنگەلاشک، قانگەلاشک، دڕووی وشکی کنگر. ف خار کنگر

**دەنگ داگۆڕین:** نێوان تێک چوون، بەین ناخۆش بوون. *(لەسەر هیچ و خۆڕایی دەنگی لێ داگۆڕیوم.)* ف قهر کردن

**دەنگ لە تێرییەوە هاتن:** ☜ دەنگ لەجێی گەرمەوە هاتن

**دەنگ لەجێی گەرمەوە هاتن:** بریتی لە قسە کردنی نەترسانە و بە کەسێک پشت گەرم بوون، بریتی لە قسە کردن لە ڕووی بێنیازییەوە. ف کنایە از کسی کە از روی بی‌نیازی حرف می‌زند

**دەنێوەوە چوون:** بە ساڵا چوون، بە تەمەن، گەڕاوە. ف سالخوردە

**دەوام:** ) ماوە، مۆڵەت *(خودا دەوامت نەدا.)* ؛ ) ئیش، کار، کاری ئیداری *(ئەمڕۆ دەوامم هەیە ناتوانم بێم.)* ف ) فرصت؛ ) کار اداری

**دەور:** (+) ڕۆڵ، نەخش لە فیلم و شانۆدا. ف نقش

**دەوردان:** پاک کردنەوە و کوژاندنەوەی سیایی. *(ئەوەش قەرزەکەت لە دەفتەرەکەدا دەوری دە لە بیرت نەچێ.)* ف پاک کردن

**دەورگێڕ:** ئەکتەر، کەسێک کە لە فیلم و شانۆدا یاری دەکا. ف بازیگر

**دەورێش بالیکخوەر:** تاجیلۆکە، تاژیلۆکە، ئەسپی ئەحمەد ڕاوکەر، حوشتر خوا، بالووک. ف آخوندک

**دەورێش چوینە:** ☜ دەورێش بالیکخوەر. ف آخوندک

**دەوسیە:** پەروەندە. ف پروندە

**دەولک:** دەڤلک، سەتڵی ئاو هەڵگوێستن. سەتڵی جیر بۆ ئاو هەڵکێشان لە بیر. ف دلو

**دەوە دەوە:** گەمەیەکە بە دار و هەلووک دەکرێ، ڕتاندن. ف بازی الک دولک

**دەوەک:** کەفی سەر دۆ لە مەشکەدا کە دەبێتە کەرە. ف کف دوغ

**دێ نەگەیی دووکەڵ گەیی:** بریتی لە سەرهەڵدانی شتێکی ناوەخت و نابەجێ. ف کنایە از آمدن چیزی نابەهنگام

**دێبوکری:** دێموکری. ف ☜ دێموکری

**دیدار ئاخر بوون:** بە ئاوات نەگەیشتن و نەدیتنی نەخۆش لە کاتی مردندا *(چەندەی ویست کوڕەکەی ببینێ ئاخری نەهاتەوە و دیدار ئاخر بوون.)* ف مردن و از دیدار عزیزان محروم شدن

**دێراو هەڵدان:** دروست کردنی دێراو بە

کەردووکێش بۆ شووتی و خەیار و تەماتە و ...
ف درست کردن جوی با گراز برای کاشتن هندوانه و خیار و گوجەفرنگی و ...

**دێرۆ**: گیایەکە وەک مۆسک وایە گوڵی زەردە.
ف نام گلی است

**دێرۆغە**: دێراو پڕ کردن لە ئاو و شکاندنی بۆ دێراوەکانی دیکە، دێرۆخە.ف جوی ماننده که برای جالیز درست می‌کنند و از آب پر می‌کنند

**دێـرە**: فیستان، کراسی ژنانەی کوردستانی ژوورووکە لە پارچەی ڕەنگاوڕەنگ دەیدروون.
ف پیراهن زنانه

**دێرەدۆخ**: ☜ دێرەدۆغ

**دێرەدۆغ**: ☜ دێرۆغە

**دێرەوان**: پاسەوان، کێشکچی.ف نگهبان

**دێرەوانی**: پاسەوانی، کێشکێتچی.ف نگهبانی

**دێزپـا**: سێ کوچکە، سێ بەردەی کوچکاور، کوانوو.ف اجاق سنگی

**دیزە بەدەرخۆنە پێکردن**: شاردنەوەی باسێک، پۆشینی ڕاز و نهێنی. *(ئەو قسەیە هەر لێرە دیزە بەدەرخۆنە پێ‌دەکەین.)* ف پوشیدن راز

**دیزە لە دوو شکاندن**: بریتی لە دەر کردن و تەرە کردنی ملۆزم بە یەکجاری.ف کنایە از راندن مزاحم برای همیشه

**دێزەڵ**: دێزیل، گیایەکە لەنێو بێستاندا شین دەبێ گوڵی سپی دەر دەکا و گەڵای پەنجەیییە.
ف اسم گیاهی است

**دێزیل**: دێزەڵ.ف گیاهی است

**دێژلەمە**: دیشلەمە، شیلامە، چای تاڵ بە قەندی کڵۆوە.ف چای قندپهلو

**دێسپا**: ☜ دێزپا

**دیـقدیقـانێ**: سەرەتاتکێ، سەرکێشان بە دزییەوە.ف دزدکی نگا کردن

**دێگونەچارێ**: ناوی کچێکە لە حەقایەتی فۆلکلۆردا زرداییکی زۆری ئازار دەدا و ناهێڵێ خوازبێنی کەر چاویان پێی بکەوێ لەجیاتی زرکچەکەی، کچەکەی خۆی پیشان خوازبێنیکەران دەدا. بۆیە کچەکەی خۆی گونێک لە چەنەی دێتە دەرێ و کێرێک لەنێو چاوانی و ناوی دەنێن دێگونەچارێ.ف نام دختری در افسانەای به این نام.

**دیـلاڤ**: ڕێژگەی چۆم، شوێنێک کە ئاو بە غورەم دەڕژێتە ڕووبارەوە.ف جایی که آب به رودخانه می‌ریزد

**دیلدیلە**: شات، دارێکە تەگەرێکی چکۆلەی پێوە دەلکێنن منداڵ کایەی پێ‌دەکا.

**دیلوان**: دەرزیی لێفەدوورین، دەرزی تەبەنە.ف سوزن لحاف‌دوزی

**دێم**: (+) ڕوو، ڕووخسار، ئەدگار.ف چهره

**دێموکری**: ناوی هۆزێکی کوردە.ف نام یک ایل کرد

**دیوارێن**: یارییەکی منداڵانەیە بە درزیلە دەیکەن. دوو کەس یەکی درزیلەیەک بەدەستەوە دەگرن و یەکەم کەس بە دیوارەکەیدا دەدا و دەکشێتەوە، کەسی دووهەمیش بە دیوارەکەیدا دەدا ئەگەر بە ئەندازەی بستێک لە درزیلەی یەکەم کەس نزیک بۆوە دەرزیلەکە هەڵدەگرێ

بۆ خۆی و بۆ درێژەی کایەکە دەبێ ئەوەی دۆڕاندوویە دەرزیلەیەکی دیکە بێنێ.ف نام یک بازی کودکان

**دێوتەرم**: ئاوگەرمکەر.ف آبگرمکن

**دێوڵکە**: گێژەڵووکە، گەردەلوول، دێوەڵووکە، سایکلۆن، باگەڕ، باهۆز.ف گردباد

**دیوناس**: ناسیاو، شناس، ئاشنا، ناسراو.ف آشنا

**دێوەرژەنگ**: دێوەرژەن، قورم و تۆزی بە میچەوە نووساو.ف دود و غبار غلیظ

**دێوەشەلە**: ئەو ئەستێرەی کە لەو شەش ئەستێرەکەی تری حەو برالە گەورەترە.ف ستارەای که از دیگر ستارەهای هفت برادران بزرگتر است

**دێوەڵووکە**: (+) گێژەڵووکە، گەژگەڕینک، باگەڕ، سایکلۆن، گەردەلوول، باهۆز، زەمەن.ف گردباد



**ڕابینۆک:** جۆلانێ، هێزۆک، هۆرک، هەلۆرتک، دنگلاف.[ف] تاب

**ڕاپسکووتن:** تێهەڵبوون، وەسەر کەوتن *(رستە مەرەز لە قولێدا/ ڕاپسکووتن بە دۆڵێدا «ڕاوچی».)* [ف] بالا رفتن از تپه

**ڕاپێچەک دان:** ڕەپێچەک دان، ڕامالین. *(شوانە مەڕەکانی بەرەو ماڵێ ڕاپێچەک دا.)* [ف] با شتاب راندن و بردن

**ڕاتۆڵ:** گەڕۆک، گەڕاڵ، گەڕیدە.[ف] سیاح

**ڕاجفرین:** ڕاچەنین، داچڵەکین، ڕاپەڕین، راجفلین.[ف] یکه خوردن

**ڕادار:** (+) دەکەلی بنێری هەواڵ و ڕاگەیاندن و بینینی تەیارە و ...[ف] رادار

**ڕاداشتن:** (+) گرتنی چرا بۆ کەسێک لە تاریکیدا. *(چراکەم بۆ ڕادێرە تا لەو قوولکانە دەپەڕمەوە.)* [ف] گرفتن چراغ برای کسی در تاریکی

**ڕادبە:** راتبە، خڕکردنەوەی نانی فەقێ و سوختە.[ف] جمع کردن غذای طلبه

**ڕاژەوان:** ) خزمەتکار، نۆکەری نێومال؛ ) ڕاڤەوان، لێکۆڵەر، شرۆڤەکار.[ف] ) مستخدم؛ ) مفسر

**ڕاسان:** (+) هەستان، ڕاپەڕین *(هەژاران دژی زۆرداران ڕاسان.)* [ف] قیام

**ڕاساو:** ڕاپەڕیو، هەستاو.[ف] قیام‌کرده

**ڕاستاوێژ:** جوانەگایەک کە لەگەل گایەک بە ئامووری بێگاسن جووتی پێدەکەن بۆئەوەی ڕابێ و بۆ بەهاری ساڵی داهاتوو فێری جووتکردن بێ.[ف] گاوی که با خیشی بدون گاوآهن برای شخم زدن آماده می‌کنند.

**ڕافزی:** بێحەیا، بێئابڕۆ، کارخانچی.[ف] بی‌آبرو

**ڕافە:** چارەنووس، کەسێک کە دەبێتە هۆی ئاشنایەتیی دوو بنەماڵە و زەماوەند کردنی کچ و کوڕیان.[ف] کسی کە موجب آشنایی دو خانواده می‌شود برای ازدواج پسر و دخترشان

**ڕاڤەوان:** ڕاڤەکار، ڕاژەوان، شیکەرەوە، لێکۆڵەر، شرۆڤەکەر[ف] مفسر، شرح دهنده

**ڕاقەنان:** سەرنگوون، کەلەواژ بوونەوە، سەرەونخوون.[ف] سرنگون

**ڕانەبێرە:** مەڕەبێرە ☜ دانەبێرە

**ڕانەر:** خولقێنەر، بەدیهێنەر *(دەتهەوێ چاوی لە*

*تۆ بێ ڕانەری چاو و سەرت/ پاشی مردن پڕ بەدڵ بێ دێبەری بەرگ و بەرت «ڕاوچی».)* ف. *خالق، آفریننده.*

**ڕاوڕاوان:** هەلاتهەلات، هەڵبڕدابڕ. ف تعقیب و گریز

**ڕاوڕاوێن:** ☜ ڕاوراوان.

**ڕاوە هەردی:** جۆرێ ڕاوە کەوە لە زستاندا دەکرێ و ئەو کەوانەی گەرمێن و کوێستان ناکەن، زستانان ڕاوچی ڕاویان دەکەن. ف شکار کبک در زمستان

**ڕاوەبار:** ڕاوە کەوی کاتی گەورە بوونی بارەکەو، ئاخری هاوین. ف شکار کبک در آخر تابستان

**ڕاوێژ:** تێلێکی درکدار و کون کونە لە بنمیچی داری دەدەن و بە گەچ سپیکاریی دەکەن بۆئەوەی داری بنمیچەکە بە دەرەوە نەبێ. ف راویز

**ڕپشێلە:** فێڵ، تەڵەکە، گزی. ف حیله

**ڕزگاریخواز:** ئازادیخواز، لایەنگری ڕزگاری. ف آزادیخواه

**ڕزگاریخواز:** هەواداری ئازادی. ف آزادیخواه

**ڕژد:** گاسنێک کە نووکەکەی قیت دەکەنەوە بۆئەوەی زیاتر عەرز بدڕێ، ئەگەر بشیانهەوێ زۆر عەرزەکە نەدڕێ و گایەکان زۆر ماندوو نەبن مالی دەکەن. *(گاسنەکە مالە تۆزێ ڕژدی کە.)* ف بلند کردن نوک گاوآهن برای اینکه بیشتر به زمین فرو رود

**ڕشوەت:** ڕشڤەت، بەرتیل، پارەیەک کە کاربەدەست بۆ ڕیک خستنی کارێک بە ناڕەوا دەیستێنێ. ف رشوه

**ڕفێن ڕفێن:** فران فران، هەر کەس بەشی خۆی هەلگرێ و بیرفێنێ. *(ئەوو بە ڕفێن ڕفێنێک بەجارێ تاپۆیان کرد.)* ف ربودن دستەجمعی

**ڕقات:** ڕیز، لە پاڵ یەک چنداو، جەاللە کراو. ف ردیف

**ڕقە:** گوڕڕە، ملە، کێبەرکێ، ململانێ. ف رقابت

**ڕقەبەرایەتی:** ڕقەبەری، ڕقە. ف رقابت

**ڕقیف:** ڕفێق، هەواڵ، دۆست، هەڤاڵ، هاوڕێ. ف رفیق

**ڕک:** ڕەگ، بێخ، ڕیشە. ف ریشه گیاه

**ڕمبازێن:** هەلاتن و هەلبەزدابەز، بۆ ئەسپسواریش دەگوترێ. ف بالا و پایین پریدن

**ڕمووسک:** گیایەکە لە مێرگدا شین دەبێ و لاسقەکەی دەخورێ، ڕیمۆسک، مۆسک. ف نام گیاهی است

**ڕمهەرکێر:** بەراز، یەکانە. ف گراز

**ڕندۆڵ:** کەندر، ئاودڕ، شیوی بە ئاوی لافاو دروست بوو. ف آبکند

**ڕۆح لەفەندی:** جۆرێ کراسی ژنانەی قەدیم بوو. ف نوعی پیراهن زنانه در قدیم

**ڕوح:**(+) ڕوو. ف روی

**ڕۆح:** (+) ڕوو، ڕۆح فافۆن. کانزایەکە کتری و قاپ و کەوچک و دیزەی لێ دروست دەکەن. ف روی

**ڕۆحسووک:** گوێڕادێر، نادەغەڵ. *(ئەوەندە کوڕێکی ڕۆحسووکە هەر کارێکی پێ بڵێی بەدڵ*

*ئەنجامی دەدا.)* ف سبکروح

**ڕوحم تلیسانەوە:** بریتی لە بزووتنی ڕەحم و بەزەیی، دەربڕینی خۆشەویستی. *(خودا بە خێری بگێڕێ سەیر ڕوحمەکەی بۆمان تلیساوەتەوە.)* ف اظهار مهر و دوستی

**ڕوحم سارد بوونەوە:** بێمەیل بوون، مەیل سارد بوونەوە *(بۆوا ڕوحمەکەت سارد بۆتەوە.)* ف کم شدن ترحم

**ڕوحم:** بەزەیی. ف رحم

**ڕۆژان:** ناوی کچانە ف نام دخترانه

**ڕۆژە ڕەشەکە:** گرانی، بریتی لە دامان و موحتاج بوونی زۆر. *(وەک ڕۆژە ڕەشەکە دامابووم بۆ لەتێ نان.)* ف کنایه از گرسنگی و احتیاج

**ڕۆژەڤ:** چۆنیەتی و باروودۆخی ڕۆژ، ڕووداوگەلی باوی ڕۆژ ف رخدادهای روز

**ڕۆژین:** ) وەک ڕۆژ ڕووناک؛ ) ناوی کچانە

**ڕۆسەکنان:** داسەکنان، سرەوتن، داساکین، داسرەوین. ف آرام گرفتن

**ڕوقیسۆر:** ڕیخۆڵە. ف روده

**ڕۆڵ:** دەور، نەخش. ف نقش

**ڕۆمان:** چیرۆکی درێژ، چیرۆکی خەیاڵی کە بە شێوەی پەخشان و هۆنراوە دەنووسرێ. ف رمان

**ڕوممە:** ڕاوکە، ڕامکە، هێلکە یان بەردێکی خڕی سپی کە لە کولانەی مریشکی دادەنێن بۆئەوەی هێلکەی لەسەر بکا. ف تخم‌مرغ یا سنگ سفیدی که در لانه‌ی مرغ می‌گذارند تا مرغ را تحریک به تخم‌گذاری کند

**ڕۆندە:** (+) جاڕ. زەویی نەکێڵدراو، بەیار. ف بایر

**ڕوو:** ڕۆح، فافۆن، ڕوح، *(پارچە گۆشتێکە دڵی من ڕوو نییە/ ناڵە ناڵی من درەنگە زوو نییە «هێمن»)* ف روی.

**ڕووباد:** ئەو ماکەوەی لە ڕکەدا دایدەنێن و داوی لە دەور دەنێنەوە و ڕاوی کەویتری پێدەکەن. ف کبکی که برای شکار کبکهای دیگر از او استفاده می‌شود

**ڕووبەر:** (+) ڕووکار. ف سطح

**ڕووبەستە:** ڕوو داپۆشراو، ئافرەتی بەئەدەب و نەجیم. ف رو پوشیده

**ڕووسارد:** (+) بێناز، لارەمل. *(کچی بێچارە هەتا لە ماڵە بابیشییەتی هەر ڕووساردە.)* ف گردن کج

**ڕووسڵ:** شەرمن، شەرمێون، فرێت *(ماست فرۆش کچی جوان و ڕووسڵم/ ماست فرۆش ماستت ئاوێتەی دڵم «گۆرانی»)* ف خجالتی

**ڕووسووری:** خوێنی نیشانەی کچ بوون کە بە خامێکی سپییەوە لە ماڵی زاواوە دەنێردرێتەوە بۆ ماڵی باوکی بووک. ف خون بکارت

**ڕووش هەڵاتن:** توورە بوونی پشیلە و مراندنی. ف عصبانی شدن گربه وآماده شدن برای حمله.

**ڕووناخۆش:** مرومۆچ، ڕووگرژ، نێوچاوان تاڵ. ف اخمو

**ڕووناکبیر:** ڕۆشنبیر، زانا و خوێندەوار. ف روشنفکر

**ڕووە:** بارانی توند بە باوە، لەنگێزە. ف باران شدید همراه با باد

**ڕویتق**: جیقنە، ڕیقنە. ف فضلەی پرندگان

**ڕهـ** : ) ڕەگ، دەمار *(ڕەمێن پشتاوی کێشان.)* ؛ ) ڕیشە، بێخ *(ڕەمێن دار توییا کویر دەچنە خوار.)* ف ) رگ؛ ) ریشە

**ڕەبادان**: نقورچک لێگرتن. ف نیشگون

**ڕەپاوڕوو**: بەرەوڕوو، ڕووبەڕوو. ف روبرو

**ڕەپبوون**: بریتی لە زۆر ماندوو بوون، لەکار کەوتن لەبەر هیلاکی زۆر *(لەبەر ماندوویەتی ڕەپ بووە.)* ف گنایە از خستگی شدید

**ڕەپکە**: گەنم و جۆی کە لە شوێنی خیزەڵان دەچێندرێ و کەم بەرز دەبێتەوە و زوو پێدەگا و بەرهەمی کەمە. ف گندم و جو کاشتە شدە در زمین شنزار

**ڕەپەڕەپ**: خۆ قیت کردنەوە و بە هەوا بوون، فیز و دەمار و خۆنواندن، *(بە کەر ناوێرێ بە کورتان ڕەپەڕەپییەتی.)* ف غرور و خودنمایی

**ڕەپێ بوون**: هەستانە سەرپێ، کێل بوونەوە. ف بەپا خواستن

**ڕەپێ نان**: هەڵبرین، دواکەوتن *(سەفا خزا لە هۆدەی سر و کر و بەسامم/ پەریی ڕووناکی مۆتەی ڕەشی شەوی ڕەپێ نا «ئەمین گەردیگلانی».)* ف دنبال کردن

**ڕەپێچەک دان**: ☜ ڕاپێچەک دان

**ڕەتەڵ بردن**: هەڵەنگووتن، سەرسم دان، هەڵکەوتن. ف سکندری

**ڕەتەڵدان**: هەڵەنگووتن، لەتردان. ف سکندری

**ڕەجم**: بەردباران، سەنگەسار، کوچکواران. *(بۆ فریشتەی داد بە سینەی پڕ لە کینە و داخەوە/ هاتە کوردستان گوتی ڕەجمی شەیاتینم دەوێ «هێمن».)* ف رجم

**ڕەچڵەخۆر**: کرمی *ریشە قرتێن، ترترە.* ف کرم ریشە خوار.

**ڕەحەتەڵقوم**: شیرینییەکی نەرم و ڕەنگاوڕەنگە بە شەکر و نیشاستە دروستی دەکەن. ف نوعی شیرینی کە با نشاستە و ژلە و آرد درست میکنند.

**ڕەحێف**: لێفە، ئۆرغان. ف لحاف

**ڕەختاوێز**: ئەو تەختەی کە قتیکە و قولاپی پێوەیە و جلوبەرگی پێوە هەڵدەواسن. ف رختآویز

**ڕەخیزە**: گیایەکە وەکوو گوێی بنجی هەیە بەڵام دڕووی نییە. ف نام گیاهی است

**ڕەزاسووک**: خوێنشیرین، لەبەردڵان، سەحەت سووک. ف سبک روح

**ڕەزاڵ بەڕەزاڵ**: هەلاهەلا و لەبەریەک چوو *(مار پێوەی دا و ڕەزاڵ بە ڕەزاڵی کرد)* ف لهیدە و از هم پاشیدە

**ڕەزیانە**: ڕێزیانە، گیایەکی دەرمانییە بۆ زگئێشە دەبێ. *(هو کاکی جووتیار جووتت شەنگوڵ بێ/ تۆوت ڕەزیانە خەرمانت گوڵ بێ.)* ف رازیانە

**ڕەسمچی**: وێنەگر، نیگارکێش ف نقاش

**ڕەشبەڵەک**: (+) خاڵبەڵەک، ڕەشانگی کوێستان *(کوێستان ڕەشبەڵەک بووە.)* ف خالخال شدن کوهستان.

**ڕەش ڕاهاتن**: ون بوون، بزر بوون، لەپڕ

لەبەرچاو ون بوون *(هەر ئێستا کتێبەکەم لێرە دانا نازانم کوێرا ڕەش ڕاهات.)* ف گم شدن

**ڕەش و شین بوونەوە:** بریتی لە گریانی زۆر *(منداڵەکە هێندە گریاوە ڕەش و شین بۆتەوە.)* ف کنایه از گریەکردن زیاد

**ڕەشئەسمەر:** سەوزە، ڕەشتاڵە، ئەسمەرە.ف سبزەی گندمرنگ

**ڕەشچیڤک:** ڕەشچێڵەک، سێروو، گاوانی، ڕیشۆڵە، ف سارسیاه

**ڕەشچێڵەک:** سێروو، ڕیشۆڵە، گاوانی.ف سارسیاه

**ڕەشکوژ:** (+) تاجییەک کە لە ڕەشایی و شێوەردیشدا دەگاتە کەروێشک.ف تازی کە خوب می‌دود در خشکی شکار می‌کند

**ڕەشنە:** بەخت، شانس.ف شانس

**ڕەشوڕووت:** (+) بریتی لە خێزانی زۆر و هەژار، ماڵ و منداڵی زۆر و بێ‌ئەنوا. *(ئەو هەموو ڕەشوڕووتە بەچی تێر دەکا.)* ف خانوادە زیاد و بینوا و تهیدست.

**ڕەشە چنار:** پەلک، جۆرێ داری چنارە.ف نوعی درخت چنار

**ڕەشە هەرمێ:** ☜ هەرمێ ڕەشە

**ڕەشەبی:** بیڕەشە.ف بیدمشک

**ڕەشەکەوتە:** لاڕەشە، سیازاخ. *(ڕەبی ڕەشەکەوتە گری.)* ف سیاەزخم

**ڕەشەگوێنی:** جۆرێک گوێنییە ڕەنگی لاسق و دڕووەکانی ڕەشە.ف نوعی گون

**ڕەشیمشی:** شەولەبان، ئاشەگوێرێژ، ناوی شتێکی نەبووی خەیاڵییە منداڵی پێ‌دەترسێنن *(نەگریی ڕەشیمشی بۆت دێ)*، *(بێ‌دەنگبە شەولەبان هات)*، *(دانیشە گوێرێژ دەبەن بۆ ئاشی.)* ف موجودی خیالی برای ترساندن بچە.

**ڕەعەمەل هاتن:** بەرهەم هاتن، بەکار هاتن *(حاسڵەکەم بۆ ڕەعەمەل نایە.)* ف برداشت حاصل کشاورزی

**ڕەعەمەل هێنان:** بەرهەم هێنان، بەکار هێنان.ف بەنتیجە رسانیدن

**ڕەڤیڤان:** مەیتەر، سیەس، خزمەتکاری ئەسپ.ف مهتر

**ڕەقیتە:** (+) ) قەتماخە، ڕەقبوونی خوێن بەسەر برینەوە؛ ) ڕەقبوونی سەرقۆڵ و ملیوانەی کراس لەبەر چڵکنی.ف ) خون خشکیدە؛ ) سفت شدن لباس براثر چرک

**ڕەکە:** هەوراز، سەرەوژووری. *(بە مانکە مانک لەو ڕەکە وەسەر کەوتین.)* ف سربالایی

**ڕەگاژۆ:** ☜ ڕیشاژۆ

**ڕەگژی:** ) ڕەچەڵەک، ڕەگەز ) ڕیشە، ڕەگ، بێخ. ف ) نژاد ) ریشە

**ڕەگەز:** (+) بنەما، ئەسڵی شتێک.ف عنصر

**ڕەگەما:** ڕەگەز، تیرە، نەژاد *(هەردوو لە ڕەگەمایەکن.)* ف نژاد

**ڕەگی گونمردن:** لە پیاوەتی کەوتن، وشکاو هاتن *(ڕەگی گونی مردووە داوای ژنیش دەکا.)* ف اقیم شدە

**ڕەمانە:** جۆرێ دانەوێڵەی خۆماڵی کراوە وەک هەرزن و دێمیلە نانی لێ دێ.ف دانەی مانند

ارزن که برای نان مورد استفاده است.

**ڕەمـۆک:** سـڵ، قوشـقی، سـڵۆک، سـرک، تـۆڕ، ڕەوەک.ف رموک

**ڕەن:** (+) زەوی گـوێ چـۆم کـە کشتوکاڵی تێدا دەکەن.ف زمین حاصلخیز کنار رودخانه.

**ڕەنج بەخەسار:** ڕەنجەڕۆ، ڕەنج بەبا.ف رنج بر باد رفته

**ڕەنـج بـەزایـەچـوون:**ڕەنـج بـەخـەسـار بـوون، ڕەنجەڕۆیی.ف رنج کشیدن بی‌بهره

**ڕەنجـی قالۆنچـە:** بریتـی لـە کـاری بـێ‌هـودە و زەحمەتی خۆڕایی، قالۆنچەی گوگلێنە بە شیاکە گزمووڵـەیـەک دروسـت دەکـا و دوای ئـەوەی ماوەیەک تلی پێدا و زەحمەتێکی زۆری لەگەڵ کێشا بـەجێی دێڵـێ.ف کنایە از زحمت زیاد و بیهوده

**ڕەندی:**ناوی هەڵپەڕکێیەکی کوردییە.ف نام یک رقص کردی.

**ڕەنـگ هـەڵبڕسـخان:** ڕەنـگ هـەڵبزرکـان، ڕەنگ تێکچوون.ف رنگ باختن

**ڕەنگدانەوە:** (+) شوێن دانانف تاثیر

**ڕەواسە:** ڕێوی، ڕۆڤی، ڕێڤی.ف روباه

**ڕەوان:** (+) ڕەوەوان ☜ ڕەوەوان

**ڕەواندوو:** لایە، چەسپی پارچەیی بۆ نێو یەخـە و سەردەستی کراس.ف آهار چسپی

**ڕەوڕەویلکە:** شێلاقە، مەلێکی تیژ و چالاکی لاق درێـژە لـە قـەراغ چـۆم و ئـاوان دەژی.ف نـام پرندەای است

**ڕەوگە:** ڕێباز، شوێنی هاتوچۆ.ف گذرگاه

**ڕەوگیـر کـردن:** بـە زۆری ئـەسـتاندن، داگیـر کردن.ف بە زور گرفتن

**ڕەوە:** (+) داری درێژی گوێز تـەکاندن.ف چـوب بلند گردو تکاندن

**ڕەوەکی:** گەڕۆکی، لە حاڵی ڕۆیشتندا.ف سیاری

**ڕەوەوان:** ) کەسێک کە ڕەوەی بەدەستەوەیە و دار گـوێز دەتـەکێنـێ ) شـوان، شڤان.ف ) کسی کـە بـا چـوب بلنـد درخـت گـردو را مـی‌تکانـد ) گلەبان

**ڕەهەند:** (+) لا، ئالی، گۆشە.ف بعد

**ڕێ کردن:** سازان، حەوانەوە. *(لەگەڵ کەسدا ڕێ ناکا.)* ف سازگاری

**ڕیـایی کـردن:** مـەرایـی کـردن، ماسـتاو سـارد کردنەوە.ف تملق کردن

**ڕیـایی:** مـەرایی، تـەشـی‌ڕێـسی، کلکەسـووتێ.ف تزویر

**ڕیاییباز:** مەراییکەر، تەشی‌ڕێس.ف متملق

**ڕێبەدێی:** ڕێنوێنی، ڕێنومایی.ف راهنمایی

**ڕیتکـە:**(+) نـامیزان بـوونی تـەقـەڵی مـەکینـەی بـەرگدووری بـە جۆرێـک کـە دەزووەکـە لـە ژێـرەوە کۆ دەبێتـەوە و بـە جـوانی نایـدووری، (مەکینەکەم دوو ڕۆژە ڕیتکە دەکا ناتوانم کاری پێبکەم) ف نامیزان بودن بخیەی چرخ خیاطی کە نخ زیرین جمع می‌شود

**ڕیتـەڵ:** ڕیـوەڵـە، کز، لـەر و لاواز، داڵگۆشـت.ف لاغر و نحیف

**ڕیحال:** زین، جلێکی پشتی ئـەسـپ کـە لـە دار و چەرم دروست دەکرێ.ف زین

**ڕێحانە کێویلە**: گیایەکی بۆنخۆش و خۆڕسکە گەڵاکەی وشک دەکەن و وەک چا دەم دەکرێ و بۆ ژانەزگ کەڵکی لێوەردەگرن.[ف] نام گیاهی

**ڕێخان**: بازەڵێن، توولێن، قاچوو، قەمچان.[ف] یەقول دوقول

**ڕێخشاندن**: لێخستن، پێدا خشاندن.[ف] ساییدن به چیزی

**ڕیخلۆنی**: خیزەڵان، زیخەڵان.[ف] ریگزار

**ڕیخۆڵەدرێژ**: بریتی لە بەسەبر و خۆڕاگر، بەتاقەت[ف] صبور

**ڕیخۆڵەکێش**: بریتی لە ئازا و بەبڕشت، کۆڵنەدەر و ماندوویی نەناس[ف] کنایە از جسور و بااقدام

**ڕیخۆڵەی دوازدە گرێ**: ڕیخۆڵەی بنی گەدە.[ف] رودەی اثنیعشر

**ڕیخەتاڵە**: شیاکەی شلی ماڵات کە بەهاران گیای شین دەخوا و تەڕەکی دەگرێ.[ف] مدفوع شل احشام

**ڕیزپەڕ**: دەگمەن، شاز[ف] نابغه

**ڕێزدار**: بەڕێز، خاوەنڕێز.[ف] محترم

**ڕێزەڵە**: (+) یەسکێکی خڕە لە چۆکی ماڵاتدایە. [ف] استخوانی گرد در زانوی حیوان.

**ڕێزەڵە مارانە** ☜ ڕێزەڵە مارە

**ڕێزەڵەمارە**: ڕێزەڵە مارانە، ترێ مارە، ترێ مارانە.[ف] تاجریزی

**ڕێزیانە**: جۆرێک گیایە تۆوەکەی بۆ زگچوون دەبێ. *(ماڵت پڕ بێ لە ڕێزیانە و منداڵت بە زگئێشە بمرێ!)* [ف] رازیانه

**ڕێژگە**:(+) ئەوشوێنەی کە چۆمەڵ تێکەڵ ڕووباری گەورە دەبێ.شوێنی تێکەڵبوونەوەی دوو چۆم.[ف] محل بەهم پیوستن دو رودخانه

**ڕێژڵە گەوەن**: سوورە گوێنی، سوورە گەوەن.[ف] گون سرخ

**ڕێژنە**: (+) ئاوپاشی حەمام، دۆشی گەرماو.[ف] دوش حمام

**ڕێژوان**: ) ڕێگەی ژوان، ڕێگایەک کە دوو دڵدار پێک دەگەیێنێ؛ ) ناوی کچانە.[ف] ) راه میعادگاه؛ ) نام دخترانه

**ڕێژە**: ) مەشقی نیزامی؛ ) چەن بەرانبەر، ڕادە و داهات. *(ڕێژەی گەنمەکە لەوە زیاتر بوو.)* [ف] ) رژەی نظامی؛ ) اندازه برای محصول

**ڕێژەک**: قالب، دەفرێ کە کانزای توواوەی تێدەکەن بۆئەوەی ببێتە شمش.[ف] ظرف قالببندی شمش

**ڕێژەو**: (+) ڕێژنە، لێزمە، بارانی بە غوڕەم.[ف] رگبار باران

**ڕیس**: ڕووس، ڕووت، بێبەرگ *(ڕیس و بنیس هاتبووە دەرێ.)* [ف] عریان

**ڕێسمە**: گرێژەنە، پاژنەی درگا *(درگاکەیان لە ڕێسمە برد.)* [ف] پاشنەی در

**ڕیش لەبەر گرتن**: بریتی لە تکا لێ کردن و پاڕانەوە لە کەسێک و داوای بەخشین و لێخۆشبوون. *(ئەو عالەمە چوونە لای بۆ تکا و ڕیشیان لەبەر گرت بەڵام کەڵکی نەبوو)* [ف] کنایه از خواهش و تمنا کردن

**ڕیشاژۆ**: ڕەگاژۆ، ڕیشە داکوتان بە هەموو

لایەکدا.ف ریشە دواندن

**ریـــــشکۆ**: ریـــشوو، ریـــشۆک، ریـــشۆکە، هــەڵــوەشــاوی بــادراوی کــەنــاری مێــزەر.ف منگوولە.

**ریشە بزن**: گیایەکە بنێکی وەگ گێزەری هەیە رەنگی سپیە و دەخورێ.ف نام گیاهی خوراکی

**ریشەڵۆک**: بنەچەکە، رەگەز.ف نژاد

**ڕێڤار**: رووبار، چۆم، چەم.ف رودخانە

**ڕێڤـان**: (بـزووتن، جووڵانـەوە( شـارەزای رێگـە، رێناس.ف (حرکت.(راهنمای راه.

**ڕێڤگە**: سەرەتا، هەوەڵ.ف ازل

**ریق**: (+) زگچوون، بەلەفیرە، تەقەفیرە.ف اسهال

**ریقن**: کەسێ کە زۆر زگچوون دەگرێ، فیرن. ف کسی کە زیاد اسهالی میگیرد

**ریقناسە**: قورگ، گەروو، قورقوراچکە، قورووو. ف حلقوم

**ریقۆ**: ☜ ریقن

**ریقە**: ☜ ریقن

**ڕێکڵاو**: کڵاوبنە، قاڵاقنگ، لاسقی گەڵا رێواس.ف ساقەی برگ ریواس

**ڕێکەوتن**: ) ڕەپێ کەوتن، هەڵبڕین، ڕەپێ نـان *(ڕێـی کـەوتـم بـەڵام بـۆم نـەگـیـراوە.)* ) ڕۆیـشتن، وەڕێ کەوتن ف ) دنبال کردن ) بە راە افتادن

**ڕیمۆسک**:گیایەکی بۆنخۆشە لە مێرگ و گوێ جۆگــە دەڕوێ وەک گــەڵای گێـزەر وایــە بــۆ دۆکوڵیو دەبێ.ف گیاهی خوشبو برای آش .

**ڕیمۆڵە**: ڕێشکە و پێشکە، چاو لە ڕەشەوە هاتن. *(چاوم ڕیمۆڵە دەکا و خەریکە بکەوم بە عەرزدا.)* ف سیاهی رفتن چشم

**ڕێناس**: ☜ ڕێڤان

**ڕینجۆ**: گۆج، شەلەل، سەقەت، زرۆپ.ف افلیج

**ڕینگاو**: ئاوی خەستی نیسک و باقلەی کوڵاو ف آب غلیظ عدس و لوبیای پختە شدە

**ڕێـواق**: سـپیایی نـاو خورمـا کـە وەک شـیلەی هەنگوین پێکەوە نووساوە.ف شهد خرما

**ڕێوج**: ڕێواس، نێرتکی باسکڵاو.ف ریواس



**زاخرخانه:** ) +) ) زاخه، کویل، ئاغەڵە مەڕی لە کێو دابڕاو. ) بریتی لە دیوی زۆر سارد. *(ئەم دیوه هێنده سارده دەڵێی زاخرخانەیە.)* ف ) زاغه. ) کنایه از اتاق بسیار سرد.

**زاخه خانه:** ☜ زاخرخانه.

**زاخەکەن:** کەندەسمە، حەوڕەنگیلە، ڕەنگرێژە، مێشخورە. ف نام پرندەای است

**زاخێز:** خیزەڵان، زیخەڵان. ف شنزار

**زاربوغازە:** شەلەگەی دێراو، ئەو شوێنەی ئاوی لێوه دەچێتە نێو کەردوو. ف دریچەای که آب از آن داخل جوی می‌شود

**زاربێنە:** زاربێن، شتێکە لە دار یان پەڕۆ بۆ تێئاخنینی زارکی گۆزە و جەڕە، تۆپەوانە. ف دهانەبند

**زارجوو:** ئەندازەیەک بنێشت بۆ جاوێن. *(زارجوویەک بنێشتی لە دەمدا بوو.)* ف مقدار آدامس که در دهان می‌گذارند

**زارچکە:** جاجکە، بنێشت، چەقە. ف سقز، آدامس

**زارچن:** بژارچن، مەساسەیەکی چکۆلەیە بژاری پێدەکەن. ف ابزار وجین

**زارکەبێنە:** ☜ زاربێنە

**زارە و دەر:** سەر تەندووری بەر ئاوەڵا. ف سر تنوری که جلوش باز باشد

**زافەوەر:** زەیستان، ژنی تازە زاو. ف زن تازه فارغ شده

**زاو و زاتوول:** بەچکە و مەچکە، منداڵی سەروپێچکە. ف بچەهای کوچک و زیاد

**زاوا ڕێوی:** زاوایەک کە دەچێتە سەرماڵی خەزوور ف دامادی که در خانەی پدرزن زندگی می‌کند، داماد سرخانه

**زاوا زێڕینە:** تازە زاوا، زاوای خۆشەویست. ف تازه داماد

**زاول:** ملۆزم، مێمڵ. ف مزاحم

**زایەند:** گان، سێکس، نزیکی کردنی نێر و مێ. ف جماع، سکس.

**زبڵاخە:** زبڵدان، زبڵگە، شوێنی ڕشتنی زبڵ و زاڵ. ف زبالەدان

**زبڵگوان:** زبڵگە، زبڵدان. ف زبالەدان

**زبێڵ:** چیلکە و خیز و خۆڵ لەنێو دەغڵدا *(ئەگەر نۆکەکە زبێڵی کەمە کەوی مەکە.)* ف آشغال

**زجاو**: زەلکاو، زۆنگ، باتلاغ.ف باتلاق

**زڕ**: وشک، کزر *(ئەو دانەوێڵە تەرە لەبەر خۆر هەڵخەن با زڕ بێ.)* ف خشک

**زراو**: بالابەرز و قەدباریک *(لە تیشکی ڕوومەتت سارده هەناسەم/ کز و بێتینی ئەو بەژنی زراوم. «هەژار».)* ف کمر باریک

**زرپوزیندوو**: ساخ و سلامەت و وریا، زیت، وریا *(زرپوزیندوو لە لامان ڕاوەستاوە)* ف سلامت و هشیار

**زڕخەو**: خەوزڕاو، خەوپەڕیو *(تازە ڕرخەو بووە خەوی لێناکەوێتەوە.)* ف از خواب پریده

**زرۆپ**: نوقستان، سەقەت، ڕینجۆ.ف فلج

**زرووقە**: شۆق، بریقە، شەبەق.ف درخشش

**زڕەبیزا**: گیایەکی کوێستانییە لاسقی ڕەقی هەیە ف نام گیاهی است

**زڕەچێرگ**: باڵدارێکە لە چێرگ چکۆلەترە.ف هوبره

**زڕەکەش**: زەوییەک کە باش ئاو نەدرابێ و جێگا جێگای بە وشکی مابێتەوە.ف زمینی کە خوب آبیاری نشده باشد

**زڕەلاو**: گیایەکە قالۆری هەیە و ڕەنگی سپییە، زۆر بەرز دەبێتەوە و لەنێو قۆپیدا شین دەبێ. ف نام گیاهی است

**زڕەمەندێ**: ☜ بەلبەلە شوانە

**زگ لەوەڕێن**: زگەڕۆ، مشەخۆر، زگدڕاو، سک لەوەڕێن.ف شکمو

**زگچوون**: زگەشۆرە.ف ☜ اسهال

**زگدڕاو**: ) زگهانک، زگەڕۆ، زۆرخۆر؛ ) ناوی دێیەکە لە نزیکی مەهاباد.ف ) شکم گندە؛ ) نام روستایی در نزدیکی مهاباد

**زگهانک**: زگزل، ورگن، گەدەزل.ف شکمو

**زگەشۆرە**: زگچوون، تەقەفیرە، سکەشۆرە، بەلەفیرە، تەقەتۆرە.ف اسهال

**زگەشۆرێ**: زگچوون.ف اسهال

**زگهۆر**: ) زگزل، گەدەزل، ورگن، زگهانک؛ ) زگەڕۆ، زۆرخۆر.ف ) شکم گندە؛ ) شکمو

**زگێنی**: زەگەڕۆیی، چلێسی.ف شکمو بودن

**زلحۆل**: زلحۆ، تەژەی ناقۆلا و گەمژە، گەوجی زەلام.ف لندهور احمق

**زڵخاو**: کالان، کێلان.ف غلاف، نیام

**زلووڤیاگ**: هەراهەرا، زەنازەنا، هەڵڵاوبگر.ف سر و صدای زیاد

**زلەموو**: مووی پیریی بن چەناگەی پیرێژنان. *(هێندە پیرە زلەمووی لە چەناگە هاتووە.)* ف مویی کە بە علت پیری روی چانە پیرزن می‌روید

**زمان بە چاو نەگەیشتن**: بریتی لە تینوێتیی زۆر. *(هێندەم توونییە زمانم بە چاوم ناگا.)* ف کنایە از عطش زیاد

**زمان بە مۆلەق وێستان**: زمان لە گۆ چوون، زمان شکان.ف از حرکت افتادن زبان.

**زمان پاراو**: دەم پاراو، دەماوەر، قسەزان.ف سخندان

**زمان لە گۆ چوون**: ☜ زمان بە مۆلەق وێستان

**زمانەخەسوو**: گیایەکی گەڵا پان و دڕکاوییە لە گوڵداندا پەروەردە دەکرێ.ف کاکتوس

**زمێر**: زمهەر، ئازووخەی زستان.[ف] ذخیره

**زناک**: ) نیشانە، تابلۆی نیوڕی؛ ) نیشانە لە نووسیندا وەک : ؟ ، ! ؛ .[ف] ) تابلوی راهنمایی و رانندگی؛ ) نشانەهای نوشتن مانند : ؟ ، ! ؛

**زنگار**: زنار، تیشە شاخ.[ف] سخره

**زنە**: (+) کانیلە، کانیلکە.(دایکی زانایە کوڕی ئازا دەنێرێتە خەبات/ مـن گـوتم تـۆش تێبگە ناگاتـە دەریایە زنە.«هێمن».) [ف] چشمەی کوچک

**زنەکێش**: (+) زۆنگکێش، جۆگەلە دروست کردن لەنێو زۆنگدا بۆئەوەی ئاوی زۆنگاوەکەی پێدا بڕوا.[ف] درست کردن جوی آب در چمن آبزا.

**زوخ**: خـووس، خـوێز، زوقـم، ئاڵـشک، ئاڵیسکە، سیخوار، خووسار.[ف] سرماریزه

**زوخبـردە**: گیـاوگژ وبێـستان و زەرحـاتی سەرمابردوو.[ف] سرمازده

**زورار**: (+) قـەدباریک. کـەمـەر باریـک، زراو.[ف] کمر باریک

**زورکاندن**: دەنگی یەستر، یەستر دەزورکێنێ.[ف] صدای قاطر

**زورکە**: دەنگی یەستر.[ف] صدای قاطر

**زورهـان**: پیـر، پیختیـار، بـەسـاڵاچوو *(پیـری زورهـانی کـەنـەفتـی دەردەدار/ داتـەپیـوی بێپەسیوی کۆڵەوار. «هێمن».)* [ف] پیر، مسن

**زۆرینە**: لانی زۆر.[ف] اکثریت

**زوقرە کردن**: فججە کردن، دیق کـردن، لەداخا مردن، *(ئەمشەو بێ تۆ خەو داڵداریکی نامۆیە و نایـەتـە ژوان/ وەک دوو دڵـداری تامـەزرۆن پێلووەکانم/ لە سوێی قومە وەنەوزێکدا زوقرەیان کرد/ لە تاسەی ڕامووسینێکدا هەڵپڕووکان. «قادر عەلیخا».)* [ف] دق کردن.

**زوکولە**: زمانە چکۆڵە.[ف] زبان کوچک

**زۆڵانە**: تەوق، قەڵادە، قەڵاتە، ئالقەی ملی تاژی. [ف] قلاده سگ شکاری

**زوڵف شەمسە**: شەش گوڵینگی پێشە سەر بوو بە شەدەوە کە سێ بەملادا و سێ بەولادا شۆڕ دەبۆوە.[ف] منگولەای کە زنان بە دستار آویزان میکردند

**زوڵم**: ستەم، ناهەقی، گووج، ناڕەوایی.[ف] ظلم، ستم

**زوما**: زاوا.[ف] داماد

**زۆمپا**: کوورە، زۆپا، سۆبە.[ف] بخاری

**زۆنگکێش**: ☜ زنەکێش

**زووبر**: تەخت، ڕاست، عەردا زووبر، زەوینی ڕاست.[ف] زمین هموار

**زووروو**: سووتووی خوری *(بە داسەکە دەستی خۆی بڕی زووروومان بۆ کرد خوێنەکەی وشک بوو)* .[ف] خاکستر پشم و مو

**زووروشک**: گەوج، کەلحۆ، ناهیر، هەقمەق، گەمشۆ، نەفام.[ف] نادان، ابله

**زووفا**: گیایەکی دەرمانییە بستێک لە زەوی بەرز دەبێتەوە و گوڵی قاوەیی دەر دەکا.[ف] نام گیاهی است

**زووقاندن**: دەنگی یەستر، یەستر دەزووقێنێ.[ف] صدای قاطر

**زووقە**: دەنگی یەستر.[ف] صدای قاطر

**زەجرەبە**: جەزرەبە، ئازار، عەزیەت.[ف] اذیت

**زەحمەتکێش**: ڕەنجکێش، کرێکار. ف زحمتکش

**زەخم**: (+) توند، مەحکەم *(بەنەکە زەخم گرێ‌دان.)* ف محکم

**زەخمار**: زامار، بریندار، کوڵەوار، ف زخمی

**زەربەقوونە**: هێلکە، هێک، زەبرەقوون. ف تخم‌مزغ

**زەرحات**: شیناوەرد، بێستان، تەرەکاری. ف جالیز

**زەرد و ماە** : شاخی بەرز و ئەستەم، ڕەوەزی ڕژد و بەرز. *(گەیشتمە سەر ترۆپکی ئارەزوو ڕۆژێ کەچی ڕوانیم/ لە پێشمدایە زەرد و ماهو سەخت و ئەستەمێکی‌تر «هێمن».)* ف سخره‌ی صعب‌العبور

**زەردەگوێنی**: جۆرێک گوێنییە ڕەنگی لاسق و دڕووەکانی مەیلەو زەردە. ف نوعی گون

**زەردەڵۆک**: (مەیلەو زەرد، زەردواش.( زەردەڵ، کز و لاواز. ف (رنگ مایل به زرد ) لاغر، نحیف.

**زەردی زرۆقی**: جۆرێ کەوشی قەدیمی ژنانە بوو. ف نوعی کفش قدیمی زنانه

**زەردیکە**: زەردوویی. ف یرقان

**زەرق**: ڕیا، دووڕوویی، تەشیڕێسی. ف تزویر

**زەرەج**: ژەرەژ، دوراج، کەو. ف کبک

**زەرەند**: گوژارک، کوژاڵک، کاڵەکە مارانە. ف هندوانەی ابوجهل

**زەریکە**: خنازیل، خەنازیر. ف گواتر

**زەریم**: نێرگز، گوڵێکی گەلا سپی بەهارییە، نەرگز. ف نرگس

**زەرپی مسقاڵی**: پارچەیەکی قەدیمی بوو بۆ کراسی ژنان. ف نام یک پارچەی قدیمی

**زەعف**: زۆر، زەهف، فرە، گەلەک. ف زیاد

**زەڤەر**: (+) چالاک، گورجوگۆڵ. ف چابک

**زەڤەنگ**: داخوازی، خوازیاری، داوا.(گەلەک ژباڤا وی زەڤەنگ کرن نەهاتە رازی بوونێ.) ف تقاضا

**زەق**: (+) هەڵمات، مەرمەڕ، کەللا. ف تیله

**زەقان**: مێشێن، ماتانێ، هەڵماتێن. ف تیله‌بازی

**زەقزەقە**: ئەستێرە، هەسارە، ستێر، ئاسارە. ف ستاره

**زەلامە بەفرینە**: پیاوە بەفرینە، ئەو پەیکەرەی منالآن به بەفر دروستی دەکەن. ف آدم‌برفی

**زەلبەقوونە**: پووشبەقوونە، پووشبەقنگە. ف سنجاقک

**زەڵزەڵە**: ( ئاوی برین، زنچکاو، (برینەکەی زەڵزەڵەی لە سەر نیشتبوو) .( کوڵۆی نەخووس لەنێو قوڕدا. *(پاستاوەکەت چاک نەخووساندووە زەڵزەڵەی تێدایە.)* ف (کلوغ خشک در گل (آبی که روی زخم می نشیند.

**زەڵمە**: گیایەکە لە قەراغ چۆم شین دەبێ. ف نام گیاهی است

**زەڵە**: زایەڵە، دەنگدانەوە *(کزەی پایز پڕووزانی پەڕ و باڵی هەڵۆی هەردم/ لە کوێستانی سەقز نایە زەڵەی دەنگی تەوارێ تر. «عەلی سەلیمی بابامیری ...پەشێو».)* ف پژواک

**زەلیو**: زەوینی زۆر خووساو بە باران کە لاقی تێ هەڵدەچەقێ. ف زمین خیسیده

**زەمانە**: ڕۆژگار، ڕۆژیار، ڕۆجیار. ف روزگار،

زمانه

**زەمبەر**: (+) ڕادە بۆ لێدان. *(دەبێ زەمبەرێکت لێدەم.)* ف اندازه برای کتک زدن

**زەمبەڵەک**: ئەستەملّی، ناوە، قورکێش، دەفری قورکێشان. ف ظرف گل‌کشی

**زەمبیلۆکە**: قەرتاڵەی چکۆڵە. ف سبد کوچک

**زەنجەف**: زێڕ و زمبەر، متومورووو، کەرەسەی خۆڕازاندنەوەی ژنان. ف زیورآلات.

**زەندووک**: زەندەک، پارچەی باسکپۆش بۆ کار وەک سۆرانی، قۆڵچاخ. ف پارچه‌ای که هنگام کار به ساعد و بازو می‌بندند

**زەنگۆڵ**: تەمبەڵ، تەپلۆس، قوون گران، تەوەزەل، کاهیڵ. ف تنبل

**زەنگۆڵ**: گوێزنگ، گویزک، قاپی پا. ف قوزک پا

**زەنگۆڵە**: (+) شانەی زەردەواڵە. ف شانەی موسە.

**زەنگەر زەنگەر**: لەرزەلەرز، لەرەلەر. ف لرزان لرزان.

**زەواد بڕین**: ) خواردنی خۆراک، نان خواردنی کەسێک کە ماوەیەکی زۆر برسی بووە. *(دوو ڕۆژە زەوادەم نەبڕیوە.)* ؛ ) بڕینی ڕسق و ڕۆزیی کەسێک. *(گوناحن ئەو تۆزە زەوادەشیان لێ مەبڕە.)* ف ) خوردن غذا بعد از مدتی؛ ) روزی کسی را بریدن

**زەواد کردن**: زەواد بڕین، خواردنی نان و پێخۆر. ف خوردن غذا

**زەوارە**: تەختەی باریکی لێواری سندوق و پەنجێرە و ... چوارچێوەی ئاسن یان تەختەی شووشەگیری پەنجەرە و دەرگا، پەرواز. ف زوار

**زەولان**: ( قەلادە، زۆلانە، ( تۆقێکە لە ئەستۆی دیلی دەکەن. ف ( قلاده، ( حلقه‌ی آهنی که به گردن اسیر می اندازند.

**زەوەززە**: زێ و زوو، زاوزێ. ف زاد و ولد

**زەوەنگ**: ☜ زەڤەنگ

**زەهف**: زۆر، فرە، زیاد. ف زیاد، بسیار

**زەیف**: فێڵ کردن لە مامەڵەدا، گزە. *(فەقیرە لەو مامەڵەدا زەیفی لێ‌کراوە.)* ف کلک زدن در معامله

**زەیقەت**: ئازار، تەنگانە و ناخۆشی، ئێش و ژان. *(ئێم ناوێرن دەرد و زەیقەت.)* ف اذیت و آزار

**زێ و زوو**: زگوزا، زاوزێ، زەوەززە. ف زاد و ولد

**زێباز**: مەلەوان. ف ملوان

**زیپکە**: خیزی ورد، دەنکە زیخ. *(زیپکەکەی لە پەنجێرەکەدا و حاڵیی کردن.)* ف دانه شن

**زێچ**: (+) تەنەکەی ئەستوور، گاڵۆن. ف چلیک کلفت

**زێدە پاروو**: پارووی زیادی، خۆراکی زیادی بە کەسێک دان بۆئەوەی قەڵەوبێ. ف لقمه‌ی اضافی دادن به کسی که چاق شود.

**زێدەگاوی**: دەستدرێژی، زێدەڕەوی. ف تجاوز

**زێرگەوان**: زێوان، نگابانی شوێنێک، مجێور. ف نگهبان

**زیـڕۆح**: ڕۆح لەبەر، گیاندار، زیندەوەر. ف موجود زنده

**زیزڕەمەندێ**: گیا سیرێژ، زڕەمەندێ،

بەلبەلەشوانە. ف نام گیاهی خوراکی

**زێلاقە:** قوڕ و چلپاو، لیتە. *(لەو قوڕ و زێلاقەیەدا گیرم خواردبوو.)* ف گل شل کە بە پا می‌چسبد

**زیلـک:**) +) زراو، کیسەی زەرداو، ف کیسەی زهره

**زیلـک ڕژان:** زراو تۆقین، زراو ڕژان، زراو چوون. ف زهرترک

**زێمار:** زامدار، بریندار، زامار. ف زخمی

**زین:** (+) کورتکراوەی خاتووزین، ناوی ژنانە، گراوەکەی مەم. ف نام زنانە

**زیندوولە:** میکرۆب، جانەورێکی بچووکە بە چاو نابیندرێ. ف میکروب

**زیندە بەتاڵ:** بێکار و بەرەڵلا، خوێڕی. ف لات و لاابالی

**زیندەخەو:** بیرەخەو، چوونە فکرەوە بەجۆرێک کە هۆشی لەلا نەمێنێ. ف بە فکر فرورفتن

**زیندی سەر:** بە زیندوویی، لە حاڵی ژیاندا *(بە زیندی سەری خۆی ماڵی بۆ عەولادەکانی جیا کردەوە.)* ف در حال زندگی

**زیەلە:** زراوی گیاندار، زیلک، کیسەی زەرداو. ف کیسەی زهره



**ژارۆ**: ژاری، هەژار، فەقیر، بەلەنگاز. ف فقیر، تهیدست.

**ژارین**: پاڕانەوە، دۆعا کردن، لالانەوە. ف نیایش

**ژاژک**: (+) باوێشک، پینەکی. ف خمیازه

**ژاڤێن**: ژیانەوە، بووژانەوە. ف دوباره جان گرفتن

**ژالانە**: ناوی چیایەکە لە هەورامان ف کوهی در اورامانات

**ژاڵەمۆ**: ژیلەمۆ، ژیلە، زیلەمۆ، پوولووی بن خۆڵەمێش. ف آتش زیر خاکستر

**ژاوەژاو**: (+) لاژەلاژ، بە کاوەخۆ قسە کردن، قسەی زۆر و هیچ و پووچ. ف حرف زدن آدم گیج و بی‌ارزش

**ژقلتە**: ژەقنەمووت، ژەهرێکی کوشندەیە، شتێکی کە زۆر تاڵ بێ. ف زهری کشنده

**ژمێریار**: ژماریار، بژمێر. ف حسابدار

**ژن و ژاڵ**: دەستەی ژن و مێوینە *(لەدەوری کانییەکە پۆلێ ژن و ژاڵ ئاپۆرەیان داوە.)* ف انبوه زنان

**ژنگار**: جۆرێ هەنجیرە. ف نوعی انجیر

**ژنیلانە**: ژنانیلە، پیاوێ کە ئاکاری ژنانەی هەیە. ف مردی که رفتار زنانه دارد.

**ژۆڤار**: شۆڤار، نەمام، دووزمان، قسەبەر. ف سخن‌چین

**ژوقم**: تاڵ، تامی تاڵ، تەحل. ف تلخ

**ژونرۆ**: ژانی ئێسکی لەش، ڕۆماتیز. ف روماتیسم

**ژووژیان**: (+) پشوودان، حەسانەوە، سانەوە. ف خستگی در کردن

**ژەرژێ**: جووجەڵە، جووچک. ف جوجه

**ژەمەخوێری**: قاوەڵتوون، نان و چایی نێوان بەیانی و نیوەڕۆ. یان عەسرۆژە، ئەو ژەمەی کە لە نێوان نیوەڕۆ و ئیوارە دایە. ف غذا میان صبحانه و نهار، یا میان ناهار و شام

**ژەمە ناهەقە:** ژەمە خوێری، عەسرۆژە.ف غذا خوردن هنگام عصر

**ژەنگ و ژار:** ) قار و قین؛ ) ژەنگ و غەوری سەر کانزا.ف ) سختی و ناراحتی، کینەتوزی؛ ) زنگ روی فلز

**ژەهـ** : (+) قەحبە، سۆزانی، بەستۆکە، سەڵیتە.ف قحبە، روسپی.

**ژەهرەماسی:** گیایەکی گەڵا تووکنی مەیلەو زەردە گوڵی زەرد دەر دەکا و لاسقەکەی قاوەییە زۆر لە گۆگەم دەچێ، وشکی دەکەن و بە مەڵۆ دەیبەن لە چۆمی دەکەن و بە دار دەیکوتن تاڵاوەکەی ماسی دەکوژێ.ف نوعی گیاە تلخ کە برای شکار ماهی استفادە میشود.

**ژێرپاتۆڵ:** ژێرشەڵوار.ف زیرشلوار

**ژێرپشتێن:** پەرۆیەکی چەند لایە پێکیدا دەدوورن، ژنان لەژێر پشتێنەوە دەیبەستن بۆئەوەی جوان ڕاوەستێ.ف پارچەی چند لایەای کە زنان زیر شال میبندند

**ژێرچەپۆکە:** دەسبەسەر، چەوساوە، ، چەپۆکە سەر ، زەلیلی بەردەست، دیل و کۆیلە. *(کورد تا کەنگێ هەر دەبێ ژێر چەپۆکە بێ.)* ف زیردست، تحت سلطە.

**ژێرچەپۆکەیی:** دەست بەسەری، چەپۆکە سەری.ف تحت سلطە بودن

**ژێرشەرواڵ:** ژێرپاتۆڵ.ف زیرشلوار

**ژێرکەن:** بنکۆڵ، کۆڵینی بنەوەی شتێک. *(هێندەیان گڵەکە ژێرکەن کرد هەتا ڕووخا.)* ف کندن از زیر

**ژیژەڵە:**جۆرێ گوێنی مەیلەو سوور، سوورە گەوەن.ف گون سرخ

**ژیگوڵ:** ) ژیکەڵە، جوان، دەلال، شەپال؛ ) ناوی کچانە.ف ) زیبا؛ ) نام دخترانە

**ژیلوان:** ناوی چیایەکە لە کوردستان.ف نام کوهی در کردستان

**ژینگە:** جێگەی ژیان، شوێنی ژیان.ف محیط زیست

**ژیوان:** ) بژیو، مایەی ژیان؛ ) ناوی گوڵێکە.ف ) مایەی زندگی؛ ) نام گلی است

**ژیوەڵ:** ) خڕ و خۆڵ، نەرمونۆڵ و خریلانە، خەپەتۆڵە؛ ) بووژانەوە، ژیانەوە.ف ) تپلی؛ ) دوبارە جان گرفتن

**ژیویان:** جووڵان، بزووتن.ف حرکت کردن



**ساپ:** بەردی پانی یاریی ساپساپانی. ف سنگی پهن و کوچک برای بازی ششخان.

**ساپساپانێ:** یارییەکی منداڵانەیە بە بەردێکی پان و تەنک دەکرێ وەکوو شەشخان وایە. ف اسم یک بازی بچەگانە

**ساتار:** شوێنی بێدار و ڕووتەن لەنێو دارستاندا. ف جایی در میان جنگل کە درخت ندارد

**ساتۆر:** (+) کاتۆر، زەوی و مەزرای ڕووتاوە و گیا لێنەماو *(جاڕەکە وا ساتۆر بووە مەڕەکان تێر ناخۆن.)* ف مزرعەی بدون علف

**ساتوسەودا:** ☜ سارد و سەودا

**ساچێنەر:** سارێژکەر، کەسێک کە برین سارێژ دەکا. ف التیام‌کنندەی زخم

**ساردوسەودا:** مامەڵە، کڕین و فرۆشتن، ساتوسەودا. ف معاملە

**ساردخانە:** (شوێنێک کە میوە و گۆشت و شتی دیکەی لێ ڕادەگرن بۆئەوەی خراپ نەبێ، ( شوێنی مردوو تێدا ڕاگرتن لە نەخۆشخانە. ف سردخانە

**سارده پەرێز:** جاڕە گەنمێ کە نەکێڵدرابێ و بۆ ساڵی دوایی بە جاڕی مابێتەوە. ف مزرعەی گندم کە شخم نزنند و برای سال بعدی بماند

**سارده گۆج:** بەچکەی ماڵاتێک کە درەنگ ژەکی دەدەنێ و هێزی مژینی گوانی دایکی نییە. ف برە یا بزغالەای کە توانایی مکیدن مادرش را ندارد.

**سارده گۆژ:** ☜ سارده گۆج

**ساردەکێڵ:** زەوی و مەزرایەک کە لە قەوس و سەرمای پایزدا دەکێڵدرێ. ف شخم هنگام سرمای پاییز

**سارنجۆک:** سەلاجە، یەخچاڵ، بەفرەچاڵ. ف یخچال

**ساروو**: سەرمەست، شەیدا و سەرخۆش، شاد و بە کەیف.ف شاد و شنگول

**سارێن**: ساورێن، سابرێن، نێری تەگە.ف بز نر

**ساقەتە سوورە**: زەڕنەقووتە، بێچووە باڵندەی پەڕ دەرنەکردوو.ف جوجەگنجشک پر درنیاوردە

**ساک**: (+) جانتا، کیف.ف ساک

**ساکار**: ) سادە، بێنەخش و خەت؛ ) مرۆی سادە و دڵساف.ف ) سادە و بدون خط؛ ) انسان سادە و پاکدل

**ساکن**: ئۆقرە گرتن، سیچەن گرتن *(دەمەکەت بێنە بینێ ناو دەمم/ دەبا ساکن بێ دڵەکەی پڕخەمم. «فولکلۆر».)* ف آرام گرفتن

**ساکەدەشت**: ساکەگۆڕ، گۆڕەپان، دەشتی پان و بەرین.ف دشت وسیع

**ساکەگۆڕ**: گۆڕەپان، دەشتایی. ساکەدەشت.ف میدان، دشت

**ساڵاو**: ساڵێک کە ئاو زۆر بێ، تەڕەساڵ.ف سالی کە آب زیاد باشد

**ساڵدانە ساڵدانە**: هێواش هێواش، سووکە سووکە، ئارام بەڕێدا ڕۆیشتن *(ساڵدانە ساڵدانە لەولاڕا هات)* .ف سلانە سلانە

**سالم**: ساق، ساغ، سلامەت.ف سالم

**سالوون**: لێزان، شارەزا، وەستا، کارزان.ف ماهر

**ساڵەوەخت**: ساڵهات *(منداڵەکەمان ساڵەوەختی هاتۆتەوە پێ ناگرێ.)* ف سالگرد

**سامالسا**: ساف و لووس، *(بەفر شاخ و هەردی سامالسا کردووە.)* ف صاف

**سامۆتە**: سامۆرتە، کەژوو. (دەلالۆ لالۆ هەستەوە/بە بەن سامۆتەی زینەوە/تفەنگەکەت ، قەڵەمەکەت، گوارەی سووری گوێچکەی مێژوون هێشتا هەردەڵەرێنەوە.«شێرکۆ بێکەس».) ف فتراک

**سان**: سێبەر، سا، سێوەر، نیسی *(سان داربی خوەشە کەومـاری نەوێ/ دڵداری خوەشە بەوکاری نەوێ «گۆرانی».)* ف سایە

**ساوان**: (+) دارێک کە لەسەر دوو کۆڵەکە ڕایڵ دەکرێ جلوبەرگ و کەلوپەلی پێدا هەڵدەواسن. ف چوبی کە بر دوستون قرار می گیرد برای آویزان کردن لباس و وسائل دیگر.

**ساوەلەوانی**: ساوەساو، خاوەخاو، تەمبەڵی لە کاردا *(لە کاردا زۆر ساوەلەوانی دەکا.)* ف تنبلی، سستی

**سایکلۆن**: گێژەڵووکە، باهۆز، باگەڕ، گەرەپێچ، گەژگەڕینک، گەردەلوول، زەمەن، گەردەبل.ف گردباد

**سایلۆح**: ساویلکە، ساکار، مرۆڤی دڵساف.ف سادەلوح

**سایلۆکە**: ساویلکە، سایلۆح، سادەدڵ.ف سادەلوح

**سایەد**: ئاگادار، نگابان، چاو لەسەر داپچڕین و ئاگاداری لێ کردن *(ڕۆژ تا ئێوارە لە سەری سایەدە)* ف دیدەبان

**سبیرۆک**: جۆرێ چۆلەکەی بۆر و زۆر چکۆلانەیە لەنێو دارستان و بێشەدا هێلانە دەکا. ف نوعی گنجشک بسیار کوچک

**سپی ڕۆژ**: ئەو ڕۆژانەی کەشە هەوری سپی بەری ڕۆژ دەگرێ، ڕۆژی سپی.[ف] روز سفید

**سپیلک**: کڵۆشی گەنم کە دانەکەی زۆر کەم بێ. گوڵە گەنمی بێدان.[ف] ساقە و خوشەی گندم کە دانەاش کم باشد

**سپیلکە**: ئەو دەنکە گەنم و نۆکانەی لە قۆزاخە نەهاتوونە دەرێ و لەنێو سووراییی جەزەکەدا دیارن.[ف] دانەای کە از خوشە بیرون نیامدە

**سپیڵۆک**: سپیواش، مەیلەو سپی.[ف] مایل بە سفید

**ستێرە**: شوقەلەت، ستێرک، سەکۆی ڕەشماڵ.[ف] سکوی سیاەچادر

**سجیل**: ناسنامە، هەویە.[ف] شناسنامە

**سجیلنووس**: کەسێ کە هەویە دەدا بە خەڵکی، کوێخا سجیل.[ف] صادرکنندەی شناسنامە

**سڕ**: (+) بێئاگا، بێحەس *(دوکتور ددانی بۆ سڕ نەکردم کێشای.)* [ف] بیحس

**سڕە سەپۆلە**: مرۆڤی گێژ و کاس و هیچنەزان، کاس و وڕ.[ف] گیج و منگ

**سزرگە**: مۆچڕک، تەزووی لەش.[ف] تیر کشیدن و سیخ شدن موی بدن

**سزگاو**: تیژاو، سزگ، ئاوی پەنیر کە لۆرکی لێدەگرن.[ف] آب پنیر

**سستەر**: ☜ سیستر.

**سقدر**: سقدە، سەردەرانە.[ف] نردەی بالای در.

**سکەڕۆ**: زگەڕۆ، زگدڕاو، زگهانک، بریتی لە زۆرخۆر.[ف] کنایە از آدم شکمو

**سڵمۆچک**: سمۆچک، قەڵەشتی نێوان سمی ئاژەڵ.[ف] شکاف سم حیوان

**سڵۆک**: سڵ، سرک، ڕەوەک، ڕەوک.[ف] رموک

**سلیمۆتەوەرە**: پەپووسلێمانکە، خاتوون سێمانکە.[ف] هدهد

**سڵیە**: گوللە، فیشەک.[ف] تیر

**سمرسمر**: پێچەقاندن، منجڕبوون، بە زۆر و ئیسەرەم کارێک کردن.[ف] پافشاری

**سمکۆڵ**: (+) پێکوڵ، سم بە زەویدا خشاندنی جوانەگا کاتی شەڕ کردن

**سمێڵ چەخماخی**: سمێڵ تیژ و باریک، کەسێک کە سمێڵی درێژووکەیە.[ف] کنایە از سبیل دراز و باریک

**سمێڵچەورانە**: بریتی لە بەرتیل، دەمشیرینی.[ف] رشوە

**سمێڵقیت**: بریتی لە مرۆڤی بە پۆز و شایی بەخۆ، مرۆڤی لووت بەرز و قیت و قۆز.[ف] آدم مغرور خوشتیپ

**سمێڵە خنچکە**: بسکەی سمێڵ، زەردەخەنەی پیاو.[ف] لبخند مردان

**سن**: (+) ناوی هۆزێکی بچووکە لە هۆزی بڵباس.[ف] نام طایفەای از عشیرت بلباس

**سنجانە**: سەرپۆش، لەچکە.[ف] روسری

**سنخچی**: شکستەبەند، جەڕاح.[ف] جراح

**سندووقە شەیتان**: تەلەویزیون، تیڤی.[ف] تلویزیون

**سنگ شێری پشت ماکەر**: بریتی لە پیاوی زەبەلاح و کەمغیرەت.[ف] کنایە از مرد لندهور بیغیرت

**سنگەسۆژە**: دڵەکزێ، ژان و کزانەوەی سینگ. ف سوزش سینه

**سنگەڵ**: تەپک، گردوولکە، جێیەک بە قەدی کێوەوە کە شین بێ و گیای پێوە بمێنێ. ف تپەای کوچک در کوه که سرسبز بماند

**سنەسن**: خاوەخاو، تەمبەڵی و دەستەوستانی لە کاردا *(بە بەر ئەو کارەوە هەر سنەسنیەتی.)* ف تنبلی کردن هنگام کار

**سوارە و پیادە**: ناوی جۆرێ ئۆییەی بە زەنگیانە گیراوەیە لە پەراوێزی دەسماڵی دەدەن بۆ جوانی. ف نوعی زیورآلات زنانه

**سواری قسەی خۆ بوون**: بریتی لە پێچەقاندن و پێداگری لەسەر قسە و بیروڕای خۆ *(سواری قسەی خۆی بووە بە ئامان و زامان واز ناهێنێ.)* ف پافشاری بر حرف خود.

**سواڵە شێوێنکە**: فشە، گیایەکە لەنێو گەنمدا شین دەبێ و کاتی دروێنە نایەڵێ سواڵەی دەستی دروێنەوان پێکەوە بنووسێ و فشی دەکاتەوە. ف نام گیاهی

**سواندان**: پاسارە، سواندە، سوانە، گوێسەبانە، گوێسوانە. ف لبەی بام

**سوتفە**: هەڵکەوت، دەگمەن. ف ندرت

**سۆدە**: ) کلۆر، دەرمانێکە تێکەڵ ئاوی خواردنەوەی دەکەن بۆئەوەی خاوێنی بکاتەوە؛ ) بلّخ، بەڵخ، بەلّغ. ف ) کلر؛ ) جرم

**سوڕاڵک**: گیایەکە بەقەد کیفوار گەڵاکەی وەک گەڵای گەسگەسک پەرە پەرەیە و شین و مەیلەو سوورە، لە ئاودا لەگەڵ بەن دەیکوڵێنن بەنەکە سوور دەکا. ف اسم گیاهی

**سۆراویلک**: مراوییە کێوی. ف مرغابی وحشی

**سۆرغەرە**: ڕەنگێکی زەردی مەیلەو قاوەییە بۆ ئاسک و ئاژەڵ. *(ئاسکێکی سۆرغەرەمان بە بەر قەدی کێوەکەوە دی.)* ف رنگ بور مایل به قهوەای

**سوریت**: سرووت، کڵۆش، لاسقی گەنم و جۆ. ف ساقەی گندم و جو

**سوژن بەدز پێکردن**: بریتی لە شاردنەوەی مەسەلەیەک لەنێوان چەند کەسدا. *(وایان شوژن بەدز پێکرد تازە کەس تێی ناگا.)* ف مخفی کردن چیزی میان چند نفر

**سۆشین**: گیایەکی ئەستوورە لە گۆگەم دەچێ، بنەکەشی وەک چەوەندەر وایە وشکی دەکەن و لێیدەکەن ئاردەکەی دەکەن بە پەڵوولە. ف نام گیاهی

**سوکوچرووک**: ئابڕوو تکاو، ریسوا، خوێڕی. ف فرومایە و رسوا

**سوکور**: سیخوڕ، سیخچوولە، ژیشکی گەورەی تیرهاوێژ. ف سگرنە

**سۆڵەخانە**: ساردداو، ژێرخان، قووڵکە لە عەرزیدا بۆ ئاو سارد کردن. ف سردابە

**سۆڵین**: گیایەکی کوێستانییە بە پۆل دەڕوێ زۆر بەرز دەبێتەوە قالۆری هەیە گەڵاکەی وەک گەرچەک وایە. ف اسم گیاهی است

**سۆمپا**: سۆبا، زۆپا، سۆبە، کوورە. ف بخاری

**سۆمەر**: مەلە، مەلێ. ف شنا

**سۆنەیی**:ناوی هەڵپەڕکێیەکی کوردییە. ف نام

یک رقص کردی.

**سونع:** تەمەن، عومر *(یارێکم گرتووە لە سونعی خۆمە.)* ف همسن و سال

**سووتەبا:** گڕە، گڕەبا، سەبوون، بای گەرم. ف سبون

**سووتەڕۆک:** جێگای سوتمان، جارە گەنمێک کە دەسووتێ و ڕەش دەبێتەوە. ف مزرعەی سوخته

**سووخەت:** ئاکار، خوو، ڕەوشت. ف اخلاق

**سوورماڵک:** سوورە بانوو، زەویی بێخیز. ف زمینی که خاک است و شن ندارد

**سوورمل:** (+) جەمسەری کێو. ف خطالراس

**سوورمەن:** زەویی گڵە سوورە، سوورە بانوو، گۆشتە زەوی. ف زمین نرم

**سوورە بانوو:** زەویی گڵە سوورە، بەرانبەری خیزەڵان. *(ئەم پەتاتەیە خاکەکەی سوورە بانوو بووە تامی زۆر خۆشە.)* ف زمین که خاک سرخ باشد

**سوورە پنگ:** پنگە سوورە، جۆرێ پنگەیە گەڵاکانی مەیلەوسوورە هەرکەس بیخوا زگچوون دەگرێ. ف نوعی پونه

**سوورە چیغ:** جۆرێ چیغە هەوارچییان لە قامیش دروستی دەکەن. ف پرچین نی

**سوورە گوێنی:** جۆرێ گوێنی مەیلەوسوورە، ژێژڵە گەوەن، ژێژەڵە. ف گون سرخ

**سوورە مراوی:** سوورەقانگ، جۆرێک مراوییە کێوییە ڕەنگی سوورە. ف نوعی اردک

**سووری دووگر:** بریتی لە کەسێک کە دوو شتی وێگڕا دەوێ. *(بۆتە سووری دووگر خورماشی دەوێ و بەغداشی دەوێ.)* ف کنایه از کسی که دو چیز را با هم میخواهد

**سووژێت:** سووژە. ف سوژه

**سووک:** نەقیزە، دارێک کە نوکێکی ئاسنی تێچەقاوە و گا و ولاخی پێ لێ دەخوڕن. ف فلز نوک تیزی که برای راندن حیوانات به سر چوبی فرو میکنند

**سووکە:** ئازارە مریشک. ف آبله مرغان

**سووگە:** گردی نەوی، تەپۆڵک، تیرەگ، کەڵک. ف تپه

**سوول:** سەوڵ، سەرو، داری سەرو. ف درخت سرو

**سوولان:** (+) ) شایی، زەماوەند، هەڵپەڕکێ؛ ) تاڤگە، سۆلاڤ، قەڵبەزە، ئاوهەڵدێر. ف ) رقص و پایکوبی؛ ) آبشار

**سوونوو:** سوون هاتنەوە، بلووغ بوون بۆ سەگ و تاژی. ف بلوغ سگ و تازی

**سوونە:** سن، بۆگەنکە، کیسەڵە، جانەورێکی وردی بۆرە ئافەتی گەنمە و شیلەکەی دەمژێ. ف سن، آفت گندم

**سوێبانە:** سواندان، گوێسوانە، پاسارە، سوانە، گوێسەبانە. ف لبەی بام

**سوێر قسە:** کەسێک کە لە قسە کردن تێر نابێ. کەسێک کە زۆری دڵ بە قسە و باسەوەیە. ف وراج، پرحرف

**سۆیلانە:** جۆرێ گوڵی جوان و بۆنخۆشە. ف نام گلی است

**سویلک**: بەرخ و کاژیلەی ساوا. ف بەرە و بزغالەی تازە بە دنیا آمدە.

**سەبوون**: (+) قەدەم، تینێک کە لە قرچەی هاویندا وەک شەپۆل لە نزیک زەوی دەبیندرێ. ف هالە کە در گرما دیدە میشود

**سەچاک**: سزا، پاداشتی چاکەوخراپە. ف عقوبت

**سەحانە**: دەفر و کاسەی مسین. ف ظرف مسی

**سەحەت خۆش**: ڕووخۆش، ڕەزا شیرین، خۆێنشیرین، ڕەزاسووک، خوێن سووک، سەحەتسووک. ف دوستداشتنی، خوشرو

**سەحەتگران**: ڕەزاگران، مڕومۆچ، ڕەزاتاڵ، ڕووناخۆش. ف اخمو

**سەخ**: ) بنمیچ، بنبان؛ ) مەلاشوو، مەلاشک، مەلاژگ. ف ) سقف خانە؛ ) سقف دهان

**سەختان**: سەخناخ، سەخڵەت. ف مسیر سخت در کوە

**سەخڵەت**: (+) سخناخ، سەختان، شوێنی ڕژد و ئەستەم لە چیادا. ف سراشیبی سخت در کوە

**سەخمەرات**: چەرمەسەرێ، کوێرەوەری. ف سختی

**سەدەقی خۆ لێدان**: ڕای خۆ دەربڕین. ف نظر خود را مطرح کردن.

**سەرئاسنینە**: جۆرێک دڕکی تیژە لەنێو گەنمدا دەڕوێ، سەپان ترێنە، دڕووە کەڵەوە، چۆکشکێنە. ف نوعی خار

**سەراسۆ**: لای بەرزایی، سەراسوێ. *(بەسمان لێ بگرە سەراسۆی بانی/ لە تۆ ماڵی زۆر لە من جوانی «گۆرانیی ژنان».)* ف طرف بالا

**سەرئاسۆ کردن**: ) مل کێشان و چاو لێ کردن *(بچۆ سەر ئەو بستووکە سەرئاسۆیەک بکە بزانە کەس دیار نییە)* ؛ ) سەردان، دیدەنی کردن، هەواڵ پرسین، بەسەر کردنەوە، *(قەت سەراسۆیەکمان ناکەی)* . ف ) نگا کردن از بالا؛ ) ملاقات

**سەراڤ**: (+) قەراغ ئاو، لێواری چۆم. ف کنار رود

**سەرانگیرۆ**: گەڕانەوە لە سەردا بۆ خوارێ. *(هەوارچییان لە کوێستانەوە بەرەو گەرمێن ماڵاتیان سەرانگێرۆ کردەوە.)* ف برگشتن از بالا بە پایین]

**سەراوەرد**:(+) مەرزی نێوان زەویوزار، (گوندی قاجر و کانی پانکە سنوور و سەراوەردیان پێکەوەیە) ف مرز میان زمین کشاورزی.

**سەر ئەستوور بوون**: بریتی لە فکر و خەم و خەیاڵی زۆر *(سەرم ئەستوور بووە هێندەم بیر کردۆتەوە.)* ف سرگیجە گرفتن براثر بیکاری

**سەربڕ**: (+) دوورینەوەی گەنم و جۆ و وێنجە بەمەڵەغان بەشێوەیەک کە سەری گوڵەکەی بقرتێنن. *( ئەو وینجەیە حەیفە سەربڕ مەیدوورەوە.)* ف درو کردن و قطع کردن گندم وجو از نزدیک خوشە.

**سەربردە**: سەرگوریشتە. بەسەرهات، سەربهورد. ف سرگذشت

**سەربگرد**: بەسەرهات، سەربردە، سەربهورد. ف سرگذشت

**سەربەران**: بەرانێک کە تەمەنی لە پێنج ساڵ پتر

بێ.[ف] قوچ از پنج سال به بالا

**سەربەردە:** بانیژە، ئەو جێگەی گەنمی لێوە دەڕێژنە ئاشەوە.[ف] محل فرو ریختن گندم به دهانەی آسیاب

**سەربەرووڵە:** قوڵەدارێکی بەقەد بستێک دەبێ لای سەرووی باسکێشی دەکوتن دەبێتە هۆی پێوەنددانی نیرو ئاموور، پیمێکە گاینجەکە ڕادەگرێ.[ف] پیمی چوبی درخیش

**سەربهورد:** بەسەرهات، سەربردە، سەرگوریشتە.[ف] سرگذشت

**سەربەهەش:** سەربەقوڕ، تازیەبار، کەسێک کە خۆشەویستێکی مردووە و سەری بۆ لە قوڕ ناوە.[ف] کنایه از عزادار

**سەربێژنگە:** بریتی لە مرۆی دەستەوستان و بێدەسەڵات. *(ئەو سەربێژنگەیە هیچ کارێکی لە دەست نایە.)* [ف] کنایه از آدم تنبل و ناتوان

**سەرپنج:** گیایەکە وەکوو کەرتەشی وایە بەڵام دڕکی نییە.[ف] نام گیاهی است

**سەرپێلک:** دەسپێک، سەرەتا.[ف] ابتدا

**سەربەکڵاوە:** (+) بارانی دەنک درشت کە لە گۆلاوە ئاوی دەدا و بلۆقی پێ دەکا.[ف] باران درشت که برروی آب حباب درست می‌کند

**سەر بەخوزدا گرتن:** سەر داخستن و بیرکردنەوە. جۆرێ سەر داخستن کە چەنە بە قووڵکی ملەوە بنووسێ.[ف] پایین انداختن سر.

**سەر بێ دەلاک تاشین:** بریتی لە کاری ناشارەزا و بێپرس و ڕا.[ف] کنایە از کار ناشیانه و بدون مشورت

**سەر پەرژان:** بریتی لە دەرفەت و هەل، *(ابرِوا بکە هێندە گرفتارم سەرم ناپەرژێ دەنا دەهاتمە خزمەتتان.)* فرصت داشتن

**سەرتوول:** سەر لقی شلک و باریکی دارە مێو کە پێچ پێچە و ترش و خۆشە دەخورێ.[ف] شاخەی باریک و پیچان تاک

**سەرتەتەی بنمافەتە:** بریتی لە ڕواڵەت جوانی لە دەروونا پیس و خراپ.[ف] کنایه از ظاهر زیبا و باطن خبیث

**سەرتەڕکە:** پەڕۆیەکی تەڕ کراوە بەسەر گونتکە هەویریدا دەدەن بۆئەوەی کرێژ نەهێنێ یانی ڕەق نەبێتەوە.[ف] پارچەی خیسی که روی چونه نانوانی می‌اندازند

**سەرتیک:** جەمسەری دروومان.[ف] محل وصل پارچەی دوخته شده

**سەرتیکە:** سەیدووکە، گیایەکە بەرێکی خڕ دەگرێ و دەخورێ.[ف] اسم گیاهی خوراکی

**سەرجن کردن:** سەری برکە تووتن هەڵپەرتاوتن بۆئەوەی گەڵاکانی پان بێ.[ف] بریدن قسمت بالایی بوتەی توتون برای اینکه برگش پهن بشود.

**سەر چادان:** پەڕۆیەکی گردی گوڵدۆزی کراوە دەیدەن بەسەر قۆریی چاییدا بۆئەوەی دەم بکێشێ.[ف] دمکش

**سەرچرووک:** سەرچڵووک، سەر لقی دار. *(تازە یارێکم گرتووە خەڵکی شاری کەرکووکە/ لەبەر مەمکۆڵەی دەمرم وەک سێوی سەرچرووکە «گۆرانی».)* [ف] شاخەی بالایی درخت

**سەردووشی**: دوو لەتە پارچەی دووراو و ڕێک کە بە سەر شانی چاکەتدا دەیدروون هەردوو سەری لای یەخەکەوە بە دوگمە قایم دەکرێ.[ف] سردوشی

**سەردوولکان**: چەمەری، ئیلیگی، وایلۆک، سەردوولکە، شێعر بە مردوودا هەڵگوتن.[ف] مرثیه

**سەردەژین**: ژانەسەر، سەرئێشە.[ف] سردرد

**سەردەلیل**: سەرچۆپیگر (دەسرە هابەدەس سەردەلیلەوە) .(شۆخی نەشمیل بێ دەلیل تۆراوە لێم/ شایی ڕۆحە و سەردەلیل تۆراوە لێم. «نادر نیروومەند "بۆران"».) [ف] پیشاهنگ رقص گرووهی.

**سەردێر**: ئاودانێکی کەم بۆ گەنم لە پایزدا کە تەنیا ئاوەکە وەسەر زەوییەکە دەکشێ و تێیدا ڕاناوەستێ.[ف] آبیاری در فصل پاییز

**سەردێڕ**: ناوی بابەتی نووسراوە *(چیرۆکێک لە ژێر سەردێڕی ئەوە ... دا.)* [ف] عنوان

**سەرڕاو**: لای سەرووی جێگەڕاو.[ف] طرف بالایی شکارگاه

**سەرڕژێکرن**: سەر بڕین.[ف] سربریدن.

**سەرڕەشە**: (+) گیایەکی گەڵا باریکە وەکوو پوار وایە.[ف] نام گیاهی است

**سەرسارد**: کەمتەرخەم، بێموبالات، کەترەخەم. [ف] لاابالی

**سەرسواڵک**: ڕیخۆڵە گەورە.[ف] روده بزرگ

**سەرسۆرک**: چێشتێکی کوردەوارییە.[ف] نوعی غذای کردی

**سەر سۆفیلکە**: گیایەکە وەک تاڵوو وایە گوڵێکی تووکنی سپی خڕ دەر دەکا.[ف] نام گیاهی است

**سەر سوور**: جۆرێک مراوی کێوییە سەری سوورە.[ف] اردک سر حنایی

**سەر سووری بەحری**: جۆرێک مراوی کێوییە سەری سوور و کڵاونەیە.[ف] اردک تاجدار

**سەرسەپۆل**: سڕەسەپۆلە، مرۆڤی گێژ و وێژ و کاس.[ف] ☜ سڕەسەپۆلە

**سەرسەرەکی**: لەگۆترە، ئاکۆیی، گوێ پێنەدان، لەخۆڕا کارێک کردن.[ف] سرسری

**سەرسەوز**: (+) ) مەزرا و شاخ و کێوی زەنوێر و پڕ گیا و دار؛ ) بریتی لە سەید، عەولادی پێغەمبەر.[ف] ) سبز؛ ) کنایه اولاد پیامبر.

**سەرشێلکە**: ) ئەو پەڕۆیەی بەسەر هەویریدا دەدەن دوای شێلانی. ) ئەو بەنەی لە بەینی داو و سنگ دایە. بەنێکی درێژۆکەیە چەند سنگی پێوەیە دایدەگوتن و داوەکان بەو بەنەوە دەبەستن و بۆ کەوی دەنێنەوە.[ف] ) پارچەای کە روی خمیر نان میاندازند. ) نخی کە در دام کبک بەکار میرود.

**سەرقورس**: ) تەمبەڵ، تەوەزەل؛ ) بەدگووز، خیشەسەر و گوێنەدەر.[ف] ) تنبل؛ ) کلەشق

**سەرقورس بوون**: داهێزران، ماندوو بوون و هێز لێبڕان.[ف] تباسیدن.

**سەرقۆزی بن ئاڵۆز**: کەسێک کە زۆر دەستکورت و هەژارە، یان خەمناک و دڵناخۆشە، بەڵام خۆی شاد و دڵخۆش نیشان دەدا و لافی دەوڵەمەندی لێدەدا.[ف] کسی کە

تهیدست و غمگین است و خود را ثروتمند و شاد نشان می‌دهد

**سەر قۆق:** کەچەڵ، یاڵ گەنیگ، سەر گەنێگ.ف کچل

**سەر قەباغ:** (+) پارچەیەک کە بەسەر گیرفانیدا دەدوورن و بە دوگمە دادەخرێ، سەر گیرفان. ف روپوش جیب لباس

**سەر کردنەوە:** دەرفەتی دەستکردنەوە، *(ناهێڵێ سەر بکاتەوە.)* ف مهلت دفاع ندادن به حریف

**سەرکڵاوە:** (+) چوکڵەی سەر دەسکی کەردووکێش کە دەستی ڕاستی پێوە دەگرن.ف تکە چوبی کە بە انتهای دستەی گراز میکوبند برای دست گیره.

**سەرکوێر کردن:** لێدان و شکاندنەوەی منداڵ لەبەرچاوی خەڵکی. *(هێندەی لێداوە سەرکوێری کردووە بۆیە هیچ فێر نابێ.)* ف کنایە از زدن کودک به نحوی کە قدرت یادگیری را از دست بدهد.

**سەرکەوا:** جۆرێ جلی ژنانەیە پەراوێزەکانی بە سیم دەنەخشێنن.ف نوعی روپوش زنانە.

**سەرگەنیگ:** کەچەڵ، یاڵ گەنیگ.ف کچل

**سەرگیندان:** ژوورێکە لە تەویلەدا کە پەینی تێدا هەڵدەدەنەوە بۆئەوەی وشک بێتەوە.ف جای سرگین خشک کردن

**سەرلەرێدا بوون:** بەدڵ لە خزمەت کەسێکدا بوون. *(هەر ئەمرێکی بیفەرمووی سەرم بۆت لەرێ دایە.)* ف با جان و دل در خدمت کسی بودن

**سەرلەبەر:** ) بە تەواوی، تێکڕا. *(سەرلەبەری کارەکە ئەو کردی.)* ؛ ) سەردەبەر، مرۆڤی ڕۆحسووک و فەرمانبەر، ملکەچ.ف) بە کلی؛ ) گردنکج

**سەرما تۆپین:** سەرما گێرەوە، بریتی لە جلی زۆر گەرم.ف ضد سرما

**سەرماسین:** سەر ئەستور بوون، بریتی لە بیرکردنەوەی زۆر *(سم سمی کەر و چنگ چنگی یاسی، من سەرم لەو کارە دەماسی. «پەند»)* ف سرگیجە گرفتن

**سەرماقۆتانی:** سەرمەقولات، سەرەومەقولانج. ف معلق

**سەرمامۆستا:** سەرۆکی مامۆستایان، سەرۆکی قوتابخانە.ف مدیر مدرسە

**سەرمردوولە:** مرۆڤی شەرمێون و فەقیرۆکە *(ئەو سەر مردوولەیە هیچی لە ڕوو هەڵنایە.)* ف کنایە از آدم شرمو

**سەرمەنجەڵانە:** ئەو پارەیەی زاوا لە کاتی ئامادەبوونی چێشتدا بە ئاشپەزی دەدا.ف انعامی کە داماد بە آشپز می‌دهد.

**سەرمەند:** سەرسام، واقوڕماو، سەرسووڕماو. ف متحیر

**سەرنا:** سەرین، سەنیر، بالشت، بالیف.ف بالش

**سەرنووسەر:** کەسێک کە بەسەر کار و باری ڕۆژنامە و گۆڤاردا ڕادەگا.ف سردبیر

**سەرنەرم:** بریتی لە مرۆڤی گوێڕایەڵ و ڕۆحسووک. ( کوڕێکی سەرنەرمە چۆنت پێخۆش بێ واکار دەکا.) ف کنایە از آدم حرف

شنو و سبک روح.

**سەرنێزە:** ئامرازێکی پۆڵایە وەک خەنجەر وایە لە سەری تفەنگی دەبەستن.ف سرنیزە

**سەروپێچکە:** منداڵی ساوا، مەلۆتکە، زارۆک.ف نوزاد

**سەرودڵ گرتن:** بریتی لە مزاحیم بوون *(دیسان هات سەرودڵمان بگریَ.)* ف مزاحم شدن

**سەرودڵ لیَهاتن:** گەشکە کردن، فیَ لیَهاتن.ف غش کردن

**سەروعوزرشۆر:** بریتی لە کچی عازەب، کچی جحێڵ.ف دختر بالغ

**سەروسووژن دان:** ☜ سەنگ و سووژن دان

**سەروکڵاوتێکەڵبوون:** بە شەڕ هاتن، ئاوقای یەکبوون.ف جدال و دعوا و گلاویز شدن.

**سەرویَ:** هێمن، هێدی، لەسەرەخۆ.ف آرام

**سەروێن:** مێزەر، دەسرەی سەر، پێچ.ف مندیل

**سەرەپیرێژن:** بریتی لە کچی چکۆڵەی زۆرزان. ف کنایە از دختر کوچک و دانا

**سەرەتەشی:** پووشبەقنگە، زەلبەقوونە، پووشبەقوونە.ف سنجاقک.

**سەرەجە:** تابووت، دارە تەرم، دارە مەیت.ف تابوت

**سەرەخەر:** (+) سەرە کەرێک کە لەنێو بێستان هەڵیدەواسن بۆ چاوەزار *(بێستان و بیَسەرەخەر.)* ف کلە الاغ کە در جالیز آویزان میکردند برای رفع چشمزخم

**سەرەدیقانیَ:** سەرە تاتکیَ، ڕوانین بە دزییەوە. ف دزدکی نگاە کردن

**سەرەڕۆ:** (+) پێشەنگ، سەرجەلەی کاروان.ف پیشاهنگ

**سەرەژن:** ژنی قسەزان و کەیخودا، ژنی زانا و وێچوو.ف زن سخنور و دانا

**سەرەگاوخان:** هۆگان، گامەرز. ئەو شوێنەی خەتی جووت دەگاتە ئەوسەر و دەگەڕێتەوە سەر خەت.ف محل دور زدن در شخم

**سەرەمەڕ:** ) مەڕێک کە دوو زگ زابیَ؛ ) مەڕێک کە لە پێشەوەی مێگەل دەڕوا، سەرگەلە؛ ) ناوی چیرۆکە شێعرێکی مامۆستا هەژارە.ف ) گوسفندی کە دوبار زاییدە باشد؛ ) گوسفند پیشاهنگ گلە؛ ) نام شعری بلند از استاد هەژار.

**سەرەمێکوتە:** کەوچکە قوڵە، چمچمە کوڵە، کلکەتەشی.ف بچە قورباغەی پا درنیاوردە.

**سەرەندەر:** سەرودەر، زانین و تێگەیشتن.ف راە در کردن.

**سەرەودەرکردن:** بریتی لە ڕیَ دەرکردن، شارەزایی، ڕیَ دۆزینەوە.ف راە درکردن

**سەرەوقوم:** سەرەوبن لە ئاودا، ئاوەژوو بوونەوە لەنێو گۆمدا.ف سرنگون شدن در آب

**سەرەوقوڵە:** نووکووسۆ، یارییەکی کچانەیە بە دەرزیلە دەکریَ. دەرزیلەیەک لە مشتیان دەخەن و دەبیَ بە نۆرە هەڵیدەن سەرەکەی لای سەرەوەیە یان قوڵە، هەر کەس هەڵیهێنیَ دەرزیلەکە هەڵدەگریَ بۆ خۆی.ف نام یک بازی دخترانە

**سەرهەڵبڕین:** ) سەرهەڵێنان، سەر بەرز کردنەوە؛ ) سەر بڕین.ف ) سر بلند کردن؛ )

سر بریدن

**سەرهەڵنەهاتن:** بریتی لە شەرم کردن، خەجاڵەتی کێشان *(لە شەرمانا سەری هەڵنایە.)* ف از شرم سرش بلند نمی‌شود

**سەری تەماح برین:** چاوپۆشی کردن لە تەماح لە کاتی مامەڵەدا، *(ابریا ئەوکاتە سەری تەماحم ببڕیبایە و خانووەکەم بفرۆشتبایە، ئێستا هیچ ناکا.)* ف چشم‌پوشی از طمع

**سەری خۆ خوێندنەوە:** بریتی لە سەر حیسابی ماڵ و سامانی خو بوون. *(با سەری خۆم بخوێنمەوە ئەگەر بۆم هەڵسووڕا یارمەتیت دەدەم.)* ف سرحساب دارایی خود شدن

**سەرینا:** سەرینگا، سەرین، سەنیر، باڵنج، بالیف، باڵگە. ف بالش

**سەرینچاوە:** سەرچاوە، ئاخێزگە. ف سرچشمە

**سەریوان:** ) تەپۆڵکی خۆڵ و زبڵ، زبڵکوان، زبڵدان؛ ) سەرانگوێلک، گووڤەک، سەلوێنک. ف ) زبالەدان، محل جمع‌آوری زبالە؛ ) سرگین‌گاە

**سەعانە:** سەحانە، سەحەن، دەفری مسین. ف ظرف کسی برای غذا

**سەغ:** سەخ، بنمیچ، بنەبان، ژێربان. ف سقف

**سەغڵەت:** (+) سەرما و تەڕ و تووشی باران و کرێوە. ف سرمای شدید و بارش.

**سەغیربار:** کەسێک کە ئەرکی چەند منداڵی سەغیری کەوتبێتە ئەستۆ. *(خێر بۆ ئەو ژنە سەغیربار و بێکەسە باشە.)* ف کسی کە سرپرست چند بچەی یتیم است

**سەڤا:** ڕزگاری، دەرباز بوون. ف رهایی

**سەفەر:** (+) کەڕەت، جار، ڕا، چەل *(ئەم سەفەر قسە بکا دەمی دەشکێنم.)* ف دفعە، بار

**سەقلە:** قەبز، توند بوونەوەی پیسی. ف یبوست

**سەگبایی:** ) باداریی سەگ؛ ) نەخۆشییەکە لە سەرما و سەغڵەتدا یەکسم تووشی دەبێ و پاشووی لە هەڕەکە دەکەوێ و لەسەر پێشووی ڕادەوەستێ و کەفەڵی لە عەرزی دەخێشێنێ. ف ) مرض سگ؛ ) بیماری الاغ کە پاهای عقبش از کار می‌افتد.

**سەگڤان:** سەگوان، تیرهاوێژی زانا و دەست ڕاست، نیشانە ئەنگێو.. ف تیرانداز ماهر، تک تیرانداز.

**سەگ گلاوک:** سەگلاو، سەگاڤ، سەگاو، سەگاوی. ف سگ آبی

**سەگ گورگ:** ☜ سەگورگ

**سەگ و شوان هاتنەوە:** بریتی لە وەرشکەست بوون و ماڵ بەدەستەوە نەمان. *(جا ئاوا کاسپی بکەم سەگ و شوانم دێتەوە.)* ف کنایە از ورشکست شدن

**سەگورگ:** سەگ گورگ، سەگێک کە شێوەی گورگ دەدا یان لە ڕەگەزی گورگە. ف سگ شباهت بە گرگ

**سەڵتە:** (+) کولۆنجە، کولێجە، سیخمەی قوڵداری ژنان. ف نوعی بالاپوش زنانە.

**سەڵتەزینە:** سواری تەنیا، ڕێبواری بەتەنێ ف سوارکار تنها، تکسوار

**سەڵتە قەمچی:** بریتی لە ڕاوچییەک کە بەدەستی خاڵی دەچێ بۆ ڕاو یان لەگەڵ کۆڕی

ڕاوچییان و ڕێبواران دەکەوێ و بەدەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە. *(ڕاوچییەکان هەموو سەڵتە قەمچی گەڕانەوە.)* ف دەستخالی برگشتن

**سەڵمکە:** سەڵەمکە، گیایەکە بۆ دۆکولیو دەبێ. ف سلمه

**سەڵمۆکە کەرانە:** گیایەکە وەک سەڵمکە وایە ناخورێ. ف اسم گیاهی است

**سەڵمۆکە:** سەڵمکە،، سەڵەمکە، سڵەمکە. ف گیاهی خوراکی برای آش

**سەڵمەک:** ☜ سەڵەمکە

**سەڵەمکە:** ☜ سەڵمکە

**سەلیم:** (+) ساغ، سڵامەت، سالم، ساغ و سەلیم. ف سالم و سلامت

**سەمبوور:** سەبوون، گڕە، گڕەبا، هاڵاوی گەرما. ف سموم.

**سەناز:** ڕۆخ، قەراغ، کەنار، لێوار. ف کنارەی رودخانه

**سەنجۆر:** ☜ سەنجۆڵ

**سەنجۆڵ:** کەڵەوە، کەڵەمە، کەڵەوانە. ف چنبرەی گردن گاو درخیش

**سەندەلووس:** جۆرە دارێکی کورتە بنەیە بەرێکی وەک قەوزان دەگرێ تەزبێحی لێ دروست دەکەن. ف بوتەای کە ثمر آن شبیه چاتلانقوش است برای تسبی حاستفادە می‌کنند.

**سەنگ دادان:** مناڵ لە سکی دایکیدا کاتی هاتنە دنیا دێتە بەر موسوڵدانی ژن و دەڵێن سەنگی داداوە. ف پایین خزیدن بچه هنگام زایمان

**سەنگ گرتن:** مۆتە سوار بوون، قورس بوونی لەش لە خەودا ڕاوەستانی گەڕیانی خوێن، مرۆڤ بە جووڵانەوە چاک دەبێ لەسەر ئەو باوەڕەن هەر کەسێک سەنگ گرتی *(مۆتە سواری بوو)* دەست بەرێ بۆ دۆخینەکەی خەبەری دەبێتەوە. ف کابوس

**سەنگاو:** ) گۆلاو، شوێنێک کە ئاوی بارانی لێ کۆ دەبێتەوە؛ ) شارۆچکەیەکە سەر بە پارێزگای کەرکووک. ف ) محل جمع شدن آب باران؛ ) شهرکی از توابع شهر کرکوک

**سەنگاوبەردنان:** سەنگەوبەردنان، خستنە ژێر شتی قورس، ماست و شیر و ... دەخەنە ژێر قەرتاڵە وبەردێکی لەسەر دادەنێن بۆ ئەوەی پشیلە نەیخوا. *(ماستەکەم سەنگاوبەرد* ناوە) . ف زیر پوشش سنگین گذاردن

**سەنگوردوو:** سەرانگوێلک، گووڤەک، سەلوێنک. ف سرگین‌گاه

**سەنگوسووژن دان:** بە وردی گەڕان و چاوگێڕان و وڵاتپشکنین *(ئەو ماڵەم سەنگوسووژن دا نەمدۆزییەوە.)* ف بەدقت دنبال چیزی گشتن.

**سەنگەسیر:** بەربەسێڵ، چێشتی گۆشت و ماست. ف آش‌ماست و گوشت

**سەنگەڵ گوان:** گوانی ئاژەڵێک کە یەکیان لە یەکیان شۆڕتر بێ و شیری زۆرتر تێدابێ. ف پستان حیوانی که یکی از دیگری بزرگتر باشد

**سەواد بوونەوە:** سیواد بوونەوە، ڕوو کرانەوە، سەوازە بوونەوە لە کارێک ڕاهاتن و فێربوون. ف چشم و رو باز شدن.

**سەوازە بوونەوە:** ☜ سەواد بوونەوە

**سەوزاڵف:** دەبار، وێنجە و گزرەی وشکەوە کراو بۆ زستان، ئالیک. ف یونجەی خشک شدە

**سەوس:** گوناح، تاوان، سووچ، پیازە. ف گناە

**سەوڵەجان:** گۆچان، وەکاز. ف عصا

**سەهەلاب:** گیا سالمە، گیایەکە بستێک بەرز دەبێتەوە گوڵەکەی سوورە، بنێکی خڕی نەرمی هەیە وەک سێبنەعەرزیلە وایە و زۆر بەنرخە. ف گیا سلمە

**سەیوەت:** سەبر، تاقەت، تاملٚ. ف صبر، تحمل

**سێ بە گایە:** (+) گایەک کە لەگەڵ سێ جوانەگا لە جووتی دەکەن بۆئەوەی جوانەگاکان ڕاستاوێژ بن و زۆریش ماندوو نەبن. هەرجارێ یەکیانی تێدەکەن. ف گاوی کە با سە تا گاو جوان درخیش کار می‌کند، برای اینکە گاوهای جوان یاد بگیرند

**سێ و دوو لێ نەکردن:** خێرا و دەسبەجێ کارێک کردن، بەبێ بیر کردنەوە و شک و گومان کارێک کردن. *(بێئەوەی سێ و دووی لێ بکا کارەکەی بۆ کرد.)* ف انجام دادن کاری بدون تردید و گمان

**سیار:** تارمایی، تاپۆ. ف شبح

**سیازاخ:** (+) لاڕەشە، نەخۆشییەکی ئاژەڵە. ڕەشەکەوتە. ف سیاەزخم

**سیاسووت:** ڕاوە کەوی هەوەڵی بەهار. ف شکار کبک در اوایل بهار

**سیاکام:** بەڕاوە کەوێک دەڵێن کە کەوێک لە قەفەسدا دەبەنە کێو و داوی لە دەور دەنێنەوە، کاتێک دەخوێنێ کەوی دیکە دێن بۆلای و بەداوەوە دەبن. ف نوعی شکار کبک

**سێیاری شەو:** شەو درەنگان، زرینگانەوەی شەو *(سێیاری شەو تێپەڕیبوو.)* ف نصف‌شب

**سێبرەکی:** بە سەر لە یەکتردانی کەڵ و گا لە کاتی شەڕدا. ف کلەزدن گاو بە یکدیگر

**سێچاک:** عابا، کەوای شۆڕ. عابایەک کە سێلای شاقەلەکەی هەڵدڕاوی هەبێ. ف قبایی کە سە چاک داشتە باشد

**سیچڕ:** سووچەڕ، سیخوڕ، جۆرێ ژیشکی گەورەیە تیر دەهاوێ، سیخچوولە، تیرهاوێ. ف تشی.

**سیچرە:** جۆرێ چۆلەکەی کێوییە بەقەد پاساری دەبێ، پەڕشەخۆرە، پەڕشخۆرکە. ف نوعی گنجشک کوهی

**سیچەن:** ئۆقرە، ئارام. ف قرار، آرام

**سیچەن گرتن:** ئۆقرە گرتن، داسەکنان، هەدا دان. *(لە هیچ شوێنێک سیچەن ناگرێ.)* ف آرام گرفتن.

**سیخاسە:** خاسە سی، قازی دەشتی. ف غاز خاکستری

**سیخمە:** سوخمە، کلۆنجەی بێقوڵی ژنان. ف جلیقەی زنانە

**سیخوار:** سیخار، زوقم، خویز، خووسار، ئاڵشت، ئاڵیسکە. ف سرماریزە

**سیخوار لەپشت:** کەروێشکی قەڵەوی پایزان کە سیخوار لەسەر پشتی دەکەوێ. ف خرگوش چاق پاییزی کە سرماریزە روی پشتش می‌افتد.

**سیخه سیخ**: دەنگی هەناسە سواربوون *(سیخه سیخی سینگی دێ.)* ف خس‌خس سینه

**سیڕسکێن**: یارییەکی دوو کەسیە بە شەش داش دەکرێ و هەرکام لەو دوو کەسە یەکیان سێ بەرد هەڵدەگرێ و ئەوی دیکەیان سێ چیلکە بۆئەوەی داشەکانیان نەگۆڕدرێ. وەک دامە وایە. ف نام یک بازی است

**سیرۆش**: تینوو، توونی. ف تشنه

**سیروول**: مێشەنگوین. ف زنبورعسل

**سیره سەگانه**: ☜ پیازه سەگانه

**سیره قوڕاڵه**: ☜ سیره قوڕۆڵه

**سیره قوڕۆڵه**: کوڕاده، کنیواڵ، سێقنگ، جۆرێ سیری خۆڕسکە گەلاکانی وەک کەوەر وایە. ف نوعی سیر خوراکی

**سیره کوللۆره**: جۆرێک سیره گەلاکەی وەک پیواز لوولەییە لە دۆکولێوی دەکەن. ف نوعی سیر کوهی

**سیره گەنکه**: سیره مارانه، سیره بۆگەنه. ف نوعی سیر بدبوو.

**سێره هەڵگیران**: بریتی لە تاریک داهاتنی هەوا، واتە چاو هەتەر ناکا تا سێره بگری *(کاتێک گەیشتینە ئاوایی سێره هەڵگیرابوو)* . ف کنایه از تاریک شدن هوا

**سیرەونه**: قوونسوور، سوورقوون، گیایەکە بۆ دۆکولێو دەبێ ف نام گیاهی خوراکی

**سیس هەلاتن**: ☜ سیس هەڵگەڕان

**سیس هەڵگەڕان**: سیس هەلاتن، ژاکان. ف پژمرده شدن

**سیستر**: پەرستار، سستەر، سەرپەرشتیاری نەخۆش. ف پرستار

**سیسی**: (+) گیایەکە خۆی لە قەد گیا و گژی دیکە دەهاڵێنێ و وشکی دەکا، جله. ف گیاهی که آفت گیاهان دیگر است، پیچک

**سیێفی**: سێوی، هەتیو، سەغیر، بەتایبەت بۆ منداڵی دایک مردوو. ف بچه مادر مرده

**سێقنگ**: کوڕاده، قوڕاده، کنیواڵ. ف تره کوهی

**سیقوته**: قۆخەڕەشە. ف سیاه‌سرفه

**سیقه**: (+) نزگەره، بەرسینچکه. ف سکسکه

**سیک‌کردن**: زاراوەیەکە لە مێشێندا، یانی ڕووت کردن، پارە پێنەهێشتن. ف اصطلاحی در تیله‌بازی یعنی بردن تمام پولهای طرف بازی

**سیکلدانۆچکه**: لوولەی سیپەلاک، ئەو ڕەگە لوولەییانەی بە سیپەلاکەوەیە. ف شش

**سیکمه سیکم**: ) هاتووچۆ و مڵومۆی سەگ لە دەرک و بان؛ ) سۆکە سۆک، پیاوێک کە زۆر هاتووچۆی جێگایەک بکا و بیهەوێ بەزۆر کچێک سازکا. ف ) گشتن سگ و بوکردن زیاد؛ ) مرد هیز که زیاد به جایی رفت‌وآمددارد و عاشق است

**سیکوژ**: سەقر، باڵدارێکی ڕاوکەره، واشە، باشوو. ف قرقی

**سیکوێره**: جۆرێ مراوی کە لە قەراغ ئاوان دەژی. ف غاز پا زرد

**سیکەدانه**: سیکەتۆره، کوڵەزرگ، سیقەتۆره. ف سنگدان مرغ

**سیکەنەوسەرخان**: تێکە و لێکە، کەس لە کەس

*(سیکەنە و سەرخانێکە سەگ ساحەبی خۆی ناناسێ.)* ف بلبشو

**سیگناڵ**: بۆقی ماشێن، بۆڕی، هۆڕن. *(ئۆتۆمۆبیلەکە سیگناڵی بۆ لێدابن.)* ف بوق

**سیلۆخ**: کز و سیس و نەخۆش، لەڕ، مردەلۆخ، ڕیوەڵە. ف لاغر و مردنی.

**سیمڕ سیمڕ**: شانەچیرە، پاڵەپەستۆ، بە زۆر خۆ بە نێو ئاپۆرەی خەڵکدا کردن. *(سیمڕ سیمڕ دەبویست خۆ بە نێو حەشامەتەکەدا بکا و بێتەژووری.)* ف خود را به میان جمعیت چپاندن

**سیمرخ**:(+) سیخورمە، مشت قووچاندن و بە نووکی قامکە گەورە لە کەلەکەی کەسێک کوتان ف زدن کسی با مشت

**سیمکە**: (+) کەڵەوە، کەڵەمە، چوار داری کەوانییە لە نیرو ئامووردا دەخرێتە ملی گایەکان و لە بنەوە بە بەن کەڵەوە دەیبەستن. ف چهار عدد چوب کمانی شکل که گردن گاوها را به یوغ پیوند می‌دهد

**سیمۆت**: سامۆتە، سامۆرتە، کەژوو. ف فتراک

**سیوشکە گەیشتن**: بریتی لە توونییەتی زۆر، سیوشکە هەلاتن. *(هێندەی تینووە سیوشکەی گەیوەتێ.)* ف کنایه از عطش زیاد

**سیوشکە هەلاتن**: بریتی لە زۆر تینوو بوون، توونییەتیی زۆر *(هێندەم توونییە لەوانەیە سیوشکەم هەڵێ)* ف کنایه از عطش زیاد

**سیوڵ**: توێڵ، هەنی. ناوچاوان، جەمین. ف پیشانی

**سێوڵ**: قامک، کلک، تل، ئەنگوست. ف انگشت

**سێوە تاڵە**: جۆرێ سێوی خۆڕسکی وردە زیاتر بە شاخ و کێوەوە دەڕوێ. ف نوعی سیب تلخ

**سێوە ترشە**: جۆرێک سێوی ورد و ترشە دارەکەی خۆڕسکە و زیاتر بە شاخ و کێوەوە دەڕوێ. ف نوعی سیب ترش

**سێوەڵووکە**: سێفەڵووکە، گیایەکی گەڵا پانە بەرێکی خڕ دەگرێ و دەخورێ. ف نام گیاهی است خوردنی

**سێهک**: سێبەر، سێوەر، سێتاڤ، سا، سیهسیتاڤک، نیسێ. ف سایە.

**سێیینە**: سێ دانەیی، سێ شتی پێکەوە نووساو، ف سەگانە.



**شا بە سەپان نەگرتن:** بریتی لە کەسێک کە لە ژیانی هەژارانەی خۆی ڕازییە و ژیانی خۆی بە هیچ کەس ناگۆڕێتەوە. *(هێندە دڵخۆشە شا بە سەپان ناگرێ.)* ف کنایە از زندگی فقیرانە و شاد بودن

**شاپک:** ڕانک، پاتۆڵ. ف شلوار

**شات:** دیلدیلە، دارێکە سەرەتەنەکە یا شتێکی پان و خڕی پێوە دادەکوتن منداڵ لێیدەخوڕن و کایەی پێدەکەن. ف اسباب‌بازی دست‌ساز

**شات بەستن:** هەڵخولان و ڕۆیشتنی شتی پان و خڕ *(پارەکەم لەدەست کەوتە خوارێ و شاتی بەست.)* ف چرخیدن و دور گرفتن چیز گرد برروی زمین

**شاتا:** ئیشتیا، مگێز. ف اشتها

**شاتانەسەرە:** گیایەکە وەک بڕکەی شووتی وایە بەرێکی چکۆڵە دەگرێ بەقەد هێلکەیەک دەبێ و کاتێک دەقەڵەشێتەوە ناوەکەی سوورە و تامی زۆر تاڵە. ف گیاهی شبیه هندوانه

**شاتشاتێن:** یارییەکە بە شات دەکرێ. ف چرخ‌بازی

**شاتەتیری:** نان‌تیری، نانی تەنکی تەندوور. ف لواش

**شاجۆگە:** جۆگەی گەورە کە ئاوی پێدا بچێ بۆ چەند جۆگەی چکۆڵەتر. ف جوی بزرگ

**شاخ دەرهێنان:** بریتی لە سەرسووڕمانی زۆر *(هێندەم پێسەیر بوو وەختەبوو شاخ دەرهێنم.)* ف تعجب کردن

**شاربەگڕ:** وشەیەکە لە قەرێ قەرێدا ئەو کەسەی دەست لە شار دەدا و گول ناکرێ دەڵێ شاربەگڕ. ف کلمه‌ای در قایم‌باشک بازی

**شاربێژ:** جۆرە پارچەیەکی قەدیمی بوو بۆ کراسی ژنانە. ف نوعی پارچەی قدیمی زنانه

**شارشارێن:** شارشارکێن، ناوی یارییەکی منداڵانە، قەرێ قەرێ، خۆشارکێ. ف بازی قایم‌وشک

**شارۆ کردن:** گەڕان، توێژینەوە، لێکوڵێنەوە. ف پیجویی کردن

**شارۆ:** (+) دووبارە پێداچوونەوە. *(پەروەندە جارێکی دیکە شارۆ بکرێ باشە.)* ف تجدیدنظر

**شارۆچکە:** شاری چکۆڵە، شارە دێ، شارۆکە.

ف شهرک
**شارۆمەند:** هاوشاری، خەڵکی شار، شارستانی. ف شهروند
**شاروەدەر:** ☜دەرەوشار
**شاسوار:** (+) دڕوویەکی شینە *(دڕکە شاسوار ئەو دەشتەی داپۆشیوە)* ف نام خاری است
**شاغی:** وەحشی، دڕندە. ف وحشی
**شاف و لاف:** شاتوشووت، خۆ هەڵکێشان. ف لاف و گزاف
**شاقز:** ) شاکار؛ ) کچی جوان، کیژی چەلەنگ) لەخۆبایی، بادیهەوا، بەدەمار، قۆڕەدەماخ.. ف ) شاهکار؛ ) دختر زیبا ) متکبر.
**شاکەزی:** شابسک، زوڵفی گەورە لەسەر تەوێڵ. ف کاکل
**شالان و دالان:** ناوێکی خەیاڵییە بۆ ترساندنی منداڵ دەیڵێن *(نەگریی ئەوە شالان و دالان لە حەوشەیە.)* ف *کلمەای برای ترساندن کودک.*
**شالاو کردن:** قەشە لێدان، ڕنەک لێدان، خوراندنی پشتی مالات بە ڕنەک. ف خاراندن پشت احشام با برسی مخصوص
**شاڵدان:** شۆردنی کەڵ و گامێش. *(ئەو کەڵ و گامێشانە بەرە لەو چۆمە شاڵیان دە.)* ف شستن گاومیش
**شاڵسۆن:** پارچەیەکی قەدیمی ژنانە بوو دەیانکردە کراس. ف نام یک پارچەی قدیمی زنانه
**شالق:** لقی گەورەی دار کە لک و پەلی زۆری پێوەیە. ف بزرگترین شاخەی درخت
**شالک:** (+) شالق، لقی هەرە گەورەی دار. ف شاخەی اصلی درخت
**شامپۆ:** تراوکەی سەرشتن. ف شامپو
**شامەرگ:** مردن لەبەر خۆشی و شادی. *(لە خۆشیانا شامەرگ بوو.)* ف مردن از شادی
**شامەڵحەم:** ناوی گیایەکە مەڵحەمی برینی لێ ساز دەکەن. ف نام گیاهی دارویی
**شامی چلە:** سفرەی چوارشەممە سووری، کە نۆک و گەنمەشامی و کونجی و چەوان و گەنم و گوڵەبەڕۆژە و شووتی و تونگەیەک ئاو دادەنێن. ف سفرەی چهارشنبەسوری
**شانگ:** (+) شانە، شەی. ف شانه
**شانەدەر:** ئەشکەوتێکە لە ناوچەی هەولێر یەسک و پرووسکی نیاندەرتاڵی تێدا دۆزراوەتەوە. ف غاری در کردستان
**شانەڕەقە:** قۆڵنج، کۆڵنج، سەرمابوون و شان و مل داگیران. ف قولنج
**شانەسەرە:** بووبووکەرە، پەپووسلێمانکە، خاتوو سێمانکە. ف هدهد
**شانەمەرگ:** شاگەشکە، کەشکە کردن لە خۆشیانا. ف غش کردن براثر شادی
**شاوە سپیلکە:** باڵدارێکی سپییە لە لەکلەک گەورەترە زستانان زۆرە. ف اگرت بزرگ
**شاوەرس:** لە بنەماڵەی شا، شازادە *(هێندە بەفیز و دەمارە دەڵێی شاوەرسە.)* ف شاهزاده
**شاوەڕیخنە:** جۆرێ باڵداری سپییە بەقەد کۆترێک دەبێ لەنێو گاڕاندا دەبیندرێ و لەسەر پشتی گا و کەڵ دەنیشێ و مێشی سەر پشتیان

ڕاو دەکـا، زیـاتریش لـەدەم چـۆم و دەراوان دەسـووڕێتەوە *(شـاوەڕێخنـە دەگـەڕێ وا لـە دەراوی چۆمەڵ/ دینی دینی گوڵە ئەو بولبولی دڵ پڕ لە ئەوین. «هێمن»)* ف نام پرندەای است. گاو چرانگ

**شاوەزردکە**: باڵدارێکی مەیلەو زەردە، کاکۆڵێکی ڕەشی هەیە لاقی درێژە و بەقەد لەکلەکێک دەبێ. ف حواصیل ارغوانی

**شاوەسوڵتانی**: باڵدارێکی لاقدرێژی کاکۆڵدارە شێوەی شاوەزردکە دەدا و لەو چکۆلەترە. ف حواصیل خاکستری

**شاوەعەسڵە**: ☜ شاوە سوڵتانی

**شاوێژ**: ) ئاوی کەم، وردەزنە، گۆلاوی چکۆلەی لە پەنا یەک ) گیایەکی گەلا پانە، گەلاکانی پڕ بە پڕ پێکەوە دەنووسێن و بە زەوییەوە پان دەبێتەوە. شاڤێر. ف ) نام گیاهی است) آب اندک

**شای ژنان**: سەرەژن، ژنی ماڵدار و کەیخوا، کەیخوداژن، *(وەکورە نان و وەکورە دۆ/ بەرخەل بەرە بەرە و جۆ/ شای ژنانە دایکی تۆ «فۆلکلۆر»)* ف زن دانا و کدبانو

**شایی جندۆکان**: گێژەڵووکە، باهۆز، گەرەبا، گەردەلوول، باگەڕ، وێولەجنانێ، عێوارەش، زەمەن، داوەتە جندۆکان، گێژەبا، گەرەپێچ، گەردەبل، سایکلۆن. ف گردباد

**شبری**: کورتان، شەکار، کۆپان. ف پالان

**شتیر**: شینکە و چیمەنی قەراغ ئاو و کانی لە چیادا. ف سبزەی کنار چشمه

**شڕ و پەتۆر کردن**: لەتوکوت کردنی جلک و لیباس کە چاک نەکرێتەوە. ف پارە و پورە

**شڕۆڵ**: کەسێک کە جلی شڕ و دڕاو لەبەر دەکا. ف کسی کە لباس پارپورە بە تن دارد

**شڕە گێڕانەوە**: بریتی لە بەدەستهاتنی کاروباری ژیان. ف کنایە از توانایی کار و بار زندگی

**شڕە گێڕەوە**: بریتی لە کەسێک کە توانایی کارێکی هەبێ. *(باشە دەتوانێ شڕە بگێڕێتەوە.)* ف کنایە از کسی کە میتواند کاری انجام دهد

**شریت**: (+) نەواری زەفت، کاسێت. ف کاست

**شغاتە**: شقارتە، شەمچە، شقاڵتە، شخاتە. ف کبریت

**شڤرەشکی**: کوێر، ئیتۆن، نابینا، کۆر. ف کور

**شلێپتاو**: بریتی لە چێشتی ئاوەکی و بێتام و ناخۆش. ف کنایە از شوربای بیمزە.

**شڵتان**: خڵتان، شەلاڵ، خووسان بە ئارەقە یان خوێن. *(شڵتانی خوێنە ئازای ئەندامی.)* ف خیس شدن براثر عرق یا خون

**شلکەبیزا**: گیا سیرێژ، گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانە. ف نام گیاهی است

**شلۆ**: جۆرە کراسێکی قەدیمی ژنانە بوو. ف نوعی پیراهن قدیم زنانە

**شلوێ**: (+) لێڵ، تێکچوون، ڕەنگ گۆڕان *(سەد قسەی پێبڵێی شلوێ نابێ.)* ف ناراحت، رنگباختن

**شلەپێدان**: نەرمی نواندن، دەغەڵی کردن لە کاردا *(لەقەستی شلەی پێدا و خۆی گێل کرد بۆ ئەوەی دەربازی بکا)* ف تنبلی و نرمی نشان

دادن در امری

**شمشه کێشان:** شمشەکاری، ڕاست کردنەوەی دیوار بۆ سپیکاری.ف میزان کردن دیوار برای گچکاری

**شمشێری:** ) جۆرێک برینجی باش و بۆن خۆشە؛ ) جۆرێک قۆڵی کراسی ژنانەیە. *(کراسەکەم با قۆڵەکەی شمشێری بێ.)* ف ) نوعی برنج؛ ) نوعی دوخت برای آستین پیراهن زنانه

**شملی بەرەکەت:** شەنگڵە بەرەکەت، شەنگڵە.ف دو دانه میوەی بهم چسبیده

**شن:** ناوی دارێکە باڵا پیاوێک بەرز دەبێتەوە گەڵای وەک گەڵای سێوەڕە وایە و گەورەترە. ف نام درختچه‌ای است با برگهایی شبیه شبدر

**شنروێ:** ناوی چیایەکە لە نزیک شاری هەڵەبجە.ف نام کوهی در نزدیکی شهر حلبچه

**شنگە ماینانە:** گیایەکە لە مێرگدا شین دەبێ لاسقەکەی شیرێکی ڕەشی هەیە و دەخورێ.ف نام گیاهی خوردنی

**شنوە:** (+) لوورەی گورگ. *(شنوەی گەلە گورگ لەو دۆڵەدا دەنگی دەدایەوە.)* ف زوزەی گرگ

**شواڵ پلیت:** شواڵ چەپەڵ، داوێن پیس، داوێن تەڕ.ف زناکار

**شواڵ چەپەڵ:** دواێن پیس، زیناکار، شواڵ پلیت. ف زناکار

**شوان گیلکەرە:** شوان خەڵەتێنە، شوان هەڵخەڵەتێنە.ف بوتیمار.

**شۆر:** (+) گیایەکی گەڵا وردی ساقەت سوورە لەجێگای مەیلەو شۆرەکات شین دەبێ.ف گیاهی شورەزاری

**شۆڕشڤان:** شۆڕشگێڕ.ف انقلابی

**شۆڕشوان:** ☜ شۆڕشڤان

**شۆڕشۆڕک:** تاڤگە، ئاوشار، ئاو هەڵدێر، سۆلاڤ، قەڵبەزە.ف آبشار

**شۆڕک:** تاڤگە، شۆڕشۆڕک.ف آبشار

**شۆرکە:** (+) کەژوو، کەژگ.ف نوار پهن تنگەی ستور

**شۆق لە تەپاڵە بڕین:** بریتی لە زۆر ناحەز و دزێو. بە کینایە دەڵێن هێندە جوانە شۆقی لە تەپاڵە بڕیوە.ف کنایه از آدم زشت

**شوقەلەت:** ستێرک، سەکۆی ڕەشماڵ.ف سکوی سیاچادر

**شوکا:** پاڕانەوە، تکا، ڕەجا، سکالا.ف شکوه

**شۆکە:** دۆکە، سپیایی ئارەق کە بە جل و بەرگەوەیە. *(لێو پشتی هێندەی شۆکە دەرداوە دەڵێی دۆی پێدا ڕژاوە.)* ف شورەی عرق

**شۆلاوگە:** کۆبوونەوەی ئاو یان خوێن لە شوێنێک *(هێندەی خوێن لەبەر ڕۆییوو لەبەر پێیدا شۆلاوگەی بەستبوو.)* ف جمع شدن آب یا خون در جایی

**شوو لێ هەڵکێشان:** بێ حەیایی و ڕووهەڵماڵدراوی لەڕادەبەدەر. *(بەجارێ بۆتە کەڵەگا و شووی لێ هەڵکێشاوە.)* ف روداری بیش‌ازحد

**شووتی بڕەکێن:** کایەیەکە بە شووتی دەکرێ، هەرکەس شووتیی خۆی دەبا و لەسەر جێگایەکی لێژ بە ڕیز دایدەنێن و تلاری

دەکەنەوە شووتی هەرکەس زیاتر بڕوا شووتییەکانی دیکە هەڵدەگریّ بۆ خۆی.ف نوعی بازی با هندوانه

**شووتی وەبن هەنگڵ دان:** بریتی لە تاریف کردن بۆ فریو دانی کەسێک. *(بەسمان شووتی وەبن هەنگڵ دە.)* ف کنایە از تعریف کردن از کسی به منظور فریب دادن

**شووخاڵ:** شوێنی لێدان لەسەر پێست *(وای لێداوە بە تووڵکە تەڕ جێگاکەی شووخاڵی هەستاوە.)* ف جای ضربەی چوب و تازیانه بر پوست

**شووش:** شووخاڵ، هەموو جێی *قامچییەکە شووشی هەستابوو.)* ف جای تازیانه بر پوست بدن.

**شووڵ سایەد:** ئەو شوولانەی لە پشت جۆخین دەیچەقێنن بۆئەوەی کاتی شەن کردن نێوانی دان و کا دیاری بکا.ف ترکەهای میان خرمن و تودەی کاه.

**شەباک:** (+) شیشبەندی سەر چاک و پیرانف نردەی مزار و امامزاده

**شەبوون:** کۆن بوون، لە نرخ کەوتن.ف کهنه شدن

**شەبەنگ:** شووشەی چەند پاڵوو کە نوور دەکاتە چەند ڕەنگ.ف طیف

**شەپەتێڕیّ:** ناوی یارییەکی منداڵانەیە.ف نام یەک بازی بچەگانه

**شەتڵ:** (+) شەلال، شەڵتان، خووسان بە خوێن یان ئارەقە. *(شەتڵی خوێناوم منی سارده برین/ خەج لە کوێیە بۆم بگێڕیّ گەرمەشین «هێمن».)* ف آغشته

**شەتەکاندن:** شەتەک دان، توند بەستن. *(خودایە تۆ چ نەکەی چ نەکرێنی/ تا کاری من بسازێنی/ بابی من گەنمی دەکا زریزانەی بێنی/ چەڵتووکی دەکا دارووجان بێنی/ تووتنی دەکا کەڵەی بێنی/ چونکە من دەداتەوە بە گولەیەکی سیّ جار سی ساڵ شەو هەتا ڕۆژ پشتی خۆیم پیّ دەخورێنی/ نامداتەوە بە جحێڵەکی چوشت و چالاک/ وەکوو ڕیزی فیشەکدان لە قەدی خۆیم بشەتەکێنی «حەیران».)* ف محکم بستن

**شەخسە:** شەختە، پایزە.ف ☜ پایزه

**شەخسە:** شەختە، پایزە، سەرمای پایز کە بێستان دەشەمزێنیّ. *(بێستانەکە شەخسە لێیداوە.)* ف خراب شدن جالیز براثر سرمای پاییز

**شەرا:** بیّهۆش بوون لەبەر ژان پێگەیشتنی زۆر. *(هێندەی پەش پێگەیشت چووە شەرای مەرگ.)* ف بیخود شدن براثر درد شدید

**شەرا:** هەوربردوو، گەنمێک کە بەر لە کاتی قەفوگوڵ وشک دەبیّ. *(وەک گەنم قەرقوو شەرا بردیەسەم/ قسەی هاتوهووت ناکەس کوشتییەسەم. «فولکلۆر».)* ف گندمی کە قبل از گل دادن میخشکد

**شەرتپەڕین:** تەواوبوونی وادەی شوانی، کاتی دانیشتنی شوان.ف تمام شدن مدت چوپانی

**شەرتە شوانی:** گیسک یان کاوڕێک کە لە کاتی شەرتپەڕینی شواندا پێیدەدەن *(حەوت ساڵ*

*شوان بووم قەدریان نەزانیم/ کاوڕێکیان دامێ بۆ شەرتە شوانیم «فۆلکلۆر».)* ف بز یا بزغالەای کە در هنگام بەپایان رسیدن خدمت بە چوپان می‌دهند

**شەرعی ماری بە داری:** شەڕ کردن لەگەڵ مار بە دار دەکرێ، یانی مار کە هێرشی بۆ هێنای بە دار لەگەڵی بجووڵێوە، ئاماژەیە بە مارەکەی شێخ هۆمەری کە مارەکە لە سەرما و کەسیرە بوون نەجات دەدا و دەیباتەوە ماڵێ، کاتێک مارە گەرمی دەبێتەوە دەڵێ چونکە ئەو چاکەیەت لەگەڵ کردووم پێوەت دەدەم چونکە جوابی چاکە خراپەیە. ناچار دەچن بۆ شەرع لە لای دار و کانی و ئەوانیش هەق بە مار دەدەن و دەڵێن پێوەی دە چونکە جوابی چاکە خراپەیە. هەتا ڕێوی فێری دەکا بەشێوەیەک دار هەڵگرێ و مارە بکوژێ. بۆیە دەڵێن شەرعی ماری بە داری. ف داوری کردن برای مار باید با چوب باشد، یعنی ما را باید با چوب کشت

**شەڕلاتان:** مرۆی بێحەیا و شەڕانی، کەسێک کە بۆ شەڕ کردن لە بەهانە دەگەڕێ. ف شارلاتان

**شەرمنۆک:** شەرمێون، شەرمن. ف آدم خجالتی

**شەرمەگیلاخە:** بریتی لە کەسێک کە شەرم دەکا بەڵام لە دڵەوە پێیخۆشە. ف کنایە از کسی کە شرم می‌کند اما از تەدل راضی است

**شەرمەون:** شەرمێون، شەرمن، شەرمۆک، فەهیتۆک، فەدیۆک. ف خجالتی

**شەڕۆڵ:** شەڕانی، شەرخواز، جینگزی. ف ستیزەجو

**شەڕەبا:** بای توند و گێژ دانی، پێکەوە هاتنی شەماڵ و زریان بە توندی. ف وزیدن باد شمال و جنوب با هم

**شەڕەفر:** شەڕە جنێو بە گاڵتە و بە شیعر، شەڕە قسە و ناونیتکە لە یەک هەڵدان بە شۆخی *(دەتبەمە سەر ناڵەشکێنە/ هەر دەتگێم و بەرد بشکێنە* یەکێکت لێدەم سووری سێ‌گری/ سێ مانگەی زستان خودا بتگری* دەتبەمە سەر چاڵە نیسکێ/ تێت‌دەبرم حەوت گونە گیسکێ)* ف هجو یکدیگر با شعر

**شەڕەکەر:** ) شەڕ کردنی گوێدرێژ ) بریتی لە شەڕ و لێکدانی دوو یان چەند کەسی نەفام و هەرزە. ف ) جنگ خرها با هم ) جدال چند نفر احمق و هرزە

**شەش‌ئاگر:** ☜ شەشلوول

**شەش‌تەقەڵ و مانگەشەو:** بریتی لە تەقەڵی درشت و گەورە لێدان، تەقەڵ ترۆزی. *(پاتۆڵەکەی شەش‌تەقەڵ و مانگەشەو بۆ دووری.)* ف کنایە از دوختن لباس با بخیەی درشت

**شەشخان:** ) +) ساپساپانێ، یارییەکی منداڵانەیە بە لەتێک سواڵەت یان بەردێکی پان دەکرێ، لەسەر عەرزەکە شەش خانەی گەورە دەکێشنەوە لەسەر لاقێک دەبێ بە نووکی لاقی لە بەردە پانەکە هەڵدا و نەهێڵێ بکەوێتە سەر خەتەکان، بەردەکە بکەوێتە سەر خەتەکان دەپرووزێ. ف نام یک بازی کودکان

**شەشدەم:** بریتی لە مرۆڤی زۆربڵێ و چەنەوەر.

*(شەشدەمێکە هیچکەس دەرۆستی نایە.)* ف کنایە از آدم وراج و پرگو

**شەشلوول:** جۆرێ دەمانچە، شەشئاگر. ف نوعی تپانچە

**شەشوبێش:** بریتی لە هەڵەخەرجی و دەست پێوە نەگرتن. بەمشە خەرج کردن، دەست پێوە نەگرتنی پارە، *(رۆڵە گیان تۆزێ دەست پێوە بگرە بۆ ئاوا شەش وبێش پارە خەرج دەکەی.)* ف کنایە ازعمل آدم ولخرج.

**شەعف:** پرچ، کەزی، بسک. ف زلف

**شەغڵەمە:** دەنگەدەنگ، هەرا و هوریا، زەنازەنا. ف سروصدای زیاد

**شەڤشەڤۆک:** شەمشەمەکوێرە، پارچک، چەکچەکی. ف خفاش

**شەڤوو:** وزەی مەعنەوی، هێزی واتایی. ف نیروی معنوی

**شەقاوقوش:** باڵندەیەکە وەک سی وایە گۆشتی دەخورێ. ف نام پرندەای است

**شەقشەقە:** (+) گیایەکە گوڵ دەکا و پاشان تۆوی گوڵەکەی لەنێو قۆزاخەکەیدا وەک خرخاشەی منداڵ خرەی دێ. ف نام گیاهی است

**شەققە:** دەنگی لە یەک کەوتنی شتی رەق و پان. ف صدای بەهم خوردن دو چیز پهن و سفت

**شەققەی قەڵماسک بیستن:** بریتی لە چاوترسێن کران و تەمبێ کردن. *(هێشتا شەققەی قەڵماسکی نەبیستووە بۆیە وا دەمی گرتووە.)* ف کنایە از ترسیدن و زهرچشم گرفتن

**شەقەباخی:** جۆرێ کوولەکەی گەورە و شیرینە. ف کدو حلوایی

**شەقەجووت:** جوانەگایەک کە فێری جووت کراوە و لەگەڵ گایەک جووتی پێ دەکەن. *(جوانەگاکەم راستاوێژ کردووە و بۆ بەهاری دەبێتە شەقەجووت و لەگەڵ گایەکە دێتەوە.)* ف گاو جوانی کە شخم زدن یاد گرفتە باشد

**شەک:** (+) بە تاجیی دوو ساڵە دەڵێن. ف تازی دو سالە

**شەکرەخەنە:** بزەی شیرین. ف شکرخند

**شەکرەسێو:** ف نوعی سیب ریز تابستانی

**شەکە زەکات:** زەکات دەر کردن لە شەک و کاوڕ. ف زکات دادن برە

**شەکی:** (+) دارێکی جەنگەڵییە بەرێکی وەک فندق دەگرێ، ناوی تووسکوولە. ف نام درختی جنگلی

**شەگەلات:** چیکۆلانە، چۆکلێت، نوقڵ و مینوو. ف شکلات

**شەلپینی:** دەربەدەری، ئاوارەیی. ف آوارگی

**شەللاتی:** بێشەرم، بێحەیا. ف بیشرم

**شەلەل:** فەلەج، نوقستان. *(ماوەیەکە تووشی شەلەل بووە.)* ف فلج

**شەمۆلکە داگرتن:** مووش کردن، پیش خواردنەوە. ف خودخوری کردن

**شەمووتدان:** دەورەدان، گەمارۆدان، تێورووکان، تێمرووکان. ف دور گرفتن

**شەمەخولە:** گێژ و گەوج، حەپەحۆل، گەلحۆ ف گیج و ابلە

**شەمەن:** بوتپەرست. ف بتپرست

**شەمێلە:** (+) بۆ خۆشەویستی بە شەمێ دەڵێن.

*(زۆر لەمێژە نارە ناری منی نەبیست/ هەر وەکوو شەمزین شەمێلەی خۆشدەویست «هێمن».)* ف به خاطر دوست داشتن به شەمی می‌گویند

**شەنگ**: هێز، توانا *(شەنگی ڕۆیشتنم نییە.)* ف رمق، توان

**شەنگست**: پرنسیپ. ف مبادی

**شەنگۆڵە**: مرۆڤی شەش قامک، شەشۆ. ف شش انگشت

**شەنگە شەپال**: زۆر جوان، بەدەو، دەلال. ف بسیار زیبا

**شەنە**:(+) گەنمێک کە هێشتا نەگەیشتووە و کاتی دروێنەی نەهاتووە. ف گندمی کە هنوز نرسیده و آمادەی درو نیست

**شەنەبا**: ) شەن کردن، خۆیان هەڵاویشتن؛ ) بای شەن کردن. ف ) برباد دادن خرمن؛ ) بادی که برای برباد دادن خرمن مناسب است

**شەنیار**: شەنکەر، شەنەدێر. ف کسی که خرمن باد می‌دهد

**شەو دە شەو بەزین**: درێژبوونی شەو، *(پایزە شەو دەشەو بەزیوە.)* ف دراز شدن شبها در پاییز

**شەو دە شەودا بوون**: ☜ شەو دە شەو بەزین

**شەو ڕەو کردن**: مەڕ وەسەر گەڕان، ڕادانی مێگەل لەسەر پەرچە بە شەودا. ف رفتن گوسفندان شبانه هنگام استراحت

**شەو زرینگانەوە**: شەو درەنگ بوون، لە نیوە لادان. *(شەو زرینگاوە و ئەمن ناڵەی دڵم هەر بەرزە شەو.)* ف از نیمه گذشتن شب

**شەو سووتکە**: (+) جۆری زیپکەی وردی سوورە لە منداڵی ساوا دێ. ف نوعی جوش قرمز بچه خردسال درمی‌آورد

**شەوارکی**: شەونشینی، دانیشتنی شەوانە لە دەوری یەک. ف شب‌نشینی

**شەوپەڕ**: فڕینی کەو لە کاتی بوومەلێڵی بەیانیدا. *(کەو شەوپەڕ دەکەن و لەمبەر و ئەوبەر دەخوێنن.)* ف پریدن هنگام صبحگاه

**شەوخەف**: ) چرای شەوانە بۆ خەوتن، گڵۆپی کەم شۆقی خەوتن، شەوخەو؛ ) بەستۆکەیەک لە سەری شەوەوە هەتا بەیانی لای پیاو دەمێنێتەوە. ف ) چراغ شب‌خواب؛ ) روسپی‌ای که از اول شب تا صبح پیش مرد می‌ماند

**شەوخەو**: ☜ شەوخەف

**شەوڕن**: ڕنینی بێستان بە شەودا. *(دێم و هەڵدەمژم شنەی کوێستانی کورد/ دێم و دەچمە شەوڕنی بێستانی کورد. «هێمن».)* ف دستبرد شبانه به جالیز

**شەوڕەو**: (+) جۆری کرمی نۆکە ڕیشەکەی دەخوا لە بن خۆڵەوە. ف نوعی آفت نخود

**شەوگورد**: ) شەوگەڕ، لاوێک کە لەم دێ بۆ ئەو دێ بە شەودا دەڕوا بۆ ژوان؛ ) تەختە جاجم، بەرماڵ، دوو شەوگورد دەبێتە بارماڵێک. ف ) شبگرد؛ ) قطعه جاجیم و سجاده

**شەوگەڕ**: (+) جۆرێک ماری بۆرە بە شەودا دێتە دەرێ و دەگەڕێ. ف نوعی مار شبگرد

**شەوەکەژ**: لەوەڕاندنی ئاژەڵ بە شەودا، شەو لەوەڕ. ف چراندن گله در شب

**شەیتان بازاڕ**: بازاڕی ڕەش و پڕ فێڵ و تەڵەکە. ف شیطان بازار

**شەیدانک**: کونجی، دانەوێڵەیەکی وردە ڕۆنی لێدەگرن. ف کنجد

**شەیەتویتۆن**: گێژەڵووکە، گەردەلوول، سایکلۆن، گەڕەپێچ. ف گردباد

**شیپاڵ**: شڕ، دڕاو، پەتۆر. ف پارە، پارچەی پارە و پورە

**شیپاڵدڕ**: شڕ و پەتۆر، شڕووڕ، پەڕۆی لەتوکوت کراو. ف پارە و پورە

**شیپۆک**: منگن، گن، کەسێک کە لە لووتدا قسە دەکا. ف کسی کە تودماغی حرف میزند

**شیتەشیت**: هەراهەرا، چەقەچەق، شیڕەشیڕ. *(دە بەسە ئیتر شیتەشیت مەکە مێشکی سەرت بردم.)* ف غرولند کردن

**شێتەڵ**: شەیدا، ئاشق، بەنگین. ف عاشق

**شێتەڵە**: شێتۆکە، سەرشێت. ف دیوانە

**شێتین**: ) شلەتین، شیلەوگەرم، شیرتین؛ ) دێوانەین، ئێمە شێتین. ف ) آب ولرم؛ ) دیوانەایم

**شێخز**: جۆرێ ماینی مەیلەو خۆڵەمێشییە. *(دەڵێی ماینی شێخزە.)* ف نوعی مادیان خاکستری

**شێخەڵ**: نەمامی یەکساڵەی بەڕوو و مازوو. ف نهال یک سالە بلوط و مازوج.

**شیروشەپاڵ**: جۆرێ گوڵی سپی خۆڕسکە، بەیبوون. ف بابونە

**شێروکۆڵ**: دارێکە دەیدەنە بەر کۆڵەکە و بە چەند پیاو لە سەرەکەی تری دەنەون و میچی پێبەرز دەکەنەوە بۆئەوەی دەستەک بگۆڕن یان دەستەکی دیکە لە میچەکە هەڵکێشن. ف اهرم

**شیرانە**: شیربایی، هەقی شیر کە لە لایەن زاواوە دەدرێ بە ماڵی بووک. ف شیربها

**شیرسووت**: ئەو منداڵەی بە هۆی خواردنی شیری زۆرەوە کزولاواز دەبێ. ف کودکی کە بر اثرخردن شیر زیاد لاغر می شود.

**شیرشیرە**: جیکجیکە. ف زنجرە

**شێرە بەفرینە**: دروست کردنی پەیکەرە بە بەفر *(لەبیرمە شێرە بەفرینەم دەکرد سواری دەبووم بێزین/ نسێ بوو جێگەکەی دەیبەست دەما تاکوو دەمی هاوێن. «پیرەمێرد».)* ف شیر برفی

**شیرە تێپەڕین**: گەنم و جۆیەک کە کاتی دوورینەوەی نزیک بووبێتەوە، زەرد بوونی گەنم و جۆ. ف زرد شدن گندم و جو

**شیرین بەلەک**: مێکووک، شیرین بەیان. ف شیرین بیان

**شیرین بەیان**: ) گیایەکی دەرمانییە، مێکووک؛ ) قسە شیرین. ف ) گیاهی دارویی شیرین بیان؛ ) شیرین سخن

**شیرین خێل**: کەسێک کە چاوی خێلە بەلام زۆری لێ جوانە. ف لوچ زیبا

**شیرین شۆک**: گیایەکی کوێستانییە گەڵا پانە بستێ لە زەوی بەرز دەبێتەوە گوڵێکی سووری جوان دەردەکا سەلکەکەی وەک پیواز وایە تامێکی شیرینی هەیە. ف نام گیاهی است

**شیرینشەل**: کەسێک کە شەلینەکەی لێ جوانە

و وەک سۆنە لەنجە دەکا.ف کسی کە زیبا می‌لنگد

**شیرینەکڕ**: کڕ کەوتنی کەو ئەوکاتەی کە دوو سێ ڕۆژی دەمێنێ هێلکەکانی هەڵێنێ و زۆری لێ نزیک دەبییەوە هەڵنافڕێ و بە ئاسانی بەدەست دەگیرێ.ف خوابیدن کبک برروی تخم و چند روز مانده به سر درآوردن جوجەها از تخم که خیلی نزدیک می‌شوی پرواز نمی‌کند

**شیشبەند**: نەردەی قەراغ شەقام و باخ و پرد، تەلبەند، لاجامە.ف نرده

**شیش‌کوت**: پشکێنەر، کەسێک کە بە شیش بار و شت دەپشکنێ.ف مفتش

**شیشلۆق**: زلکوێر، چاوی زل و دەرپەڕیو و بێ‌سۆما. چاوزەق. *(یاخوا کوێر بێ سەمەدخان/ بۆ ژنێ بۆ منی هێناوە/ چاوی دەڵێی شیشلۆقە/ جا وەرە لێی مەتۆقە. «فولکلۆر».)* ف کسی کە چشمش بیرون زده و کم‌بینا است

**شیشۆڵ**: سمۆرە.ف سنجاب

**شیڤ**: چرۆ، پشکۆژ، خونچە.ف شکوفه

**شیڤیار**: جووتیار، وەرزێڕ، جووتبەندە، جووتێر. ف کشاورز

**شیق**: قەڵەشت، درز.ف شکاف. ترک

**شیق بردن**: شەق بردن، قەڵەشان، درز دان.ف ترکیدن، شکاف برداشتن

**شیکار**: ) کەسێک کە خوری و لۆکە شی دەکاتەوە؛ ) توێژەر، ڕاڤەکار.ف ) کسی که پشم و پنبەزنی می‌کند؛ ) شارح

**شێڵانە**: قەیسی، شەڵانە (لەداخی خەڵکی ئەو خوارەی بەکشمیشی دەڵێن مێوژ/ ئەمن شەرتە لەمەولاوە بەشێڵانە بڵێم گێوژ «حەقیقی») .ف زردآلو

**شیلخە**: خاویلکە، دەست و پێ سپی. *(ئەو هەتیوە شیلخە هەر دەڵێی نەمییوە هیچ کارێکی لەخۆی نەگرتووە.)* ف دست و پا چلفتی

**شیلە**: ددانی ماڵات و جوانووە ئەسپی سێ ساڵە کە لە ئاخری ددانەکانی پێشەوەی دەردێ و لە پێنج ساڵیدا دەکەوێ و بەرازە کە کەڵپێکی تیژە لەجێی سەردەردێنێ. *(مانگاکە شیلەی نەماوە.)* ف دندان حیوان

**شیلەسواغ**: گەسکەسواغ، سواغدانی دار و دیوار بە قوڕاوی سپی.ف گلکاری دیوار

**شیلەماڵ**: شیلەسواغ، سواخێکی تەنک و جوان بۆ دار و دیواری ناوەوەی ماڵ.ف گل اندود کردن نازک

**شێلێ بوون**: شێوان و بەسەر یەکدا دران، تێکەڵ و پێکەڵ بوون.ف تشویش

**شیمڕ**: شاڵاو، هاشاوڵ، شاتاوڵ.ف یورش

**شین بەش**: کەڵ و گامێشی خۆڵەمێشینی نێوچاوان قەشان. *(کەڵی ماڵی سۆفی حەمە شین بەشە.)* ف گاو و گاومیش خاکستری پیشانی سفید

**شینکە**: (+) جۆرێ گەنەی وردە بە تۆپەڵ بە گویچەی ماڵاتەوە دەنووسێن.ف نوعی کنەی ریز

**شینگایی**: گریان و ڕۆڕۆ بۆ مردوو، گەرمەشین، شین و شەپۆڕ.ف شیون برای

مردە

**شـینگڵ لـەخـۆدان:** جینگـڵ لـەخـۆدان، خـۆ ڕاپسکاندن.ف خود را تکان دادن

**شین و گابۆڕ:** شین و شەپۆڕ، گریان و ڕۆڕۆ. ف شیون با صدای بلند

**شینە قورینگ:** شینە شاهۆ.ف درنا

**شینەمار:** جۆرێ ماری بڤەوژەهراوییە بنسکی زەردە و سەرپشتی شینە، شینی گاوەنگی.ف نوعی مار سمی

**شینی گاوەنگێ:** جۆرێ ماری پیس و ژەهراوییە ڕەنگی شینە و بن زگی زەردە.ف نوعی افعی خطرناک

**شێوان:** (+) ئێوارە، بانگی شێوان، نوێژی شێوان. *(لە دوگمەی سوخمە دوێنێ نوێژی شێوان/ بەیانی دا سپێدەی باخی سێوان. «نالی».)* ف غروب، مغرب

**شیوە غەریبە:** ئەو نان و پێخۆرەی خەڵکی ئاوایی لە پرسە و سەرەخۆشیدا سازی دەکەن و دەیبەن بۆ مزگەوت یان ماڵی مردوو، بۆ میوانان.ف غذایی که اهل روستا برای مهمانان عزاداری درست می‌کنند

**شیوەڵ:** شیوەڵووکە، شیوەڵە.ف درەی کوچک.



**عاجووج و ماجووج:** بریتی لە منداڵی زۆری هاروهاج. هەزارە زیلە. ف کنایە از بچەهای شلوغ

**عاجوول و ماجوول:** ☜ عاجووج و ماجووج

**عادز:** عاجز، جاڕز، وەڕەز، عێجز، عێدز. ف عاجز

**عارەقگیر:** (+) کراسی بێقۆڵ کە لە ژێرەوە لەبەر دەکرێ، ژێرکراس. *(ئەرێ بە تویی ئارەقگیر یار دڕواو بەجێم دێڵێ/ بە غولامی دوو پێلاوی دێم ماچی کەم نامهێڵێ «حەسەن زیرەک».)* ف زیرپیراهن

**عاسان:** سانا، هاسان. ف اسان

**عنیشک:** ئانیشک، هەنیشک. ف آرنج

**عوزرمایی:** حوزرخوایی، داوای لێبووردن، داخوازی بەخشین. ف معذرتخواهی

**عیلمباز:** بە مەکر، جادووباز، عەیار. ف حیلەگر

**عەبرەش:** (+) مەڕی تاڵەی نێوچاوان سپی. ف گوسفند سیاه پیشانی سفید

**عەبلەخەرج:** هەڵەخەرج، دەستبڵاو، دەسباد، دەسشاش. ف ولخرج

**عەبەسران:** حەپەسان، واقوڕمان، پەشۆکان. ف سراسیمه شدن

**عەترچایی:** جۆرێ گوڵی گەڵا پەنجەیی بۆنخۆشە لە گوڵداندا پەروەردە دەکرێ. ف نام گلی است خوشبو

**عەترەنگی:** سووریکی کاڵ، سورخابی. ف رنگی نزدیک به صورتی

**عەتەب:** ئیراد، ڕەخنە. ف انتقاد

**عەدوسەد:** جەنگە، کات، حەدەحەد. *(عەدوسەدی ئەوەیە پەیدا بێ.)* ف وقت، موسم

**عەدەعەد:** حەدەحەد، عەدوسەد، کات، جەنگە. *(عەدەعەدی ئەوەیە بێتەوە)*. ف وقت

**عەڕابە:** عارەبانە، ئەڕابە. ف ارابه

**عەراف:** درۆزن، فیشاڵباز، دەلەسەباز. ف

دروغگو

**عەزرەبات:** عەشیا، عاشتەبا. *(هێندە دەستکورتە عەزرەباتی خودای نییە.)* ف هیچ.

**عەسرۆژە:** ژەمەخوێڕی، نان خواردنی کرێکار و جووتیار لە کاتی عەسردا. ف غذای عصرانە

**عەقڵ سووک:** ناهیر، کەمئەقڵ، گەوج. ف ابلە

**عەقڵ:** فام، ئاوەز؛ ) ئاقڵ، ژیر، ئەقڵدار. ف ) عقل؛ ) عاقل

**عەمباراو:** بۆشکەی لە تەنەکە ساز کراو بۆ ڕاگرتنی ئاو. ف انبار آب

**عەمبارە سۆت:** عەمبارە پۆ، ڕزیوی نێو هەمار. ف پوسیدە در انبار

**عەمبارەپۆ:** هەمارەپۆ، کاڵای ڕزیوی نێو عەمبار. ف جنس پوسیدە در انبار

**عەمرۆکە:** گوڵێکە وەک گوڵە گەزیزە وایە دوو بست بەرز دەبێتەوە ڕەنگی شین و سپی و بنەوشە، گەڵاکەی وەک شلێرە وایە لە مانگی بانەمەڕدا گوڵ دەردەکا، کاتێک لاسقەکەی دەشکێنی شیلەکەی وەک داوی جاڵجاڵووکە کێشی دێ و لە شوێنی قرتاوەکەوە دەیان تاڵ درێژ دەبنەوە. ف نام گلی است

**عەمزەل:** حەمزەل، کایەیەکە کەسێک کۆم دەبێتەوە و یەکێکیتر بەسەر پشتیدا باز دەدا. ف نوعی بازی بچەها

**عەنجوور:** خرچە، قەرەخرچە، ئەنجوور. ف خربزەی کال

**عەوام:** خەڵکی ڕەشۆکی و نەخوێندەوار، *(عەوام لە عەوام قەت نابێ حاڵی/ کاسەپڕ نابێ لە گۆزەی خاڵی «فولکلۆر».)* ف عوام

**عەوە:** دەرقەت، پێوەستان. *(هێندە بەهێزە کەس لە عەوەی نایە.)* ف قدرت

**عەیلەمەنە:** جۆرێ چۆلەکەی بنسک سپیە و ئاشقی بلاڵۆوکە، خەزایی، ئاگرمەلووچ. ف سار ملخخوار.

**عیار:** چەرم، پێست، کەوڵ، پێس. ف چرم

**عیرفایی:** جۆرێ کورتانی قوڵە و نەرم بۆ سواری. ف نوعی پالان نرم و کوتاه برای سواری

**عیلمە:** پۆ، ئەو بەنەی فەرشی پێدەتەنن، ئیلمە. ف پود



**غارغارۆکێن:** غارغارێن، گرێوەغار. ف مسابقه دویدن

**غایلە:** ختووره، دڵەڕاوکێ و نیگەرانی. *(دڵت غایلە نەکا زۆر جێی متمانەیە.)* ف تشویش و نگرانی

**غوباب:** بەرخەبەبە، بەرچێڵە، غەبغەبە. ف غبغب

**غوڕە:** دەنگی خوێندنی کەوی نێر. کێبەرکێی خوێندنی کەو. *(لێیگەڕێ دەندووکی بە بەرد تیژ بکا/ غوڕڕە بکا و بانگی کوڕ و کیژ بکا «ئاوات».)* ف صدای کبک نر

**غەرقە:** دۆشەکی منداڵان کە نایلۆنی تێدەخەن بۆئەوەی کاتێک میز دەکاتە جێگاکەیەوە هەمووی تەڕ نەبێ. ف تشک با برگی نایلۆنی مخصوص بچەها

**غەرەزەن:** قامچی لێخوڕینی کەڵ و گا. خەرەزەنگ. ف تازیانه

**غەرەزەنگ:** غەرەزەن، خەرەزەنگ. ف تازیانه

**غەڵەبە:** (+) هەراهەرا و ژاوەژاو، دەنگەدەنگ و تێکهاڵانی خەڵک. *(ئەرێ ئەو غەڵەبەیە چییە، بڵێی شەڕ بێ؟)* ف سروصدای ازدحام

**غەلیفی:** دوورینی کەوا لە دیوی ناوەوە کە کونێکی دەهێڵنەوە و لەوێوە هەڵیدەگێڕنەوە. *(کەواکەم غەلیفی کردووە هەر سەردرووی ماوە.)* تودوزی لباس

**غەوغەو:** بەرخەبەبە، غوباب، بەرچێڵە. ف غبغب



**فاتەبارە:** گیایەکی گەڵاپان و خۆڕسکە لەسەر برینی دادەنێن دەرکی دەکا. هەروەها ڕیشەکەی وشک دەکەن و تێکەڵ تووتنی دەکەن بۆنەکەی خۆش دەکا. ف اسم گیاهی است

**فارگۆن:** فەڕغوون، ناسرگە. ف فرغون

**فافیش:** چاو و ڕاو، شاتوشووت، خۆهەڵکێشان و درۆ. ف لاف و گزاف

**فام کردنەوە:** بۆ منداڵ دەگوترێ کاتێک خەریکە شت فێر دەبێ. *(کوڕەکەمان تازە فامی کردۆتەوە.)* ف رشد فکری برای کودک

**فاماندن:** تێگەیشتن، ئەقڵ پێشکان. *(جارێ منداڵە نافامێنێ.)* ف فهمیدن

**فتراق:** گەڕان، بەدوادا گەڕان، ئاوارە بەدوای شتێکدا. *(هامای فتراق کار بەدوای یارەوە.)* ف جستجو

**فتراقکار:** ئاراگێڵ بەدوای شتێکدا، گەڕۆکی بە شوێن کەسێک یان شتێکدا. ف جستجوگر

**فججە کردن:** دیق کردن، مردن بە تاسەی شتێکەوە، *(هێندەی دڵ پێوەی بوو لەوانە بوو فججەی بۆ بکا.)* ف مردن براثر آرزوی زیاد

**فجووق کردن:** فججە کردن، دیق کردن. *(وەختە لە تاوانا فجووق بکەم.)* ف دق کردن

**فجووقێن:** ناوی یارییەکی منداڵانەیە کوڵکەدارێک دادەنێن و بە پێشکان تێی هەڵدەکەن دەبێ نووکی پێشکانەکە لە کوڵکەدارەکە بچەقێ. ف نام یک بازی بچەگانە

**فڕ هاتن:** بردنەوە، بەرەندە بوون لە یاریدا. *(لەم دەستەی دۆمینەدا ئێمە فڕ هاتین.)* ف بردن در بازی.

**فراژ:** کامڵ، فراژوو، هەراش. *(گیا و گژ تەواو فراژ بوونە.)* ف تکامل

**فراژوو:** فراژی، هەراشبوو، بەخۆدا هاتوو. ف

تکامل یافته

**فراقەت:** لەش ساغ، سالم، سلامەت.ف تندرست

**فـڕدان:** حـەوادان، فـڕێدان، تـووڕ هـەڵـدان.ف پرتاب کردن، دورانداختن

**فڕمە:** پڕمە، دەنگی لووتی یەکسم کاتێک شتێک دەچێتە لووتییەوە.ف صدای بینی اسب

**فروو:** ڕووناکی، ڕۆشنایی.ف روشنایی

**فرەزان:** زۆرزان، زیرەک، زانا.ف دانا

**فریچک:** شیلاوک، فریشک.ف پنیرمایە

**فڕێدان:** ☜ فڕدان

**فریـشتە:** فرشـتە، حـۆری. پـەری *(کچـی کـوردی هـەرێمـی یـا فریـشتەی/ لـەنێو عـەرشـی خودایـیدا فڕیوی. «ڕاوچی»)* ف فرشتە

**فریشک کـەوتن:** نـەخۆشـییەکی منداڵانـەیـە زگ چوون دەگرێ. دەڵێن منداڵێ چکۆڵەی هێشتا پێ نەگرتوو سەرەوبن کەی یان سەرمەقولاتی پێ بدەی تووشی ئەو نـەخۆشـییە دەبێ.ف اسـهال شدن بچە

**فریـشک هێنانـەوە:** منـاڵ کـە فریـشکی بکـەوێ دایـک یـان ژنێکـی لێـزان لـەسـەر کۆشـی ڕایدەکێشێ و بە پەنجە لە بنی لاقی منداڵەکە دەدا و دەڵێ: *(فریشکەجێ فریشکەجێ فریشکی کۆرپـەم بێتـەوە جـێ)* پاشـان دوو سـێ سـەرمـەقـولاتی پێدەدا، بـەوجـۆرە نـەخۆشـیی منداڵەکە چاک دەبێتەوە.ف معالجە کردن بچەای کە اسهال گرفتە است

**فڕێهەڵدان:** تووڕ هەڵدان، فڕێدان، حەوادان.ف دورانداخت، پرت کردن

**فستق:** پستە.ف پستە

**فـسخـواردن:** ) هـەڵنیـشتنی مریـشک کاتێـک دەیانهـەوێ بیگـرن. خـەوتنـی مریـشک لـەژێـر کـەڵـەشـێردا کـاتی جـووت بـوون؛ ) بریتـی لـە مرۆڤی خوێڕی کە خێرا خۆی بەدەستەوە دەدا و دەبەزێ. *(وەک مریشک خێرا فس دەخوا.)* ف ) خوابیـدن مـرغ هنگـام گـرفتن یـا زیـر خـروس هنگام جفتگیری؛ ) کنایە از آدم ترسو

**فسقانچ:** جـۆرێ قالونچـەیـە وەک کـۆ وایـە بـە دارانـەوە دەنیـشێ و کاتێـک دەکـەوێتـە عـەرزی دەنگی فسەفسی دێ.ف نوعی سوسک بال دار.

**فـسکوڵیـو:** تـسکوڵیـو، بریتـی لـە تـەنبـەڵ و تەوەزەل، کەسێک کە لەجێی خۆی هەڵناستێ و هیچ کارێک ناکا.ف کنایە از آدم تنبل و بیکار

**فسۆن:** ئەسپی ئاوی.ف اسب آبی

**فـشقاندن:** دەنگـی کـەڵ و گـامێش و بـەراز. *(گامێش و بەراز دەفیشقێنن.)* ف صـدای گـاومیش و گراز

**فشە:** (+) سواڵە شێوێنکە، گیایەک لەنێو گەنمدا شـین دەبـێ و کـاتی دروێنـە نـاهێڵێ سـواڵەکـە پێکەوە بنووسێ و بڵاو دەبێتـەوە.ف نـام گیـاهی است

**فڵق و هۆڕ:** فڵقەفڵق، فڵقەی زۆر و لەسەر یەک. ف صدای پیاپی بەهم خوردن مایعات

**فڵقن:** چڵمن، بڵقن. ف خلمو

**فلیقاتە چوون:** بریتی لە گەیشتنی زۆری میوە. *(قەیسییەکە هێندە گەیشتووە فلیقاتەی چووە.)* ف رسیدن بیش‌ازحد میوە

**فنجڵ:** ☜ پنجڵ

**فووتباڵ:** فوودانە، میزەڵان، تیزانگ، ف بادکنک

**فوودانە:** فوودان، میزەڵان، پزدان، فووتباڵ. ف بادکنک

**فەتراک:** بەدکار، زیانـدەر، ئـازاردەر. ف زیان‌رسان

**فەداندەر:** خوڵقێنەر، بەدیهێنەر، داهێنەر. ف مخترع

**فەدەر:** گزە، فێڵ و فەرەج، تەڵەکە. ف کلک

**فەرزۆ:** رۆڵە، عەولاد، جگەرگۆشە. ف فرزند

**فەرغوون:** فارگۆن، ناسرگە. ف فرغون

**فەرمی:** رەسمی، قانوونی. ف رسمی

**فەروار:** (+) هەوارگەی زستانیی کۆچەران، ئاران. ف قشلاق

**فەروو:** کەپەنک، قاپووت. *(ئەگەر گورگ لە باران بترسایە فەروویەکی لەبەر دەکرد.)* ف بالاپوش نمدی

**فەرهادتاش:** شوێنەوارێکی مێژوویییە لە کوردستان. ف از آثار تاریخی در کردستان

**فەریح:** هەراو، بەرفرەوان. ف وسیع

**فەریع:** فەریح. ف وسیع

**فەریکە چایی:** چایی دەمنەکێشاو، چایی پەپوولە بەسەر، چایییەک کە وردە پڵتەی بەسەروە بێ. ف چایی دمنکشیده

**فەقێ وەتمانە:** ناوی تیرەیەکە لە هۆزی مامەش. ف نام طایفه‌ای در ایل مامش

**فەیتوون:** عارەبانەی سواری کە چارەوێ رایدەکێشێ، فایتوون، هێلینگە. ف درشکه

**فەیز:** ئابڕوو، حەیا. ف آبرو

**فەیزچوون:** ئابڕووچوون. *(بەجارێ فەیزمان چوو.)* ف رسوا شدن

**فیچانەوە:** ) نەرم بوونەوە. پووچانەوەی شتی رەق. *(جاران ئەو هەمووە قەڵەو و جوان بوو ئێستا فیچاوەتەوە.)* ؛ ) خواربوونەوەی ئاسن. *(ئاسنەکە بەجارێ فیچاوەتەوە.)* ف ) نەرم شدن و خالی شدن باد؛ ) خم شدن آهن

**فیچقە:** (+) ئامرازی دەرزی وەشاندن، ئامرازی دەرزی کوتان. ف سرنگ

**فیڕکن:** فیرن، گووبەخۆداکەر ف اسهال گرفته.

**فیستان:** دێرە، جلکی ژنانەیە لە پارچەی رەنگاورەنگ دەیدروون. ف لباس زنانه

**فیسقەڵ:** جووکی، مرۆڤی ترسەنۆک کە لە شەڕدا هەراهەرا دەکا و دەنەڕێنێ. ف کنایە از آدم ترسو

**فیشق و هوڕ:** دەنگی پێکەنین و پرمەی چەند کەس پێکەوە. *(ئەو فیشق و هوڕە چییە سازتان کردووە.)* ف صدای خندیدن چند کس باهم

**فیشقە:** دەنگی کەڵ و گامێش و بەراز. *(بەراز و گامێش فیشقەیان دێ.)* ف صدای گاومیش و گراز

**فیشەککێش:** کۆلاس. ف گلنگدن

**فیشەکلغ:** (+) گوللەی وەک زنجیر هونراوەی کە راست و چەپ لە شانی دەکەن. ف نوار فشنگ

**فێڵەباز:** فێڵەزان، گزەوەن. *(وتی فێڵەباز پیری زەمانە/ باڵندەت نەهێشت پار ئەو دەمانە/ ئێستا چیبووە چیت لێ بەسەر هات/ ئەو باڵندانە بۆ*

*هاتوونە لات. «ڕەشاد شەمسەدینی».)* ف کلک‌باز، مکار

**فیڵەمانگ**: جۆرێک زگچوونی درێژخایەنە. ف نوعی اسهال مدت‌دار

**فیلی سەرسەرێن**: گەمەیەکی منداڵانەیە. ف اسم یک بازی کودکانه



**ڤاستا**: پشتیوان: یاریدەدەر، هاریکار.[ف] پشتیبان

**ڤجر**: خێڵ، چاولار، قیچ.[ف] لوچ

**ڤرسۆ**: برووسکە، بریسکە، بڵاچە.[ف] آذرخش

**ڤەتەقیان**: جیا بوونەوە، کلا بوون، لێک هەڵبڕان. [ف] جدا شدن

**ڤەجین**: کاوێژ، کاویچ، قاویچ.[ف] نشخوار

**ڤەرەسین**: تێکچوون، لەبەریەک بڵاوبوون.[ف] بەهم پاشیدن

**ڤەرێز**: پەرێز، جاڕە گەنمی دووراوە.[ف] مزرعەی درو شدە

**ڤەسنا**: ئیرادە، خواست، لێبڕان.[ف] ارادە

**ڤەشارکۆ**: چاوشارکێ، قەراقەرا، خۆشارکێ.[ف] بازی قایموشک

**ڤەشتی**: خوازیار، داواکار.[ف] خواهان

**ڤەلەزیان**: ڕاکشان، ڕازان، تخێڵ بوون، وەرکەوتن. *(مێرەک لە بن دارەکە ڤەلەزیابوو.)* [ف] دراز کشیدن

**ڤەنا**: درەخت، دار.[ف] درخت

**ڤیاد**: (+) زەویی نەرمان، گۆشتە زەوی.[ف] زمین نرم و بدون سنگ

**ڤیام**: گەشە، گەورە بوون و گەشانەوە.[ف] رشد

**ڤێسەن**: کاڵوکرچ، سوور و سپی، ڕووئاڵ.[ف] سرخ و سفید

**ڤێقڕاندن**: ئاشکرا کردن، ڤەوەراندن.[ف] افشا کردن

**ڤێلا**: دەشتی بەرین و لێژ.[ف] دشت وسیع و شیبدار

**ڤیناس**: خۆشەویستی، ئەوین.[ف] مهر

**ڤێنە**: ئارەزوو، ئاوات.[ف] آرزو

**ڤێوار**: تامەزرۆ، تاسەمەند.[ف] مشتاق



**قابگاره**: گوێزینگ، زەنگۆڵ، گویزک.ف قوزک پا

**قابلـەمـە**: (+) مـەکـووک، ئـامرازێکی مـەکینـەی خەیاتییە مەسوولە دەچێتە ناوی.ف ماکوک

**قابیلە**: مامان، پشتگر.ف ماما، قابله

**قابیلـەت**: قابیـل، شـیاو، *(شتێکە قابیلـەتی تۆشـی نییە بەڵام بۆم هێناوی.)* ف ارزش

**قاپ قەوی بوون**: بریتی لە ڕوو کرانەوە، شەرم شـکان. *(تـازە وا قـاپی قـەوی بـووە جـوابی کـەس ناداتەوە.)* ف رودار شدن

**قاپشین**: گیایەکی گەڵا پانی سپیواشە لـە دێم و زیـاتر لـەنێـو بێـستانە گڕکـە دەڕوێ گـەڵا وشـکەکـەی دەسـووتێنن و دەسـت بـەسـەر دووکەڵەکەیدا دەگرن، بالووکە چاک دەکاتـەوە. ف اسم گیاهی است

**قاپشینکە**: ☜ قاپشین

**قاپقاپۆکـە**: خـەربـەنـگ، گیایـەکـە دانـەکـەی بـۆ ددانئێشە بەکار دێ.ف نام گیاهی است

**قاپکـەوڵـە**: قـاپ کزێنـە، گیایـەکـی گـوڵزەردی سپیواشە.ف نام گیاهی است

**قاپیلکـە**: قاپووچکـە، قاپوولکـە، قـاپی چکۆڵـە.ف کاسەی کوچک

**قاچاخە**: بێچووە گامێشی دوو سـاڵانە ، پـاڵاخی دوو ساڵان.ف بچە گاومیش دو ساله

**قاچوو**: بازەڵێن، توولێن، قەمچان، ڕێخان.ف یک قول دو قول

**قاچە خلیسکێ**: خلیسکێن لەسەر بەفر بە پاوە. ف سرسرەبازی سرپا. اسکی

**قاچەفڕێ**: پەلـەقـاژێ، لینگەفرتـێ.ف دست و پا زدن

**قاخنــات**: ژەکـی مانگـا و مـەڕ و بـزن کـە دەیکوڵێنن و توند دەبێتەوە، ئەگەر تۆزێ شیری تێکەڵ بکەن و لـەگەڵی بکوڵێنن دەبێتـە فرۆ.ف آغوز

**قادرخـانی**: جـۆرێ شـووتی زۆر شـیرینە

تووەکەی سپییە.ف نوعی هندوانه

**قاڕ:** عەیب، شوورەیی. عار. *(پێت قاڕە لەگەڵ من بێی؟)* ف عار، عیب

**قاڕاندن:** دەنگی مراوی. *(مراوی دەقاڕێنن.)* ف صدای مرغابی

**قاراو:** شەونم، ئاونگ، خوناوە.ف شبنم

**قاڕقاڕێن:** یاریی قاڕێن بە تۆپێکی چکۆڵە دەکرێ کە لە وردە مووی ئاژەڵ دروست دەکرێ. ف بازی با توپ کوچک درست شده از موی حیوانات

**قاڕنداشی:** جۆرێ تووتنە.ف نوعی توتون

**قاڕنە:** تۆپی بە خوری و موو دروست کراو، بۆ کایەی قاڕقاڕێن.ف توپی درست شده از پشم و موی حیوانات

**قارە سەهۆڵ:** تەختە سەهۆڵی گەورە لەنێو ئاوی چۆمدا.ف تخته یخ بزرگ در رودخانه

**قاڕە:** دەنگی مراوی. *(مراوییەکان قاڕەیان دێ.)* ف صدای مرغابی

**قارەسەرێ:** سەرەگێژە، کاس بوون لەبەر گەرما. *(وا تووشی قارەسەرێ بووە هۆشی هیچی نەماوە.)* ف سرگیجه

**قاڕێن:** کایەیەکی منداڵانەیە بە تۆپێکی چکۆلە دەکرێ. بە تەختەیەک لە تۆپەکە دەدەن و دوور دەیهاوێن بە نۆرە دەبێ بچن بیهێننەوە. تۆپی هەرکەس زیاتر بڕوا بەرەندەیە.ف بازی بچەگانە با توپ و تخته

**قاسڵوانگ:** گاوانی، ڕیشۆڵە، سێروو.ف سار سیاه

**قاسە:** (+) قوفڵ، قفڵ.ف قفل

**قاش:** (+) ) جۆرێ مووروویی سێگۆشە و گەورەیە لە ملوانکەدا. *(هەی لە سێوەڵاسوورەی بەرماڵی ئیندرقاشی/ سەبر و هۆشی لێبڕیوم دەنگی بەرمووروو قاشی. گۆرانی.)* ؛ ) دەستەگیرەی کورتان، بەرزایی پێشی کورتان. ف) نوعی مهرەی زینتی؛ ) جلو برجستەی پالان

**قاشوخ:** گوندێکی ناوچەی فیزوڵڵابەگی بۆکان بوو وەبەر سەدی کۆرشی کەبیر کەوت.ف نام روستایی در منطقەی فیض‌اللەبگی بوکان زیر سد کورش کبیر رفت

**قاقانە:** بانجێڵە، باڵگۆن.ف بالگن

**قاقانی:** پارچەیەکی قەدیمی بوو ژنان دەیانکردە دەسماڵ. *(کڵۆنجە ڕێ ڕێ دەسماڵ قاقانی/ بەینی من و تۆ عالەم پێی زانی «گۆرانی».)* ف نام یک پارچەی قدیمی

**قاقڵە:** کەمەی لانکە.ف کمانەی گهوارە

**قاقڵی:** کاخڵی. گیایەکە گوڵەکەی بە کولێرە و شیرینییەوە دەکەن و دانەکەی بۆ ڕۆن دەبێ.ف نام گیاهی روغنی

**قاقنات:** ☜ قاخنات

**قاقەزپەرداخ:** قاقەزسماتە، کاغەزساو.ف سنبادە

**قاقەناز:** زۆر سووتاو، کۆڵە. *(وا سووتاوە بۆتە قاقەناز.)* ف زغال

**قاڵ بوونەوە:** خاڵی بوونەوەی زگ دوای تێر خواردن. *(ئەو هەمووەم خوارد نێوەڕۆ کەچی ئێستا قاڵ بوومەتەوە.)* ف خالی شدن شکم

**قالانگ:** )کڵاوبنە، ڕێکڵاو، لاسقی گەڵا ڕێواس.

)گیا پڵاو، ناوی گیایەکە بۆنی پڵاوی لێدێ[ف] )ساقەی برگ ریواس )نام گیاهی است

**قاڵب:** ئامرازی خشتپێژان.[ف] قالب خشتزنی

**قاڵبدار:** خشتبڕ، کەسێک کە بە قاڵب خشت دەپێژێ.[ف] خشتزن

**قاڵتاس:** قەڵچغ، داسوو، پرزەی گوڵەگەنم و جۆ و کەرخنکێنە.[ف] اخگل

**قاڵچــە:** دارێکــی دوو لکــە وەبــەر ڕەشــکەکــاو شەغرەی دەدەن بۆ بار کردن.[ف] چوبی دوسر بــرای بــار کــردن بــار ســنگین از آن اســتفاده می‌شود

**قاڵغــان:** (+) ) کــەرکــۆڵ، کــەرکۆڵــک. ) شــانەی گوڵــەبــەڕۆژە.[ف] ) گیــاهی خــاردار ) خوشــه آفتابگردان

**قاڵک:** ☜ قاوغ

**قالک:** توێکڵ، تێخوڵ، تێکوڵ، توێخڵ.[ف] پوسته

**قاڵند:** ئەستوور، قەوی *(چۆن بتوانم لە پشت ئەم هەموو توێژانەوە/ لەو دیوی ئەو هەموو شوورە قاڵندانــەوە/ بتبینـم/ بۆنـت کـەم/ بتچێـژم؟ «قـادر عەلیخا»)* [ف] ضخیم

**قاڵۆنچــە عــەجــەمانــە:** گووگلێنــە، گووخلێنکــە، کێزک، گازولک.[ف] سرگین غلطان

**قالەژنانە:** ژنانیلە، ژنیلانە.[ف] خالەزنک

**قاندڕ:** زۆردار، کەڵەگا، زاڵم.[ف] ظالم

**قانزان:** قازان، مەنجەڵ.[ف] دیگ، پاتیل

**قــاوغ:** ) قاڵک. قاڵکە کیسەڵ؛ ) پووکــەی گوللــە، قــاپوورە گوللــە.[ف] ) لاک لاکپــشت؛ ) پووکــەی گلوله

**قایدە:** عــادەتــی مانگانــەی ژنــان، بێنوێژ بــوونی ژنان.[ف] قاعدگی زنان

**قایمــەلان:** لانێک کــە دەســت پێڕاگــەیشتنی بۆ ڕاوچی دژوارە. *(ئەستی دەڵـێ خوشکـێ بەغدانـێ ســەری مـن دێشـێ دڵـی مـن چــەنـدی لــە چێشتە/ کەروێشکی کەڵەکێ بانکی دەکردەوە کەروێشکێ/ هــەســتە دەچینــەوە قایمــەلانــی خۆمــان دەکــەینــەوە خـــەوی چێـــشە چێـــشتە. «فولکلـــۆر».)* [ف] لانــه خرگوش

**قایوشــت:** کــاوێژ، قــاویش، کنــشت، کــاویچ.[ف] نشخوار

**قایەغە:** قەدەغە، پاوان، قۆرغ.[ف] قدغن

**قتوو:** ئاژاوەچی، شۆڤار.[ف] فضول

**قرپاسان:** زەویی بە قەوەت و پڕ لـە گژ و گیا. *(زەوییەکەی قرپاسانە هــەر حاسڵێکی لێ داچێنی نموونەیە.)* [ف] مزرعەی خوب و حاصلخیز

**قــرپن:** کــەســێک کــە زۆر قرقێنــە دەدا، قرپــۆ.[ف] کسی کە زیاد آروغ می‌زند

**قرپۆ:** ☜ قرپن

**قرت کردن:** (+) هــەڵاواردن، دەر کردن لــە کایــە، کەسێک لـە کایەدا خــەتا دەکا قرتی دەکەن.[ف] اخراج کردن از بازی

**قرتقرتۆک:** قورقوراچکە، قوڕوو، تینتینۆکە.[ف] حلقوم

**قرتقرتۆکە:** ئەوک، قورقوراچکە.[ف] حلقوم

**قرچۆک:** (+) ☜ قرچەک

**قرچە قرچی نیوەڕۆ:** هەرەتی گەرمای نیوەڕۆ، قرچەی نیوەڕۆ.[ف] گرمای شدید ظهر

**قرچەک**: قرچۆک، دارێک کە زوو دەشکێ *(ئەو دارە قرچەکە بۆ گۆچان نابێ دەشکێ.)* ف چوبی کە انعطاف ندارد

**قرچەی نیوەڕۆ**: هەڕەتی گەرمای نیوەڕۆ. *(شۆڕەژن بنکۆڵ نەکا برکەی بە قرچەی نیوەڕۆ/ چۆن لە کاڵەک تێر دەبێ ئەو زگ زلەی بێستان ڕنە.)* ف گرمای شدیدی ظهر

**قرخە لێبڕین**: هەناسە لێبڕین، خنکاندن *(بێدەنگبە دەست بنێمە بینت قرخەت لێدەبڕم.)* ف خفه کردن

**قردیلە**: جووجەڵەی نێر، کەڵەشێری ساوا. ف خروس بچه

**قرژاڵە**: پنج بەستنی گەنم، ئەوکاتەی گەنم سێ چوار گەڵا دەر دەکا بە زەویدا پان دەبێتەوە. *(گەنم زۆر جوان شین بووە قرژاڵەی کردووە.)* *(گەنم خەریکە قرژاڵە دەبێ.)* ف روییدن گندم و چند برگه شدن

**قرژنگ**: قرژاڵ، قرژانگ، قارژنگ. ف خرچنگ

**قرقران**: ئۆقرە گرتن، ئارام گرتن، سرەوتن. *(هێندە نارەحەتە ساتێک ناقرقرێ.)* ف آرام گرفتن

**قرماخە**: قەتماخە، پەترۆ، پترۆک، قرتماخە. ف کبرەی زخم

**قرماغە**: قرماخە. ف کبرەی زخم

**قرمساندن**: قووچاندن، نووقاندن، پێکدا نووساندنی چاو. ف بستن چشم

**قرموقاڵ**: زەنازەنا، قیژە و هەرای زۆر. ف سروصدای زیاد

**قرووسکاندن**: دەنگی سەگ *(سەگەکە دەستی کرد بە قرووسکاندن.)* دەنگی سەگ کاتێک کە لێی دەدەن. ف صدای سگ هنگامی کە کتک میخورد

**قرووسکە**: دەنگی سەگ، دەنگی سەگ کاتێک کە لێی دەدەن *(ئەو سەگە هەر قرووسکەی دێ.)* ف صدای جیغ زدن سگ

**قرەپیرێژن**: جۆرێک هەڵپەڕکێی حەماسییە بۆ خۆئامادە کردن و گەرم کردنی لەش بەرلە شەڕ و هێرش بردن. ف نوعی پایکوبی حماسی مخصوص کردی.

**قرە ڕەشە**: نەخۆشییەکە زۆر سەختە و لەنێو پاتاڵدا پەیدا دەبێ *(دەک قرە ڕەشەتان تێکەوێ.)* ف مرضی کشنده برای حیوانات

**قرهاندن**: سەرلێشێواندن، ماندوو کردن. ف خسته کردن و گمراه کردن

**قڕەون**: کەسێک کە هەمیشە سەری لە کێشە دەخورێ و شەڕ و قڕە ساز دەکا. ف کسی کە هەمیشه به دنبال دعوا و مرافعه است

**قریشکاندن**: (+) پێکەنین و تریقانەوەی منداڵی چکۆڵە. *(کوڕەکەمان گڕ و گاڵ دەکا و دەقریشکێنێ.)* ف صدای خندەی بچه

**قریشکە**: (+) دەنگی پێکەنینی منداڵ. *(هیوا بەو ڕۆژگارە قریشکەی پێکەنینی دێ.)* ف صدای خندەی کودک

**قزڵ پەنجەرە**: پەنجەرۆک، نێوی گیایەکە. ف نام گیاهی است

**قزڵمامزی**: ناوی گیایەکە. ف نام گیاهی است

**قزڵمامەسی**: گیایەکی دڕکاوییە گوڵی بنەوش

دەردەکا و لەنێو گەنمدا دەڕوێ نیومەتر بەرز دەبێتەوە.ف نام گیاهی با برگهای بنفش.
**قژاکه شینه:** ☜ قژاڵکەشینە
**قژاڵکەشینە:** قژاکەشینە، کاسەڵەشینکە.ف سبزقبا
**قژبــوون:** بــەزیــن، بــۆڕدران، بۆڕخــواردن.ف شکست خوردن
**قژبەڵەکە:** مەلێکە بەقەد سێروو دەبێ ڕەش و سپییە و لەسەر دار هێلانە دەکا.ف پرندەای سفید و سیاه روی درخت لانه می‌سازد
**قژپوغ:**پیسوپۆخڵ، چەپەڵ، ف کثیف
**قژگیره:** خشڵێکە ئافرەتان لەپشتە سەرەوە لە قژی قایم دەکەن.ف کلیبس
**قژیلانـدن:** چەسپاندن، پێ‌سەلماندن، بەڵگە هێنانەوە.ف ثابت کردن
**قسه بڕ کردن:** قسە ڕۆیشتن، دەسەڵات بەسەر کەسێکدا و بە قسە ڕازی کردنی. *(لەوێ زۆر چاک قسەی بڕ دەکا.)* ف حرف رفتن
**قسه بزرکاندن:** ورێنە، قسە نەکولاندن، وڕاوە. ف هذیان
**قسه به شەکر برینەوە:** بریتی لە ڕێز دانان بۆ ئەو کەسەی قسەی لەگەڵ دەکەی و لە کاتی قسە کردنیدا ئیجازە وەرگرتن بۆ قسە کردن. *(قسەکەت بە شەکر دەبرمەوە بەلام با منیش شتێکت عەرز بکەم.)* ف کلمەای محترمانه برای اجازه گرفتن از طرف مقابل که سخن می‌گوید
**قسەپتەو:** قسە دروست، خاوەن بەڵێن.ف کسی که بی‌هدف سخن نمی‌گوید
**قسەترن:** کەسێک کە قسەی پیس و بێ‌جێ دەکا و خۆشی نازانێ دەڵێ چی، بریتی لە کەسێک کە پاش و پێشی قسەی خۆی نازانێ و هەروا دەری‌دەپەڕێنێ.ف کنایه از کسی که بدون تفکر حرف می‌زند
**قسه ڕۆیشتن:** ☜ قسه بڕ کردن
**قسه زڕانـدن:** بڵاوکردنەوەی قسە و باس، ئاشکرا کردنی ڕاز و نهێنی.ف افشا کردن راز.
**قسه کولانـدن:** بیرلێ‌کردنەوە و قسە کردن، پاش و پێشی قسە زانین.ف فکر کردن و حرف زدن
**قسه گنخاندن:** قسە قووتدان، پێچووپەنا لە قسەدا.ف آشکار نکردن سخن
**قسەڵۆک:** قسەی سووک، ناونیتکە *(هەر خەریکی هەڵبەستنی قسە و قسەڵۆکانە.)* ف حرف درآوردن
**قسه له قسەدا کردن:** خۆ تێ‌هەڵقوتاندن، پەڕینە نێو قسەی کەسێک کە داخێوێ.ف دخالت کردن
**قسه لێ‌زانین:** قسە لێ‌بیستن، *(جارێ بچۆ قسەیەکی لێ‌بزانە پاشان دەچینە خوازبێنی.)* ف دانستن نظر
**قسەناس:** تێگەیشتوو، زانا، وردبین.ف فهمیده
**قسەی حیسابی:** قسەی جوان و بەڕێ و جێ، قسەی ڕاست بە بەڵگەوە.ف سخن خوب
**قسەی سووک:** جنێو، جوێن، دژمان، دژمێن.ف فحش، دشنام.
**قسەی قەڵەمی:** قسەی هەژدە هەژدە، کەسێک کە دەیهەوێ خۆی زانا و تێگەیشتوو نیشان دا و قسەی زل زل دەکا.ف سخن متکبرانه

**قسەی هەژدە هەژدە**: قسەی زل و خێراخێرا، قسەی قەڵەمی *(دەستی کردووە بە قسەی هەژدە هەژدە.)* ف زدن حرف بزرگتر از دهن

**قشتوقۆڵ**: قشتیلە، خنجیلانە، جوانکیلە، خونچیلانە. ف زیبای دوستداشتنی

**قشرە**: قشڵە، پێگەی سەربازان، سەربازخانە. ف پایگاه

**قل**: (+) خۆڵەمێش، خۆڵەکەوە. ف خاکستر

**قلاپیک**: (+) قەلپووت، قەلپووچ، چاوێک کە گلێنەی دەرهاتبێ. ف حدقەای کە خالی از کرەی چشم باشد

**قلاچە**: قاژوو، قەلەڕەشکە، قەلەڕەشە، قالاو. ف کلاغ

**قلاژیلە**: قشقەرە، قشقەڵە، قەلەباچکە. ف کلاغ دم دراز سیاه و سفید

**قلانە قریوە**: هەڵاتن و باڕاندن و کایە کردنی بەرغەل و کاژیلە کاتێک لە کانی و لەوەڕ نزیک دەبنەوە. *(لە گوێ جۆگە و سەر کانی/ لە مێرگ و سەوزەڵانی/ دەکەن قلانە قریوە/ هاوینە وەختی جیوە.)* ف بازی کردن و بع بع کردن برە و بزغالە هنگام نزدیک شدن بە آب و علف

**قلانە کردن**: هەڵاتن و کایە کردنی بەرغەل و کاژیلە. *(بەرغەلەکە بە قلانە کردن هەڵاتن بۆ سەر ئاوەکە.)* ف بازی کردن و بالا و پایین پریدن برە و بزغالە

**قلانیشۆ**: قەڵاندۆش، نێوانی هەر دوو شان. ف قلمدوش

**قڵپن**: ☜ قەڵپن

**قڵچغ**: قەڵتاس، داسوو، پرزەی گوڵە گەنم و جو ف اخگل.

**قلمیچ**: بەڵغ، خلتە، بڵخ. *(نێو سەماوەرەکە قلمیچی گرتووە.)* ف جرم

**قلۆپ**: شەل، ڕینجۆ، زرۆپ، نوقستان. ف ناقص‌العضو

**قلۆپانی**: سەرمەقولات، سەر لە زەوی دانان و بە پشتدا خۆ هەڵگێڕانەوە. ف پشتک زدن، معلق زدن

**قلووس**: عەولاد، منداڵ، ڕۆڵە. ف فرزند

**قلە سەما**: شادی کردن و هەڵبەز دابەز، هەلەکە سەما. *( لە خۆشیانا کەوتبووە قلە سەما.)* ف شادی کردن و بالا و پایین پریدن

**قلیانی**: گۆشتی سوورەوەکراو، قاورمە. ف قورمە

**قمقمە**: خەمەگرۆ، قومقومۆک. ف چلپاسە

**قمووش**: قمیش، ڕەهەند، بوودڕ، کەرێز. ف تونل زیرزمینی

**قندرغە**: گیایەکە لە شوڕەکات سەوز دەبێ و ڕەنگێکی مەیلەو قاوەیی هەیە. ف اسم گیاهی در شورەزار

**قنگ پێ شل بوون**: بریتی لە بەزین و وازهێنان لە توند و تیژی و کەڵەگایەتی *(زۆری کەڵەگایی کرد ئێستا قنگی پێ شل بووە)* ف کنایە از شکست خوردن

**قنگە**: ☜ قوونوو

**قنگەلیشکێ**: قنگەخشکێ، قوونەخشکێ. ف برروی باسن خزیدن

**قنگەوڕک:** قوڵڤاوقوون، پێچەوانە. *(قنگەوڕک لە قسە حاڵی دەبێ!)* ف کنایە از عوضی حالی شدن

**قنـەقـن:** (+) سـنەسـن، خـاوەخـاو، تـەمبـەڵـی و دەستەوستانی لە کاردا. ف تنبلی در کار

**قۆپەنە:** بنی شنگ کە ئەستوور و تۆپەڵەیە و زۆر خوشە. *(وەرە ئێرە شنگ هەڵکەنە هەمووی قۆپەنەیە.)* ف ساقەی کلفت شنگ

**قـۆتراش:** خـۆتراش، دەزگـای ڕیـش تاشـین. ف استره

**قۆتک:** (+) گوڵەنگ، گوڵنگ. ف منگوله

**قوتــوو:** (+) قووتوومــە، کۆلکــە دار، کۆلــک. ف کندەی درخت.

**قوتوومە:** قۆتـەرە، کۆلک، کۆتـەرە، کۆلکەدار. ف تنەی درخت

**قوتە:** بانگ کردنی گەماڵ. *(قوتە قوتە قوتە قوتە.)* ف صدا زدن سگ

**قۆتە:** قۆخە، کۆخە، کۆکە. ف سرفه

**قوچبن:** قوژبن، سووچ. ف گوشه

**قودوو:** ) پارچەیەکی قەدیمی بوو بۆ جلی ژنان؛ ) قوتوو، قالک، دەفری چکۆلـەی سـەرپۆش دار بۆ کەل و پەل. ف ) نام پارچەای قدیمی؛ ) قوطی

**قـودەقـورە:**گچکـەی تـرزل، وردیلـەی بـە پـۆز و هەوا، کوڵەبنەی قۆڕەدەماخ. ف کوتولەی متکبر

**قودیلە:** ئاوێنەیەکی خڕی چکۆڵـەیە لـە گیرفاندا هەڵیدەگرن. ف آیینەی جیبی

**قوڕاڵە:** جـۆرێ پیـوازە کە سـەلک ناکا و وەک سەوزی کەڵکی لێوەردەگرن. ف پیازچە

**قوڕانیـشک:** هـەنیـشک، بـەلـەمـرک، قوڕانیـک، کۆڕەنیشک. ف آرنج

**قوڕانیک:** هەنیشک، بەلەمرک. ف آرنج

**قـۆرت:** جـۆرێ ڕەوتـی یـەکسمە. ف نـوعی راه رفتن اسب

**قورتم لێدان:** قوم لێدان، بە یەک قورتم ئاوەکەی خـواردەوە، قـورتمێکی لـە ئـاوەکـە دا و بـۆی نەخورایەوە. ف هورت زدن آب

**قۆرخان:** گوندێکی ناوچەی فەیزوڵڵابەگی بۆکان بـوو کـەوتـە بـەر سـەدی کۆرشـی کـەبیـر. ف روستایی در منطقەی فیض‌اللەبیگی بوکان زیر سد کورش کبیر رفت

**قوڕقوڕاوکە:** قوڕقوڕۆچکە، تینتینۆکە، قوڕگ. ف حلقوم

**قورناقە:** گەروو، ئەوک، قوڕوو. ف حلقوم

**قورنجک:** نقورچک، ڕەبادان. ف نیشگون

**قوڕۆقەتێ:** جنێوێکە، قسەیەکی ناخۆشـە، وەک قوزەڵقورت. ف دشنامی است

**قوروگنـە:** قوڕقوڕاچکە، تینتینۆکـە، بینبینۆکـە. ف حلقوم

**قوڕۆڵە:** ☜ قوڕاڵە

**قۆرەپیـشان:** بریتـی لـە مـانگی گـەلاوێژ. ف مـاه مرداد

**قۆڕەدەمار:** بەهەوا، بەدەمار، قۆڕەدەماخ، بەپۆز. ف متکبر.

**قــوڕەزێلاقــە:** ئــەو قــوڕەی دوای بــاران بــە کەوشەوە دەنووسێ. ف گل چسبناک

**قـوڕەسـواخ:** سـواخدانـی دیـوار بـە قـوڕ. ف گـل اندود کردن دیوار

**قـورەکـەشـی**: تیروپـشک، پـشک خـستن.ف قرعەکشی

**قۆرە لـێبـڕین**: چـۆرە لـێبـڕین، بـین پێوەنـانی گۆزە ئاو و هەڵچۆڕاندنی بە تەواوی *(بینی بە گۆزەکەوە نا قۆرەی لێبڕی.)* ف خوردن ظرف آب با یکبار بە دهن گرفتن، هورت کشیدن.

**قورەنیسک**: قرقێنە، قرپ.ف آروغ

**قوریـشکە**: قورووشـکە، جۆرێـک ئیـستکانی قولفدارە لە چینکۆ.ف نوعی فنجان لعابدار

**قۆریلە**: زەردەقۆرە، جۆرێ مارمێلکە.ف سمندر

**قورینگی گۆزەڵێ**: شینە شاهۆ.ف درنا

**قۆزاخە**: (+) ) کەلـووی نیسک و نۆک و پاقلە؛ ) پیلـەی کرمـی هـەورێشم، کـەلـوو.ف ) پوشـش دانـەی نخـود و عـدس و لوبیـا؛ ) پیلـەی کـرم ابریشم

**قوزەبزە**: قوزە بزنە، جۆرێ تەمبێ کردنە لە کایەدا، *(کایەکە لەسەر چی بکەین لەسەر هەلاتن، قوزەبزە یان شت کرین.)* قوزەبزەش قوولکێک لەنێو خۆڵە مرەدا دروست دەکەن و خیزێکی چکۆلـەی تـێ دەخـەن ئـەو کـەسـەی کایـەکـە دەدۆڕێنێ دەبێ بۆ تەمبێیانە ڕاکشێ و بە زمان ئـەو خیـزە لـە قوولکـە چکۆلـەکـە دەرهێنـێ.ف نوعی تنبیە کردن در بازی

**قۆلان**: تەنگەی ولاخ، ئەو پارچە قایشەی بەژێر سـکی ولاخیدا دێنن و کورتانـەکـەی پـێ تونـد دەکەن. ف نوار پهن تنگەی ستور.

**قۆڵ لـێهـەڵماڵین**: دەسـت بـەکار بـوون، خـۆ لـە کار هەڵکردن.ف دست بەکار شدن

**قوڵباندن**: شاردنەوە، حەشاردان، قایم کـردن.ف پنهان کردن.

**قۆڵتاس**: ئاوگەردان، مەلاقەی گـەورە.ف ملاقـەی بزرگ

**قـولتڕ**: بـە ژنـی پیـر و سـووک و چـرووک دەگوترێ. *(هەر پیرێژنە قۆلتڕێ دوو قسەی بۆ بکا فریو دەخوا.)* ف پیرزن بدکارە و بیارزش

**قۆڵغە**: سەکۆ، بەرزاییەک لـە ماڵدا بـۆ دانیشتنی هاوینان.ف ایوان

**قولفاوقوون**: پێچەوانـە. *(قولفاوقوون لێی حاڵییە.)* ف عوضی، برعکس

**قولقولان بـاز**: فێڵـەبـاز، تـەڵـەکـەبـاز، کلاوچـی.ف کلکباز

**قۆڵنج تەقاندن**: ☜ کۆڵنج شکاندن

**قولنچک**: ) قولینچک، سـووچ، قونیچک؛ ) قامکە چکۆڵە، تووتە.ف ) گوشە ) انگشت کوچک

**قوڵە کەیخودا**: کەسێک کە لە خۆڕا خۆی لە کار هـەڵدەقـوتێنێ و جوابیـشی نـادەنـەوە *(ئەم قوڵـە کـەیخودایـە چیـی بـەدەستـەوەیـە.)* ف کـسی کـە دخالت در کار مردم میکند

**قوڵە**: (+) کوللە، کلۆ.ف ملخ

**قوڵـەبـاڵ**: کوڵـەبـاڵ، فـەرەنجـی، پـەسـتەک.ف جلیقەی نمدی

**قوڵەبـەگ**: بریتـی لـە کـەسێک کە ئـەدای بـەگ و خانـان دەردرێنـێ. مـرۆی تـرزل و بـەپـۆز *(وا لـووتی هـەڵێنـاوە دەڵێی قوڵـەبـەگـە.)* ف کـسی کـە ادای خانان درمیآورد

**قولـەزەنگی**: قولـەڕەش، مـرۆی پێـست ڕەش.ف

سیاه پوست

**قوڵەشینە:** مەلێکە بەقەد کاسەڵەشینکەیەک دەبێ کلکی قۆڵە و لە قەراغ چومان دەژی.ف ماهی خوارک کوچک

**قۆڵەمیر:** بەدەسەڵات، کەسێک کە هەموو کارێکی وەک میران دەچێ.ف کسی که رفتارش مانند میران است

**قولێجان:** گیایەکە وەکوو مالۆنجە بە زەویدا پان دەبێتەوە بەرێکی ورد دەگرێ وشکی دەکەن و لەگەڵ چایی دەمی دەکەن بۆ سەرمابوون و هەڵامەت باشە.ف اسم گیاهی دارویی

**قولینچک:** سووچ، قوژبن، قونیچک.ف گوشه

**قولێنک:** قرقێنە، قرپ.ف آروغ

**قولێنە:** (+) دەفرێکە بە شووڵ دروستی دەکەن وەک سەوەتە وایە قاپ و قاچاخی تێدەخەن.ف سبد بزرگ

**قوماچ:** نیشانە، ئارمانج.ف هدف، آماج

**قوماهەنگ:** جاڕوو، قسڵ و خۆڵەمێش بۆ سواخدانی حەوز و دیواری بەردین.ف ساروج

**قۆمرغانە:** شوێنی مانەوە، شوێنی حەسانەوە.ف اطراقگاه

**قومقومە:** (+) سەرمازەڵە، لاسابانکەرە.ف آفتاب‌پرست

**قومۆک:** چۆڕە ئاو، قومێک ئاو، *(قومۆکێ ئاومان دەنێ.)* ف جرعه

**قۆمەتە:** کۆمە، کۆگا *(لەسەر قۆمەتە کولۆشەکە دانیشتبوو.)* ف توده گیاه

**قون هەڵتەکێنە:** قنگ هەڵتەکێنە، بەرگاییلکە.ف دم جنبانک

**قونجاندن:** قووچاندن، نووقاندن.ف بستن

**قونجلیسک:** قونجرکە، پێکوڵ، پەیکوڵ.ف خار سە کوهک

**قوند:** قوڵ، کلکبڕاو، دووڤ کورت.ف دم بریده

**قونیچ:** ☜ قولینچک

**قووش کاغەز:** تەیارەی قاقەزی، موشەکی قاقەزی.ف موشک کاغذی

**قاووقوول:** قوولە و هەرا، قوولەقوول.ف هوار و داد

**قووڵکە و تەمبار:** کەند و لەند، زەویی چاڵ و چۆڵ و بەرز و نەوی.ف زمین پست و بلند

**قوون پاڵە:** نەفەری ئاخر لەلای چەپەوە لەبەرە دروێنەدا، یەکەم کەس لەلای ڕاستەوە سەرپاڵەیە.ف نفر آخر در سمت چپ صف درو کردن

**قوون خوێ نەخواردن:** بریتی لە هەدا نەدان و نەسرەوتن، نەحەجمین. *(لە هیچ کوێ قوونی خوێ ناخوا، دەڵێی جیوەی تێ کراوە.)* ف کنایە از آرام نگرفتن

**قوون دانە سەر دەرپێی خۆ:** لە ئیختیاری خۆدا بوون، منەتی کەس نەکێشان و دەسەڵات لە دەس خۆدا بوون. *(خۆشە منەتی کەس هەڵنەگری و قوون بدەیە سەر دەرپێی خۆت و دانیشی.)* ف کنایە از داشتن اختیار کار و زندگی خود.

**قوون دەهۆڵ:** بریتی لە مرۆڤی خوێڕی و قوون قورس، کەسێک کە قوونی زلە و توانایی هیچ

کارێکی نییە و ناتوانێ هەستێ.ف کنایە از تنبل
**قوون قورس:** تەمبەڵ، لەش گران، تەوەزەل.ف تنبل
**قوون هەڵدراو:** بریتی لە خوێڕی و بێکارە، پیاوی سووک و چرووک.ف کنایە از آدم بی‌سر و پا
**قوون هەڵکرێنە:** بریتی لە مانگی ڕەشەممە کە دەغڵ و دان و دانەوێڵە کەم دەبێتەوە و لە تەواو بوونە.ف کنایە از ماه اسفند کە ذخیرەی زمستانی کاهش می‌یابد
**قوونڕەش:** جۆرێ مراویی بۆرە کلکی ڕەشە. ف اردک ارەای
**قوونوو:** گۆزەی هەنگ کە بە قور چەند دانە گۆزەی تری پێوە دەلکێنن.ف تبدیل کندو برای زنبورعسل
**قوونە خلیسکێ:** خلیسکێن لەسەر بەفر بە دانیشتنەوە.ف سرسرەبازی نشستە
**قوونەجوورە:** قنگەجوورە، ئێسکی پشتەقوونی مریشک.ف استخوان تخمدان مرغ
**قوونەخەو:** خەونووچکە بردنەوە بە دانیشتنەوە، خەوتن بە دانیشتنەوە.ف در حالت نشستە بە خواب رفتن
**قوونەگاز:** لای دواوەی پشتی یەکسم کە ئاخری کورتان دەکەوێتە سەری.ف قسمت عقبی پشت الاغ کە آخر پالان رویش می‌افتد
**قوونەڵتس:** قنگەڵتس، هەڵتووتەکانی سەگ و پشیلە و ڕێوی و ...ف چنباتمە زدن سگ و گربە و روباە و ...

**قوونەڵفس:** قنگەڵتس، هەڵتووتەکان.ف ☜ قوونەڵتس
**قەپانچە:** قۆچەقانی، قەڵماسک، کەهنیک، بەردەقانی، قەڵماسن، قەڵماسەنگ.ف فلاخن
**قەپۆچکە:** شەیتانۆکە، نینۆکە شەیتان.ف حلزون
**قەپەنگ:** )ئەو قولاپەی قەساب گۆشتی پێدا هەڵدەواسێ ) دەرابە.ف )چنگک ) کرکرە
**قەتحە:** چوارچێوەی وێنە، قاپی عەکس.ف قاب عکس
**قەدەڵە:** جۆرێک دەفری فافۆنە بەقەد کووپەیەک دەبێ شیری تێدەکەن و دەیکوڵێنن.ف دبەای از جنس روی برای شیر
**قەدەم مەڕی:** جۆرێ ڕەوتی یەکسمە.ف نوعی راە رفتن اسب
**قەرات:** قەڵات، قەڵا.ف کلات
**قەراتە:** ☜ قەڵاتە
**قەراغ بۆ تێکردنەوە:** ) بریتی لە تەمبێ‌کردن و لێدان لەسەر کارێکی ناڕەوا، سزادانی کەسێک لەسەر تاوان. *(تۆزێ قەراغی بۆ تێنەکەمەوە یاغی دەبێ.)* ؛ ) وەرد کردنەوەی کڵۆشی دەوری خەرمان لە کاتی گێرەکردندا. *(کڵۆشەکە زۆر بڵاو بۆتەوە دەچم تۆزێ قەراغەکەی بۆ تێدەکەمەوە.)* ف) کنایە از تنبیە کردن و زدن؛ ) جمع کردن دوروبر خرمن
**قەراغ لێکێشان:** لەسەر ڕۆیشتن، قسەی زیادی کردن، *(لەوە زیاتر قەراغی لێبکێشی پێچ و کڵاومان تێکەڵ دەبێ.)* ف حرف اضافی و ناراحتکنندە

**قــەراغ و بیجــاغ**: دەوروبــەر، دەورانــدەور.[ف] دوروبر

**قەرخ**: ئەو بەرە وێنجە و گیایەی کە بە یەک زەبری مەڵەغان دەدووردرێتەوە. کەرخ.[ف] علفی که با یک ضربەی داس درو شود

**قەرقلیت**: قەرەقرووت.[ف] قراقروت

**قەرقوش**: (+) نەخۆشییەکی سمی چارەوێیە ناتوانێ لە عەرزی دانێ.[ف] بیماری سم اسب

**قەرقوو**: شەرا، گەنم و نۆکێک کە بەر لە گەیشتنی وشک دەبێ. *(وەک گەنم قەرقوو شەرا بردیەسم/ قسەی هات و هوت ناکەس کوشتییەسم.)* [ف] گندمی که قبل از رسیدن می‌خشکد

**قەرملاندن**: سەرلێشێواندن، قڕهاندن، لەبکاندن. [ف] گمراه کردن

**قەرۆن**: ناوی یارییەکی منداڵانەیە.[ف] نام یک بازی کودکانه

**قەرە**: گوندێکی ناوچەی فەیزوڵلابەگی بۆکان بوو کەوتە بەر سەدی کورشی کەبیر.[ف] نام روستایی در منطقەی فیض‌اللەبیگی بوکان زیر سد کورش کبیر رفت

**قەرەئەفتاوە**: حەوجۆش، لوولێنەی مەفرەق.[ف] آفتابەی مسی

**قەرەبالغ**: جەماوەری زۆر لە دەوری یەک، ئاپۆرەدانی خەڵک و هەرا هەرا.[ف] جمعیت انبوه

**قەرەباڵغ**: قەڵەباڵغ، قەرەبارغ، ئاپۆرەی حەشامات لە شوێنێک، هەرا و زەنازەنای فرە. [ف] شلوغی جمعیت

**قەرەپەستە**: پاڵەپەستێ، پاڵەپەستۆ.[ف] فشار در میان انبوه مردم

**قەرەچوخ**: ناوی چیایەکە لە کوردستان.[ف] نام کوهی در کردستان

**قەرەخان**: ناوی گیایەکە دەیسووتێنن و خۆڵەمێشەکەی وەک بەرد ڕەق دەبێ، لە ئاودا دەیکوڵێنن و هێشووە ترێی تێهەڵدەکێشن و هەڵیدەخەن دەبێتە کشمیشی سەوزە.[ف] نام گیاهی است

**قەرەسەقەل**: ناوی گیایەکە.[ف] نام گیاهی است

**قەرەفتێڵە**: چرادەستی، پیوسۆز، چرای شیلەگەرچەک.[ف] چراغ فتیله

**قەرەفیسکان**: هەڵترووشکان، کوندکی، هەڵتووتەکان.[ف] چمباتمه نشستن.

**قەرەقۆز**:پاڵەوانی بێ ناوونیشان، ئەکتەری بێ ناوناو بانگ[ف] بازیگری که معروف نباشد

**قەرەقاوت**: ناوی گیایەکە لە قامیش دەچێ.[ف] گیاهی شبیه نی.

**قەرەقوش**: (+) نەخۆشییەکی سمی ئەسب و یەسترە کە دەبێتە هۆی توپینیان.[ف] نوعی غدەی عفونی که در پای اسب و قاطر پیدا می‌شود و موجب مرگش می‌شود

**قەرەمات**: عەجایب، سەیر و سەمەر، عاجباتی. [ف] عجیب

**قەرەوانی**: قەرەوانە، دەفرێکە وەک کتری وایە لە تەنەکە دروستی دەکەن شوان چایی تێدا لێدەنێ.[ف] کتری کوچک درست شده از حلبی

**قەرەوڵ**: (+) دیاری کردنی خشتی براو، بۆ هەر

هەزار دانە خشتێک بەرز دەکەنەوە و پێی دەڵێن قەرەوڵ.ف نشانە کردن آجر

**قەرەهێڵ**: گێژەڵووکە، گەردەلوول.ف گردباد

**قەرەیەخە**: پیاوی ڕەشۆکی لەنێو نیزامیدا. جاش *(سەربازدەوری کێوەکەیان دا و چەن قەرەیەخەیان وەپێش خۆیان دابوو.)* ف افراد شخصی میان سربازان

**قەرێتە**: قەڵادە، قەلاتە، سنجۆڵ، سنجۆر.ف قلادە

**قەرێر**: پەرژینی سەر دیواری ماڵ.ف پرچین روی دیوار

**قەشقە**: ١) کەتەوڵ، گیایەکە وەک کونجرە وایە لەنێو گەنمدا شین دەبێ گوڵی سپییە و دەنکەکەی وەک پێکوڵ وایە ) قەشان، بەش، کەڵ و گای نێوچاوان سپی ) بریتی لە کەسێک کە خۆی دەنوێنێ و دەیهەوێ خۆی نیشان دا. ف) گیاهی خاردار ) گاو پیشانی سفید ) آدم خودنما و تابلو

**قەشک**: ناوی گوڵێکە.ف نام گلی است

**قەشە ماسی**: قاشە ماسی، جۆرێ ماسیی زار گەورەیە و گۆشتی خۆشە.ف نوعی ماهی دهان بزرگ با گوشتی لذیذ

**قەفقەفە**: گیایەکە لە قەراغ چۆم دەڕوێ.ف نام گیاهی است

**قەلاپرچن**: قەلاچن، قەلاقووچکە، لەسەر یەک داکراوی کۆما کرا. *(قاپێکمان لە ترێ قەلاپرچن کرد و پێمان دا.)* ف برروی هم انباشته

**قەلاتە**: (+) تایە، گیشە، کۆمای گەنم و نۆک و جۆ دوای دوورینەوە.ف تودەی گندم درو شدە که برروی هم میچینند.

**قەلاش**: دلاوا، بەدەهەند، دەستودڵباز، دڵفرەوان.ف سخاوتمند

**قەلاغ دان**: سواخ کردنی قەلاغ بە شیاکە و ڕیخی ئاژەڵ.ف اندود کردن محل نگهداری تپالە با مدفوع گاو

**قەلاغ**: شوێنێک کە تەپاڵەی تێدا عەمبار دەکەن. ف تاپالەدان

**قەڵپن**: قەڵپنگ، کەرخنکێنە، گیایەکی بەرزی قەڵتاس دارە.ف نام گیاهی است

**قەڵپنگ**: کەرخنکێنە، قەڵپن، گیایەکە قاڵتاسی هەیە و لە گەرووی ماڵات دەگیرێ.ف نام گیاهی است

**قەلپووچ**: قەڵپووت، کەسێک کە گلێنەی چاوی دەرهاتبێ.ف کوری کە کرەی چشمش بیرون آمدەباشد

**قەڵتاس**: ☜ قاڵتاس

**قەڵچغ**: قەڵتاس، قاڵتاس، داسوو.ف اخگل

**قەڵچغە کردن**: زیپکە کردنی لەش بە سەرما و مۆچرک، پەڕەمریشکە.ف مورمور شدن پوست بدن

**قەڵغان**: ☜ قاڵغان

**قەڵقەلاشک**: قنگەلاشک، دڕووی کنگر، قانگەلاشک.ف بتە کنگر خشک

**قەڵماندن**: قەوماندن، هەلاییساندن.ف برپاکردن جنجال

**قەلەوقوتە**: قەرە و قوتە، بریتی لە فەقیر و هەژار و ڕەش و ڕووت کە ورووژم دەکەنە

سەر خواردەمەنی. ف کنایه از مردم فقیر و تهیدست که به سوی خوراکی هجوم می برند.

**قەلەبانەیی:** قەلە سابوونە، قەلە سابوونی، قالاوی باڵ ڕەشی لەش خۆڵەمێشین. ف کلاغ خاکستری و سیاه

**قەلەسوو:** داسوو، قەڵتاس، قەڵچغ. پرزەی گوڵە گەنم و جۆ. ف اخگل

**قەڵەمتۆز:** دارێکە وەک چنار وایە گەڵاکەی بۆ دەرمان دەبێ. ف نام درختی است

**قەلەمندارە:** (+) بریتی لە شتێک کە لە جێی خۆی نابزوێ. ف کنایه از چیزی یا کسی که از جای خود تکان نمی‌خورد

**قەڵەمەزەردە:** چاوسپیلکە، ناوی درووییەکە. ف نام خاری است

**قەڵەمەهاڕ:** گردەبڕ، شکانی دەست و لاق بەجۆرێ کە تەکەی بێ. ف شکستن دست و پا طوری که استخوان قطع شده باشد

**قەڵەنگ:** (+) قالانگ، قەلاگ، ئاسن و داری سەرخوار بۆ میوەچنین و دەرهێنانەوەی شتی لە چاڵکەوتوو. ف چنگک

**قەڵەویچکە:** برێ قەڵەو، تا ڕادەیەک قەڵەو. ف اندکی چاق

**قەڵیشک:** ناوی گیایەکە. ف نام گیاهی است

**قەڵینگ:** گیایەکە وەک کەرخنکێنە وایە. ف نام گیاهی است

**قەمامە:** (+) تەقەڵدانی تیر لەنێوەڕاستیدا بۆئەوەی زۆر شۆڕ نەبێتەوە *(تیرەکە زۆر شۆڕە قەمامەی کە با تۆزێ هەڵکشێ.)* ف دوختن وسط خورجین

**قەمتەرە:** (+) )سەر دەرگا، سەردەرانە، درگانە.) پەتي بەستني چادر. ف )آستانەی در. )ریسمان بستن چادر.

**قەمچقەمچۆکە:** گوڵێکی بنەوشە نیو مەتر بەرز دەبێتەوە و منالان کلاوە گوڵینەی پێ دروست دەکەن. ف گلی بنفش که بچەها با آن کلاه می‌سازند

**قەمچکەرە:** مەلێکی بچووکی بۆرە لەبن بەردی شاخان هێلانە دەکا و لەنێو هێلانەکەیدا لەجیاتی پووش بەردی پان و چکۆلە دادەنێ و هێلکەی لەسەر دەکا. ف نام یک پرنده است

**قەمچی شێلاق:** گیایەکە وەک کەرخنکێنە وایە لە مێرگدا دەڕوێ. ف نام گیاهی است

**قەمۆچکە:** زارکی ئاگرپژێن *(ئاور لە قەمۆچکەی گڕکانەکەوە دەردەچوو.)* ف دەهانەی آتشفشان

**قەنتارقینشەلە:** کەمتیار، کەمتار. ف کفتار

**قەواتی:** چیرۆک، هەقایەت، خەبەرۆشک. ف افسانه

**قەواڵ:** قەوارە، قەلافەت، لەش و لار. ف اندام

**قەوزیل:** ڕیوەڵە، مردەلۆخ. ف لاغرمردنی.

**قەولگیر بوون:**پەیمان بەستن، بەڵێن دان، ف قول دادن.

**قەهێکەر:** نەزانکار، گەوج، بێمێشک، ناهیر، هەقمەق. ف ابله

**قەیاغەڕیخە:** جۆرێ قەیاغی گەڵا ورد و باریکە بۆ دوورینەوە نابێ. ف نام گیاهی است

**قەیتوول:** خونچە، پشکوژ، چرۆ. *(سۆسەن ساق*

*ســەوز جــەلای نــساران/ چــون تــەواف داران قەیتوول و ناران. «سەیدی هەورامی».* ف غنچه

**قەیتەرقوو:** چارەنووسی نادیار. ف بلاتکلیف

**قـەیچـۆڵ:** دەم هـەپک، بێددان. ف دهـان بـدون دندان

**قـەیچی قـەیچی:** یارییـەکی مندالانـەیـە وەکـوو حەولوا وایە، حیندرحۆ. ف الاکلنگ

**قـەیسەر:** (+) شـەختـە، شـەخـسە. *(بێستانەکـە قەیسەر لێیداوە.)* ف سرمازده

**قەیسەربردوو:** سەرمابردوو، شەختە لێدراو. ف سرمازده

**قیافە:** لەشولار، قەلافەت، بەژنوبالا ف قیافه

**قیافـە گـرتن:** پـۆز لێدان، فیـز و هـەوا نوانـدن *(دەڵێی کوڕی قەراڵی فـەرەنگـە قیافـەی گرتـووە)* ف قیافه گرفتن

**قیپتی:** کەسنـەدیو، قوشـقی، شـەرمێون و سڵ. *(ئەوە بۆ هەڵدێ دەڵێی قیپتییە.)* ف آدم خجالتی

**قیچ:** کچ، کەنیشک، کەنی، کیژ. ف دختر

**قیرسز:** ڕژد، قرنیس، ڕەزیل، سەقیل، چکووس، چکوود. ف خسیس

**قیرەون:** کەسێک کە لە مامەڵەدا زۆر چەنەچـەن دەکا، *(ئـەوە هێنـدە قیـرەونـە بـۆ ئـەوە نـابێ شـتی لـێبکـرێ.)* ف کسی کـه در معاملـه زیـاد چانـه میزند

**قێزەوەر:** قێز هەستێن. ف تنفرآمیز

**قیلمقازە:** سەرشان، چۆڵەمەی ئەستۆ، جۆتکەی مل، ناوملان. ف جناح گردن

**قیلـی کـەوای سـپی:** بریتـی لـە مڵـۆزم و مێمـڵ، کەسێک کە دەستبەردار نابێ و خۆ بە پیاوەوە هـەڵدەواسێ *(لێمـان بۆتـە قیلـی کـەوای سـپی.)* ف کنایه از مزاحم



**کاتژمێر**: (+) عەقرەبەی سەعاتژمێر لە کاتژمێردا.[ف] عقربەی ساعتشمار
**کاتیلە**: کیتەڵە، دیزەی چکۆڵە.[ف] دیزی کوچک
**کارازا**: کەرکیت، هەپە، شەیپۆکوت، دەفەی فەڕش کوتان.[ف] دفتە، شانەی پود کوبی
**کارتنەک**: جاڵجاڵووکە، داپیرۆک، داوەتەنە.[ف] عنکبوت
**کارتۆ**: بەیات، پەزێرە، خۆراکێک کە شەو مابێتەوە. شەوپاتە.[ف] خوراک شب ماندە.
**کارتەپەلە**: سەقر، مەلێکە بەقەد کۆتر دەبێ بە حەواوە لەنگەر دەگرێ.[ف] قرقی
**کارچڤ**: هەڵووچە، هەڵووژە.[ف] آلوزرد
**کارگە بەر سوورکە**: کارگێکی خۆراکییە لەنێو مێرگ و گیا و گژدا دەڕوێ.[ف] نوعی قارچ خوراکی
**کارگە دارانە**: کارگەدارە، کارگێکی تیژ و ژەهراوییە لەسەر کۆلکەداری ڕزیو هەڵدەتۆقێ.[ف] قارچ درختی
**کارگی کەما**: باشترین کارگی کوێستانە لەسەر بنجی کەما هەڵدەتۆقێ.[ف] نوعی قارچ مرغوب
**کاروانەڕێ**: شاڕێ، ڕێگای گەورە.[ف] بزرگراە
**کاروەدەس**: کاربەدەست.[ف] کارمند
**کارەبا**: (+) جۆرێک مووروورە تەسبێحی پێ دروست دەکەن.[ف] نوعی مهرە برای تسبیح
**کاری**: (+) سەخت، دژوار. *(تازە دەردی کارییە.) (دەردت کاری بێ!)* [ف] سخت، کاری
**کاریت**: هەنگوین.[ف] عسل
**کاریدۆر**: دالان.[ف] دالان
**کاسۆلە**: گەمژە، گەلحۆ، گەوج.[ف] ابلە
**کاسووری**: تیرەیەکە لە هۆزی مامەش.[ف] نام طایفەای از ایل مامش
**کاشمەر**: کاشمە، ناوی گیایەکە وەکوو کاهوو وایە.[ف] نام گیاهی است
**کاڤان**: کەیبانوو، خاتوونی نێومال، کابان.[ف] کدبانو
**کاڤۆک**: کابۆک، کۆتر.[ف] کبوتر
**کاڤی**: چیانشین، کەسێک کە لە چیا و کێو دەژی.[ف] کوەنشین
**کاکیلکە**: خلێنە، کاکیلە.[ف] دندان آسیاب
**کاکیلە**: ☜ کاکیلکە
**کاڵفام**: بیرکاڵ، عەقڵسووک، هەرزەکار.[ف] کم عقل

**کاکڵەمێشان:** ☜ کەڵکەلەمێشە

**کاڵۆک:** کەوشی ڕاو، کاڵە، *(کاڵۆکی خۆم لەپێ دەکەم و دەڕۆم.)* ف نوعی کفش چرمی دەستساخت

**کاڵوکرچ:** (+) بریتی لە مرۆی سوور و سپی و ناسک، ڕووئاڵ. ف سرخ و سفید و لطیف

**کالووش:** کلاش، کەوشی بەناوبانگی هەورامان. ف گیوه، گالش

**کاڵەی شەمامەبەندی:** کاڵە و پێڵاوی چەرم بوو قەدیم سازیان دەکرد و بە هەورێشمی ڕەنگاوڕەنگ گوڵ و گوڵینگەیان پێوە هەڵدەواسی. ف نوعی کفش دستدوز قدیمی

**کام شکان:** خواردنی شتێک بۆ ئیشتیا بەسەرچوون. ف کامروا

**کانێس ئەستوور:** ) ئێسکگران، ڕەزاتاڵ، ئێسکقورس؛ ) ڕۆحزل، نەفس بەرز، دڵگەورە. ف ) اخمو؛ ) متکبر

**کاولەدەم:** بریتی لە کەسێک کە ددانی لە دەمدا نەمابێ. ف کنایە از کسی کە دندان در دهان ندارد

**کاولەکۆن:** کاولاش، ماڵی کۆن و رووخاو. ف ویرانەی قدیمی

**کاوەمەلەیی:** جۆرێ سێوی وردی سپییە هەوەڵی هاوین دەگا. سێوی کاغەزی. ف نوعی سیب.

**کاوێ:** ) گەوج، حەپول، خول؛ ) پیری لەون لێگوڕاو، خەرەفاو. *(حەیفە گەورە کچ بۆ پیاوی کاوێ.)* ف ) ابله؛ ) پیر سفیه

**کاوێز:** پڵنگ. ف پلنگ

**کاهێڵ:** تەمبەڵ، تەوەزەل، قوون قورس، لەشگران. ف تنبل

**کتکشۆر کردن:** *پشیلەشۆر کردن، شوشتنی ناتەواو.* ف سرسری شستن

**کتکە کێفی:** پشیلەی کێوی. ف گربەی وحشی

**کتڵی:** کتری، کەتری. ف کتری

**کچەتیو:** کچی بێ باب، کچی سەغیر. ف دختر صغیر

**کچەتیوە:** جنێوێکە بە کچی دەدەن، چەتیوە. *(کچەتیوە بۆ ئاورت گرتووە؟)* ف ناسزایی بە دختر

**کچەکێ:** وشەی دواندنی یەکتر لەنێو ژنان و کچاندا. *(ئەیەڕۆ کچەکێ دوو ڕۆژە ئەو کورە هەراسی بەو دەرکوبانە هەڵگرتووە.)* ف حرف همراهی در میان دختران

**کچەوەرە:** جلوبەرگ و سەروپۆتراکی جوان. *(کەوا و پاتۆڵێکی کچەوەرەم بۆ بدوورە.)* ف دخترکش

**کراری:** کارزان، لێهاتوو. ف کاردان. ماهر.

**کراودلە:** ناوی تیرەیەکە لە هۆزی مامەش. ف نام طایفەای در ایل مامش

**کرتۆپە:** پەتاتە، هێرەڵماسی، سێوک. ف سیبزمینی

**کرتێنە:** ) کرۆژکە) قرتێنە ، قرتە. ف ) غضروف. ) منگنە.

**کرخەو:** خەوی قورس، بەتەواوی خەو لێکەوتن. ف خواب سنگین

**کرژۆر**: رژد، قرنیس، چکووس، چنۆک، سەقیل. [ف] خسیس

**کــرژوور**: چکــووس، ســەقیــل، پیــسکە، دەستقووچاو، رژد. [ف] خسیس

**کــرمن**: (+) بــەغیــل، بــەتــەمــاح، چاوبرســی، چاوچنۆک، چاوچوو. [ف] حسود

**کرمـۆژە**: خـۆراکی کـەم، وردە وردە خـواردنی نـان. *(زۆر تێرم بەڵام لەگەڵ ئێوە کرمـۆژەیەک دەکەم.)* [ف] خوردن کم

**کرمە تەنبەڵە**: شەورەو، کرمێکی رەشە بە شـەو لـە برکـەی بێـستان و چـەوەنـدەر و ... وەخـۆ دەکـەوێ و بـە رۆژدا لـەبـن خۆڵدا خـۆی مـات دەدا. [ف] کرم آفت جالیز

**کرمەتووکنە**: جۆرێک کرمی وردە بە تۆپەڵ لـە گیایـەک دەهـاڵێن و تـۆرێکی وەک جۆلاتـەنـە بـەسـەر خۆیانـدا دەکێـشن، دەروێـشەمـارە. [ف] نوعی کرم کرکدار

**کـرمێن**: تیـرێن، جـۆرێ کایـەی منداڵانـەیـە بـە هەڵمات دەکرێ. یەکیان هـەڵماتێک لـە بـەردەمـی خـۆی دادەکـا و ئـەوی دیکـە بـە مـەرمـەڕەکـانی خۆی تێیهەڵدەکا. [ف] تیلەبازی

**کرنـاس**: (+) کـژوور، چکـووس، مـستقووچـاو، چکوود، قرنیس. [ف] خسیس

**کـرۆک**: پـەرچـەم، ئـەنـدامی نێرینـەی گـوڵ کـە هەڵاڵەپرژێ دەکا. [ف] پرچم گل

**کرۆکاش**: کۆ کردنـەوەی گیـا و ئـاڵف لـەم لا و ئەولا. کۆکەند. [ف] جمع‌آوری و چیدن علف

**کرۆو**: کۆچەر، رەوەند. [ف] کوچندە

**کرووتاندن**: کرتاندن، داکرماندن. *(مشکەکە ورد ورد گـەنمـەکـە دەکرووتێنـێ.)* [ف] خـرد کـردن بـا دندان

**کرەکال**: زەوییەک کە هەموو ساڵێک دەکێڵدرێ. [ف] زمینی که هر سال کشت می‌شود

**کرێنک**: کراڵ، رەقەن، چەقەن، شوێنی بـەردەڵان و کەسنەکێڵ. [ف] زمین سنگلاخ که به درد شخم زدن نمی‌خورد

**کزکە کردن**: ☜ کسکە کردن

**کزوەت**: تام، مێلاک. چێژ. [ف] طعم

**کژمژ**: کشمیش، ترێی وشککراو. [ف] کشمش

**کسسە**: دەنگدانی مەڕ، لێخورینی پەز. [ف] کلمـەای برای راندن گوسفند

**کسکە کردن**: کزکە کردن، بـە کزی دانیشتن. [ف] غمگین نشستن

**کشپەڵ**: پشکەڵ، پشقەڵ. [ف] مدفوع گوسفند و بز و خرگوش و شتر

**کشتیلە**: ئاوگەردان، مەلاقە، ئـەسکوێ، دەفرێکی دەسکدارە ئاوی پێ لە مەنجەڵ هەڵدەگوێزن. [ف] ملاقەی بزرگ

**کفنک**: دەموولـووت، لمبـۆزی حـەیوان، *(کفنکـی گایەکەی گرت و دەمبێنی کرد.)* [ف] پوزەی حیوان

**کفـەڵ**: میـوەی بـێئـاو، قانـگ، تـووری کفـەڵ. [ف] میوە یا ترب پوک

**کلاس**: (+) ئاسکی نێر، نێرمامز. [ف] آهوی نر

**کلاش کلاش**: ناوی یارییەکی لاوانی گوندنشینە بەدەورە لەسەر چۆک دادەنیشن و کـەسێک لـە نێــوەراســتیان دادەنــێن و کلاشــێکیان

بەدەستەوەیە و دەیدەنە دەست یەکتر و بە کڵاشەکە لەو کەسەی نێوەڕاستی جەغزەکە دەدەن. ئەو کەسە کڵاشەکە لە دەس هەر کەس بستێنێ ئەو دەچێتە جێی ئەو.ف نام یک بازی

**کڵاوفڕێن:** فێڵەباز، کڵاوبەردار، کڵاوچی.ف کلاهبردار

**کڵافە:** (+) قانگڵە بەن و دەزوو. *(کڵافەیەکم دەزوو بۆ بکرە، کڵافەیەکی بەن دەوێ.)* ف بسته نخ

**کڵاو بابردوو:** بریتی لە مرۆی هەژار و دەستکورت. *(سۆرانی سپی کڵاو بابردوو/ لە چی دەگەڕێی لە برسا مردوو.« فولکلۆر».)* ف کنایه از جوان تهیدست

**کڵاو بە دەورێن:** کایەیەکە چەند منداڵ بە شێوەی بازنەیی دادەنیشن و کەسێکیان کڵاوێک بە دەستەوە دەگرێ و بە دەوریاندا دەگەڕێ کڵاوەکە لە پشت یەکیان دادەنێ، هەر کەس هەڵیهێنێ ئەو دەبێتە مەڵڵا و دەگەڕێ و بەوشێوەیە یارییەکە درێژە پێدەدەن.ف نام یک بازی کودکانه

**کڵاو تێکەڵ بوون:** بریتی لە بەگژ یەکدا چوون، ئاوقای یەکتر بوون، تێک هەڵچوون و یەکتر تلاندنەوە.ف کنایه از گلاویز شدن

**کڵاو فڕێنە:** یارییەکی لاوانەیە.ف اسم یک بازی جوانان

**کڵاوبنە:** کڵاوبن، قاڵاقنگ، ڕێکڵاو، لاسکی گەڵا ڕێواس.ف ساقەی برگ ریواس

**کڵاوچی:** کڵاوساز، گزیکار، فێڵەباز.ف کلاهبردار

**کڵاوساز:** کڵاوچی.ف کلاهبردار

**کڵاولار:** ناڕاست، فێڵاوی، *(گورگم گورگێکی برسی/ کڵاولارم لە ڕاسی. «ژیلا حوسێنی».)*

**کڵاوی سەرچنگان:** ناوی یارییەکی لاوانە.ف نام یک بازی جوانان

**کڵاوی لار لەژێر سەردا بوون:** کاری خراپ و ناڕاست، فێڵ و دەهۆ. *(کڵاوی لار لەژێر سەری ئەو زرتە بۆزە دایە.)* ف اهل دوز و کلک بودن

**کڵچووک:** ) بەڕووڵەی زۆر وردی خەیار کە هێشتا گوڵەکەی پێوەیە. *(ابێستانەکە تازە کلچووکی کردووە.)* ؛ ) کلچێوک، کلچۆک.ف ) خیار بسیار ریز که هنوز گلش نریخته. ) میل سرمەکشی

**کڵفەتە کەچەڵە:** بریتی لە ژنێک کە هەموو کارێکی پێدەکەن. *(لەو ماڵەدا بوومەتە کڵفەتە کەچەڵە.)* ف کنایه از کنیزی که همەی کارها را بر او تحمیل می‌کنند.

**کلکە سووتێ:** ) دووە لەقێ، کلک ڕاوەشاندن، نووزاندنی سەگ لەلای خاوەنەکەی؛ ) بریتی لە ڕیابازی و مەرایی‌کردن.ف ) دم تکان دادن سگ هنگامی که صاحبش را می‌بیند؛ ) تملق

**کلکە لەقە:** بریتی لە کزی و لاوازی و بێتاقەتی، بەزین و ورە پێنەمان. *(کوڕی کورد کەڵلە ڕەقە/ جاش کەوتە کلکە لەقە «ڕەحیم مینایی».)* ف شکست خوردن و ناتوان شدن

**کلکەتەشی:** کەوچکە قوڵە، بەچکە بۆقی هێشتا لاق دەر نەهاتوو.ف بچەی قورباغه

**کلکەقنگێ:** (+) بریتی لە کایە کردن و هەڵبەز

دابەز. *(بەو ڕۆژگارە خەریکی کلکەقنگێیە خۆ دەرس ناخوێنێ.)* ف کنایە از بازی کردن و بالا و پایین پریدن

**کلمیچ**: کلمووچ، کلمیش، چڵمی وشک، کەمێڵەی لووت.ف خلم

**کلوانک**: کلکەوانە، ئەنگوستیلە.ف انگشتر

**کلومنجڕ**: کلا، *(ماڵمان وەران‌وەر یەکن قاپیەکان کەمێ کلومنجڕن.)* ف دقیق برابر نیستند

**کڵەتۆرکێ**: سێ کوچکەی ئاور، سێ بەردی ئاگردان، سێ کوچک.ف سە تا سنگ کە برای آتش می‌گذارند

**کلیل بە بەرۆک**: بریتی لە کیژی عازەب و کابان. یانی گەورە بووە و بۆئەوە دەبێ کلیلی ماڵێی پێ‌بسپێرێ.ف دختر بلوغ و کدبانو کە کلید خانە را بە او می‌سپارند

**کنانیسک**: هەنیشک، بەلەمرک، کورەنیشک، ئانیشک.ف آرنج

**کنجک**: پەڕۆک، پاتک، پارچەپینە.ف پارچە برای وصلە

**کنە**: کەڵک، فایدە. *(کنەی نەماوە ئیتر.)* ف فایدە

**کۆدرێنە**: گەمەیەکی منداڵانەیە.ف نام بازی کودکانە

**کۆپە**: گەوج، حەپۆل، گەلحۆ، گەمشۆ، هەقمەق. ف ابلە

**کۆپەینگ**: سەرانگوێلک، سەلوێنک، سەرگوێلک، گووڤەک.ف محل ریختن سرگین

**کۆتاڵ**: پاتاڵ، ماڵات، وڵسات.ف دام اهلی

**کۆتایی**: دوایی، ئاخر. *(کارەکەمان کۆتایی پێ‌هێنا.)* ف پایان

**کۆتراش**: ) لەبار بردنی منداڵ و دەرهێنانی بە دەزگا؛ ) قۆتراش، دەزگای ڕیش تاشین، خۆتراش.ف ) کوتراش؛ ) استرە

**کۆتربانجیلە**: کۆترەباریکە، کوکوختی، کۆترەبرجیلە.ف یاکریم

**کۆترۆکە**: دەرزیلەیەکە بۆ قژی کچان دەبێ، خشڵێکە لەبەر گەردندا لە دەسماڵی قایم دەکەن بۆ جوانی، بەردەسماڵ.ف یک نوع زیور زنانە

**کۆترە گایە**: جۆرێ کۆتری گەورەیە، گاکۆتر، جۆرێ کۆترە شینکەی گەورەیە.ف نوعی کبوتر بزرگ

**کوتکە خەو**: خەونووچکە، وەنەوز، پینەکی *(خەریکی کوتکە خەو بوو.)* ف چرت زدن

**کوتوپڕ بوون**: سەکتە کردن، جەڵتە لێدان، مردنی لە ناکاو. *(ئەو هەموو ئەخلاقە شیرینەت لەگەڵ پیر و جەوان/ دەک کتوپڕ بم ئەگەر ساتێ لە بیرم چێتەوە «سەید کامیل ئیمامی "ئاوات"».)* ف سکتە کردن

**کۆتەرازوو**: خەرمانەستێر

**کۆتەرە**: (+) ڕووت بوونەوەی دار و گەسک. *(دارەکان کۆتەرە بوون و گەڵایان پێوە نامەوە، گەسکەکە کۆتەرە بووە.)* ف ریختن برگ درخت

**کوتەکوت**: ) ڕۆیشتن لە تاریکیدا. *(بە کوتەکوت ڕێم دەرکرد.)* ؛ ) دەنگی دڵ، *(دڵی کوتەکوتی دەهات، دڵم کەوتە کوتەکوت.)* ف ) راە رفتن در تاریکی؛ ) صدای تپش قلب

**کۆچلەبەر**: ئەو کەسەی لەسەر ڕۆیشتنە،

کۆچەری.[ف] آمادەی کوچ.

**کۆچـــەری:** (+) جـۆرێ هـەڵپـەرکێـی کوردییـە دەرۆن و هەڵدەپەڕن.[ف] نوعی رقص کردی

**کۆچەک:** (+) بەچکە وشتر.[ف] بچەی شتر

**کۆچیل:** نەقوستان، سەقەت، مجرۆ.[ف] فلج

**کۆدە:** بەڵگە، قەواڵە، قەباڵە، تاپۆ.[ف] سند

**کودیلە:** ناخ، دەروون. *(لە کودیلەی دڵییەوە بەو کارە ڕازییە.)* [ف] عمق، ته

**کوردەناموسی:** بریتی لە پەشیمان بوونەوە لە کارێک بـەڵام لـەڕووت هـەڵنەیە وازی لـێبێنێ. *(لێی بۆتە کوردەناموسی دەنا پێیخۆش نییە.)* [ف] کنایـه از پشیمان شـدن از کـاری امـا بـەخـاطر رودربایستی ادامەدادن

**کوڕڕە:** (+) دەنگی خوێندنی مـار. *(مار کوڕڕەی دێ و دەخوێنێ.)* [ف] صدای خواندن مار

**کورس:** بنەرکی خانووبەرە کە چەن پلیکان لە عەرزی بەرز دەبێتەوە.[ف] زیربنای خانه که چند پله بلند است ولی زیرزمین ندارد.

**کورسـیلە:** چوارپایــەی چکۆڵــە.[ف] چهارپایــەی کوچک

**کورکـوژە:** جـۆرێ گـوێژی سـێگوشـەی دەنـک گەورەیە هـەر کـەسێ پێش بارانی پـەڵـەی پایز بیخوا پێی نەخۆش دەکەوێ.[ف] نوعی زالزالک

**کورکە:** مەڵۆ، کۆگای گـەنم و جۆی دووراو.[ف] توده گندم و علف درو شده

**کوڕنجە:** سەرەتان، شێرپەنجە.[ف] سرطان

**کوڕنیشک:** لۆچ، چرچ.[ف] چین و چروک

**کورواخ:** قربۆق، بۆق.[ف] قورباغه

**کورۆژگــە:** کورۆشــکە، خرتــگ، خرێنــگ.[ف] غضروف

**کوڕووســاندنەوە:** کڕاندنــەوەی یــەســقان یــان شـتێکی تـری تێخوڵـدار بـە ددان. *(ئـەو یـەسقانە بکڕووسـێنەوە ددانـت هـەیـە.)* [ف] لخـت کـردن استخوان یا پوستەی چیزی با دندان

**کورە مریـەم:** نـاوی چیایەکە لـە هـەورامـان[ف] کوهی در اورامانات

**کوڕەدەر:** قسەیەکی ناخۆشە وەک قوزەڵقورت. [ف] ناسزا، سخنی تلخ

**کـورەگـوێ:** سـڵ و قۆشـقی، سـرک، سـڵۆکی ئامادی هەڵاتن.[ف] رموک

**کورەمیانە:** ناوی چیایەکە لە هەورامان[ف] کوهی در اورامانات

**کوڕەنیشک:** ☜ قوڕانیک

**کوریـشکە کـردن:** کرووشـمە کـردن، خـۆ مـات کـردن و کـز دانیـشتن. *(هـەسـتە ئـەوە بـۆ لـەو قوژبنــە کوریــشکەت کــردوو.)* [ف] کــز کــردن و نشستن

**کـۆزەرکـوت:** (+) بریتـی لـە ڕەمـەکـی، گـۆترە، هەوەنتە. *(هەروا کۆزەرکوت هەڵدەکوتێتە سەر کار.)* [ف] کنایـه از انجـام دادن کـاری بـدون فکر قبلی

**کۆزەک:** گوێز، گرتەکان.[ف] گردوو

**کۆزیــک:** ) ســـەنگــەر، خـــەڵ، مـــەتـــەرێـــز؛ ) حـەشـارگەی ڕاوچـی بـۆ ڕاو کردنـی کـەو.[ف] ) سنگر؛ ) کمینگاه شکارچی برای گرفتن کبک

**کۆزیلکە بەستن:** کۆ بوونەوە لە دەوری شتێک.

(عالەمێک لە دەوری کانییەکە کۆزیلەیان بەستبوو.) ئاپۆرەدان. [ف] حلقه زدن

**کۆژیل:** کۆمەڵ، جڤات. [ف] اجتماع

**کۆسالان:** ) کۆساران، کوێستانان؛ ) ناوی زەنجیرە کێوێکە لە هەورامان. *(کۆسالان کۆکۆ، وەفری ناچێتۆ.)* [ف] ) کوهساران؛ ) رشتەکوهی در اورامانات

**کۆستەک:** (+) سندم. [ف] شکال.

**کوسوو:** کونی، سەڵیتە، قەحبە، بەستۆکە [ف] جندە، روسپی

**کۆسە میسری:** جۆرێ شمشیری قەدیمی بوو دروستکراوی میسر. [ف] نوعی شمشیر

**کۆسەبەبە:** کۆستەبابی، حەنەکچی، قەشمەری. [ف] دلقک

**کۆسەبەدار:** گەمەیەکی لاوانی گوندنشینە بە دار و پەڕۆ داهۆڵێک دروست دەکەن و دەیگێڕن بە ماڵاندا و نەقوڵ و هێلکە و پارە وەردەگرن. [ف] نام یک بازی

**کوشتارگا:** شوێنی سەربڕینی حەیوان. [ف] سلاخخانه

**کوشتەر:** نەشتەر، *(وەرن جەرگم هەڵدەڕن بە دەبان و کوشتەری/ چەندەم جێژوان لەگەڵ کرد بەر پەنجەرە و دوودەری. «گۆرانی»)* [ف] نشتر

**کوشتەرە:** ☜ کوشتەر

**کوشمەڵە:** خۆ کۆ کردنەوە و دانیشتن بە ماتی، هەڵترووشکان و خۆ گرمۆڵە کردن. *(لەبەر سەرما خۆی کوشمەڵە کردبوو.)* [ف] خود را جمع کردن و نشستن

**کۆڤ:** کوور، کۆم، پشت چەماوە. [ف] کمر خمیده

**کۆکک:** زەویی ڕەمڵ، زەویی لماوی. *(ئەو زەوییە کۆککە ئەگەر ئاوی هەبێ هێرەڵماسیی چاکی دەبێ.)* [ف] زمین ماسەزار

**کۆکلاشک:** کۆکلاش، گیایەکە وەک شنگ وایە بنەکەی چەقەی لێدەگیرێ [ف] نام گیاهی است

**کۆکەند کردن:** گیا ڕنینەوە لە سەحرا بۆ مەڕ و ماڵات. *(سێ چوار شوێن هەیە گیای لێیە بەیانی دەچین بۆ کۆکەند کردن.)* [ف] چیدن گیاه

**کۆگا:** (+) شوێنی کۆبوونەوە، هۆڵی کۆڕ و کۆ بوونەوە. [ف] مجتمع

**کول:** (+) تەپ، گرد، تیرەگ، کەڵک، کەل. [ف] تپه

**کۆلاس:** فیشەککێشی تفەنگ. [ف] گلنگدن

**کۆلانیێچ:** دۆڵ و گەوەی نێو شاخ و زەرد و ماهـ. [ف] درەی سنگی در سخره

**کولانجە:** کولاوکە، کلاوڕۆژنە، ڕۆچنە. [ف] روزنه بام

**کولانجە:** کولاوکە، کلاوڕۆژنە، ڕۆچنە، کولانچکە، کولانکە. [ف] روزنەی بام

**کولاوانجە:** ☜ کوناوجە

**کۆلاوکۆل:** بەتەواوی، *(ناتوانین کۆلاوکۆل واز لە یەکتر بێنین.)* [ف] بەکلی

**کولاوەنجە:** کلاوڕۆژنە، کولاوکە، ڕۆچنە. [ف] روزنەی بام

**کولیێچک:** لانکە، بێشکە. [ف] گهواره

**کوڵکەبەهارە:** ناوی گیایەکە. [ف] نام گیاهی است

**کوڵکەی سەربەخوێن:** بریتی لە مرۆی سەر بە فیتنە و ئاژاوەگێڕ، بەتایبەت بۆ ئافرەتی دڵتەڕ و

**گەوزەیی**: هەرزەیی، سووکوچرووکی و بێ عاری[ف] سبکسری.

**گەوە**: (+) فەرش، قالّی.[ف] فرش

**گەوەڕ**: (+) دەوروبەر، دەوروپشت. *(ماوەیەکە لەم گەوەڕە دێت و دەچێ.)* [ف] اطراف

**گەوێر**: گێر، شەل، نوقستان.[ف] لنگ

**گەیشتنە سەر**: پێگەیشتنەوە، وەدوا کەوتن و گرتنەوە. *(نەیهێشت دە شەقاو هەڵێ گەیشتە سەری.)* [ف] دنبال کردن و گرفتن

**گەینە سەر**: ☜ گەیشتنە سەر

**گیا بەرازە**: گیایەکی بەرزە وەک گەرمەشانی وایە و بەراز حەز بە خواردنی ڕیشەکەی دەکا. [ف] نام گیاهی است

**گیا بەردینە**: خەنەتیلکە، خەنەتیڤک، کرێژە بەرد. [ف] گلسنگ

**گیا بەرزە**: گیایەکی بڵندە وەک مۆسک وایە قالۆری هەیە.[ف] نام گیاهی است

**گیا بیرۆ**: ناوی گیایەکە گوڵی زەردە، دەیکوتنەوە و لەسەر بیرۆی دادەنێن چاکی دەکاتەوە.[ف] اسم گیاهی دارویی برای قارچ پوستی

**گیا پشیلە**: گیا کتکە، گیایەکە گوڵەکەی بە با بڵاو دەبێتەوە، گیایەکە پەپوولە پایزە دەر دەکا. [ف] نام گیاهی است

**گیا تروقە**: گیایەکی کورتەباڵا و پنج بڵاوە و گوڵێکی سپی دەر دەکا و دەبێتە شتێکی وەک پۆرگ و قامکی پێدا بنێن دەتەقێ.[ف] اسم گیاهی است

**گیا خانمانە**: گیایەکە بۆ دۆکوڵیو دەبێ.[ف] نام گیاهی برای آش دوغ

**گیا خاو**: گیایەکی بۆن خۆشە. *(پۆلی گامێش و کەڵە کێوییانم دەدی/ دەهاتنەوە خواری لە دەچێشتاوێ/ سمکۆڵیان دەکردەوە لە سوێسنێ، هەڵاڵی بەیبوونێ، هەرامەتی دەگیا خاوێ «فۆلکلۆر».)* [ف] نام گیاهی است

**گیا دەرزی**: ناوی گیایەکە گەڵاکەی وەک دەرزی تیژ و باریکە.[ف] نام گیاهی است

**گیا سەیزادە**: قۆقمیش، گیایەکە بۆ دۆکوڵیو دەبێ.[ف] نام گیاهی خوراکی برای آش دوغ

**گیا قامچی**: گیایەکی باڵا بەرزە لەنێو زۆنگ و زەلکاواندا دەڕوێ.[ف] نام گیاهی است

**گیا کڵاوە**: ☜ قەمچقەمچۆکە

**گیا گوارە**: گیایەکە لاسکی گوڵەکەی هەڵۆڵە و منداڵان لاسقەکەی تێک دەبەزێنن و گوارەی پێ دروست دەکەن.[ف] نام گیاهی است

**گیا گوڵینگە**: گیایەکە گەڵای وەک فریزوو وایە گوڵی سپی دەر دەکا و لە نێوقەدییەوە چەند گەڵا بە یەکەوە وەک گوڵینگ شۆڕ دەبنەوە. ئەم گیایەماڵی کراوە و لە گوڵدانیشدا دەچێندرێ.[ف] نام گیاهی است

**گیا گەنان**: کاتی گیا زەرد بوون لە سێهەم مانگی بەهاردا، جۆزەردان.[ف] خرداد

**گیا موینە**: گیایەکی گەڵا پان و تووکنە ماڵات نایخوا.[ف] نام گیاهی است

**گیا مەلا**: گیایەکی گەڵا پانە وەک گوێبەرخۆلە وایە بۆ دۆکوڵیو دەبێ.[ف] نام گیاهی خوراکی

برای آش دوغ

**گیا هەوێدار**: گیایەکە گەڵای پانە لە نساری کێوان دەڕوێ لەسەر برینی جێ دەمی ماری دەنێن ژارەکەی دەکێشێ.ف اسم گیاهی دارویی است

**گیاپەڕۆ**: ☜ گوێکەرە

**گیاسرە**: گیایەکە وەک خوژیلک وایە بە گەرمای نیوەڕۆ گەڵاکانی سارد و سڕە دروێنەوان و دەشتەوان لەژێر گۆزە و کیتەڵە ماستی دادەنێن، یان تێیدەپێچن سارد ڕایدەگرێ.) ف نام گیاهی است کە در گرمای تابستان برگهایش سرد و خنک است

**گیاسندە**: گیایەکە لەنێو وێنجەدا بە تۆپەڵ شین دەبێ.ف نام گیاهی است

**گیاقەلە**: گیایەکی گەڵا پانە وەک ترشۆکە وایە بۆ دۆکوڵیو دەبێ.ف گیاهی است برای آش دوغ

**گیان لە سینگ** : ۱) بریتی لە خوێڕی و کەمغیرەت، ترسەنۆک ) گیان سەخت.ف ) کنایە از ترسو. ) جان سخت.

**گیانبژوێن**: هۆی ژیان، بووژێنەرەوە.ف زندگیزا

**گیانەڵگیان**: گیانی گیانی. *(دووس گیانەڵگیان لە برا خاسترە.)* ف دوست جانی

**گێچووک**: گوێچکە، گوێ.ف گوش

**گیرفانپووڵی**: ئەو برە پارەیەی بۆ خەرجی ڕۆژانە دەدرێ بە کەسێک کە لە گیرفانیدا هەڵیگرێ ف پول توجیبی

**گێزبەل**: جۆرێک شنگی گەڵا پان و قۆپەنەیە، گێزبەلە، گێزبەلۆک .ف نوعی شنگ کە برگهای پهن دارد

**گێزمە**: چەکمە، جزمە، کەوشی ملدرێژ بۆ زستان.ف چکمە

**گێزەرەمشکانە**: بادامەعەرزیلە.ف بادامزمینی

**گێژاڵی**: شێواو، ئاڵۆزکاو، کەسێک کە قژن و سەر ئاڵۆزە.ف ژولیدە

**گێژداخ**: بریتی لە مرۆڤی سادە و فریوخۆر. *(چۆن دەتوانی فریوم دا خۆ گێژداخ نەکراوم.)* ف کنایە از کسی کە سادە است و زود کلاە سرش میرود

**گێژوولکە**: گێژۆکە، گێژوویژ.ف گیج و منگ

**گێژەبا**: گێژەڵووکە، باگەڕ، باهۆز، گەردەلوول، گەرەپێچ، گەژگەڕنیک.ف گردباد

**گێژی ئەسکەندەر**: تەنگژەی زۆر سەخت و ئەستەم، ڕەنگە سێگۆشەی بێرمۆدا بێ. *(کەوتوومە گێژی ئەسکەندەر.)* ف در تنگنا افتادن.

**گیسکە ناودێی**: بریتی لە پیاوی ژنانیلەی کۆڵانگەڕ و تۆڵاز.ف مرد خالەزنک کە در کوچەها پرسە میزند

**گێلم بەرباغ**: گیایەکی بەهارییە بۆ دۆکوڵیو دەبێ. *(بۆ سەیری بووک لە هەرلاوە/ گیا و گوڵ سەری دەرهێناوە/ مێکووک، ڕەکێشە، ئەسپەناغ/ ئاڵقەتیز و گێلم بەرباغ «هەژار».)* ف نام گیاهی است

**گێلەوەژە**: دەردەسەری، گێرە و کێشە. *(ئەو مارزە تووشی گێلەوەژەیەکمان دەکا.)* ف دردسر

**گێلێژە**: گێلەوەژە، ئاژاوە، دەردەسەری.ف

دردسر و گرفتاری

**گیــوا**: ڕووەک، ســەوزە و چیمــەن.ف سـبزه و چمن

**گێوژە ڕیخە**: جۆرێ گێوژی ورد و تام ناخۆش. ف نوعی زالزالک نامرغوب

**گێوژە کۆڵە**: گێوژێک کە دارێکی کورتە بنە و کوڵەی هەیە.ف نوعی زالزالک

**گێوژە مۆرە**: ☜ گێوژوە ڕیخە



**لا بـۆ شـل کـردن:** چاوپۆشـی کـردن و گـوێ پێنەدان بۆئەوەی لە لایەکەوە دەرباز بێ. *(لای بۆ شل کە با هەڵێ.)* ف جا خالی دادن برای کسی که بتواند فرار کند

**لابوو:** شەلەگە، شێلەگە، بەربەستی ئاو بە خۆڵ بۆئەوەی بە لایەکی تردا بڕوا و لە زەوی ئاژین بێ. ف سد خاکی برای انحراف آب جوی

**لابێر کـردن:** هـەڵاواردنـی بـەرخ لـە مـەڕ، جیـا کردنەوەی پەز و بێچوو. ف جدا کردن گوسفند و بره از هم

**لابێر:** کەسێک کە کاتی مەڕدۆشین یارمەتیی بێری دەدا و لای بۆ دەگرێ کە بەرخەل تێکەڵ نەبن، هەروەها مەڕ و بزنێک کە بۆ دۆشین ڕاناوەستێ ملیان دەگرێ هەتا بێری دەیان دۆشێ. ف کسی کە بە دوشندە حیوان کمک می‌کند

**لاپابوون:** لاق وەرگەڕان. ف رگ‌بەرگ شدن پا

**لاپوور:** کەلاکی ڕزیو، لاشەی گەنیو. ف لاشەی گندیده

**لاپێ بوون:** لاقوەرگەڕان. ☜ لاپا بوون

**لاپێ کردن:** لاقوەرگەڕان. ☜ لاپا بوون

**لاپێ:** (+) لێژایی و هەوراز. *(وریابە ڕێگاکە زۆر لاپێ و ناخۆشە بارەکەت لێ نەکەوێ.)* ف راه سخت و شیب‌دار

**لاچیر:** مۆنە، خێسە، مۆڕە. ف چپ‌چپ نگاه کردن

**لاخوزە:** لاقوزە، گرکەی لاقوپاو کە شوێنە قوپاوەکەی نەرم و تاڵە. ف گرمکی کە یک طرفش نرم و تلخ است

**لاراو:** دڗاو، زەوینی نابار و لێژ کە ئاوی پێوە گیر نابێ. ف زمینی کە بەخوبی آبیاری نمی‌شود

**لارەبا:** لابا، خوارەبا، بایەک کە نە شەماڵە و نە زریان. ف باد شرقی یا غربی

**لاژگە:** لاژگ، لاژ، گەمژە، حەپۆل، گەوج، خول، هێڕ. ف ابله

**لاژوار:** کانگەی سروشتی، کان. ف معدن طبیعی

**لاسابانکەرە**: سەرمازەڵە، خەمەگرۆ، بزنمژە.ف آفتاب پرست

**لاسق**: لاسک، لاچک، ساقەتە.ف ساقە

**لاسەمە**: شلێوە، بەفر و باران بارین پێکەوە.ف باران و برفی کە با هم میبارند

**لاڤا**: دۆعا و پاڕانەوە، ژارین.ف نیایش

**لاق تێکەڵ هاتن**: بە گێرەگێڕ بەڕێدا ڕۆیشتن و سەرسم دان.ف سکندری خوردن

**لاقرتێ**: زۆربڵێ: چەقەسرۆ، چەنەوەر، چەنەوێرغە، هەرزەچەنە.ف وراج

**لاقوزە**: ☜ لاخوزە

**لاقوەرگەڕان**: لاپابوون، لاپا کردن.ف رگبەرگ شدن پا

**لاکۆش**: (+) یارمەتی، یاریدە، هاریکاری، *(کەس نایەتە لاکۆشمان.)* ف کمک

**لاکێش**: (+) لبادی پان و گەورە.ف نمد بزرگ

**لالکین**: پاڕانەوە، سکاڵا، لالانەوە.ف لابە کردن

**لالە و مەردەنگی**: شەمدانی بەردەمی بووک و زاوا.ف شمعدان

**لالەخەو**: خەوی زۆر و تا نیوەڕۆ هەڵنەستان. *(من لە بەیانی زووەوە هەستاوم ئەویش خەریکی لالەخەوە.)* ف خواب راحت

**لالەنگی**: نارنگی، خۆشداکەنە.ف نارنگی

**لامالە**: بێستانە گرکەی دێم.ف جالیز گرمک در زمین دیم

**لامەزەب**: (+) بێدین، لە دین لاداو، بێبڕوا.ف لامذهب

**لامەسەب**: ☜ لامەزەب

**لانکە شکاو**: بریتی لە مرۆی شەل و خوار و خێچ.ف کنایە از آدم فلج

**لانکە کردن**: ڕاژان، هەژان بە ئارامی، ڕاتلەکان بە نەرمی. *(گەمیەکە بەسەر شەپۆلی نەرمی ئاوەکەوە لانکەی دەکرد.)* ف جنبیدن یواش

**لانەولان کردن**: ئەمدیوەودیو کردن، تلاندنەوە، گەوزاندن. *(با لانە و لانت کەم/ با شانەوشانت کەم/ شەو لەنێو جێدا/ ڕۆژ لەبەر دێدا. «گۆرانی».)* ف غلطاندن

**لانەوێز**: لانەواز، باڵداری هێلانە گوم کردوو، پەڕەوازە، تەوەلا.ف پرندە آشیان گم کردە

**لانی کوێرە**: کۆنەلان، هێلانەی کۆن. ☜ کۆنەلان

**لانجێنە**: پنە، تەختەیەکە ئەنگوتکە هەویری لەسەر پان دەکەنەوە تەختە تیری.ف تختەای کە نانوا چونەی خمیر را بر روی آن پهن میکند.

**لاوژۆکە**: (+) خڕەکەی نێو زەنگوڵە کە دەلەرێتەوە و زەنگوڵەکە زرەی دێ.ف مغزی درای کە بە لرزش درمیآید و زنگ صدا میدهد

**لاومەت**: هەرزەکار، لاو، گەنج.ف جوان.

**لاوەچ**: خەلیج، کەنداو.ف خلیج

**لپرلپر**: گرنیگرنی، زبر.ف زبر

**لرفاندن**.(+) دەنگی وشتری لۆک، *(لۆکە ڕەش دەستی کرد بە لرفاندن.)* ف صدای شتر نر

**لرفە**: (+) دەنگی وشتر. *(وشترەکە لرفەی دێ.)* ف صدای شتر

**لغـــاوبره**: ) لـــەغـــاوەبركـــێ، لغـــاوەبـــڕێ، بریندراربوونی سووچی دەم؛ ) ناوی باڵندەیەکە، لغاوگورگە.ف ) زخمی شدن گوشەی دهان؛ ) گلاریول بال سیاه

**لغاوگورگـە**: لغـاوبره، باڵـدارێکی بـۆرە بـەقـەد سێرووویەک دەبێ.ف گلاریول بال‌سیاه

**لڤان**: لەغـاو، لغـاو. *(ئـەسپەکـەی لڤـان نـەکرد.)* ف لگام

**لقونته**: چێشت، پێخۆری لەسـەر ئـاگر کوڵاو.ف غذای پخته

**لقونتەچی**: چێشتلێنەر، ئاشپەز.ف آشپز

**لۆبڕ**: پسان و ڕیشاڵ هەڵدانی گوریس و کەندر. *(گوریسەکـە لـۆبڕ بـووە ئـەو بـارە قورسـەی پـێ هەڵناکێشرێ.)* ف طنابی که نیمه پاره شده باشد

**لۆتاڵـە**: جـۆرێ گیـای گـەڵا باریکـە زۆر تاڵـە و ماڵات نایخوا.ف نام گیاهی تلخ

**لۆزەنگەر**: لۆزەندەر، زەبەلاح، تەژە.ف لندهور

**لۆشەکرە**: جۆرێ گیای گەڵا باریکە ماڵات باشی دەخوا.ف نام گیاهی است

**لۆڤەکردن**: هـەوڵـدان، تێکۆشـان، *(ژبـۆ ئـەوکـارە گەلەک لۆڤەکرن.)* ف کوشش کردن

**لۆکەمێشە**: گیایەکە بستێک بەرز دەبێتەوە دوای وەرینی گوڵەکەی شتێکی وەک لۆکە دەر دەکا. ف نام گیاهی است

**لۆلـک**: بـەچکـەی ورچ و بـەراز، بـوودەڵـە، کوودەڵە، بزەڵە.ف بچەی خرس و گراز

**لۆم**: مەڵغە، نیڵ.ف اهرم

**لۆن** (+) ) زەلکاو، گەناو، زۆنگ. ) کەوڵ، پێستە. ف ) باتلاق ) پوست حیوان

**لووپژەن**: هەللاج، پەڕەکەر، هەلاج، کەسێک کە بـە کوتـک و کـەوان لۆکـە و خـوری شـی دەکاتەوە.ف حلاج

**لووت بادان**: بریتی لە ناڕازی بوون. *(لووتی بادا و ڕۆیی.)* ف کنایه از نارازی بودن

**لووت بە لووتدا تـەقین**: ☜ لووت بـە لووتـەوە تەقین

**لووت بە لووتەوە تەقان**: ☜ لووت بـە لووتـەوە تەقین

**لووت بە لووتەوە تەقین**: لەپڕ تووش بوون. *(لە ناکـاو لـووتم بـە لووتییـەوە تـەقـی.)* ف ناگهـان برخورد کردن.

**لووت خووساندن**: بریتی لـە دڵنیا کردن، ڕازی کردن، خاترجەم کردن.ف خاطرجمع کردن

**لـووت ڕاسـان**: خـوێنی لـووت بـەر بـوون، کـەپۆ ڕاسان.ف خون‌دماغ

**لووت ڕق بوون**: خەجاڵەت بوونەوە، شەرمەزار بـوون. *(دوای ڕووداوەکـە هـەرکـە چـاوی پێـی کەوت لووتی ڕەق بوو.)* ف شرمسار شدن

**لـووت هـەڵقرچانـدن**: لـووت بـادان، بریتـی لـە نیـشاندانی تـووڕەیـی *(لـووتێکی هـەڵقرچانـد و ڕۆیی.)* ف با تنفر نگاه کردن

**لـووت هـەڵمـەسـاندن**: پـیش‌خواردنـەوە و ڕق هەستان. *(دوو سێ ڕۆژە لووتی هەڵمەساندووە.)* ف عصبانی و بغض‌کرده

**لووتاوێژ**: (+) کەسێک کە لە خواردنـدا بـە قێز و بێزە، دژخۆراک.ف بدخوراک

**لووڕ**: ژاڵە، کەرکوژ، رووڵک، لووڕک، لویڕ.ف گیاه خر زهره

**لووس**: (+) ژاکاو، سیس، پڕووکاو.ف پژمرده

**لووش کردن**: هەڵلووشین، قووتدان بە ساغی. ف بلعیدن

**لووشە گورگانە**: جۆرێ گیای گەڵاپانە وەک لووشە دەچێ و لاسقی سەوزە وەک لووشە لاسقەکەی سوور نییە و بۆ خواردنیش نابێ.ف نام گیاهی است

**لوێ**: فرۆ، قاخنات، کەرکە.ف آغوز

**لویڕ**: ☜ لووڕ

**لۆیی**: پەردەی درگای چادر، لۆیەکی درگای خێوەت کە هەڵدەدرێتەوە.ف لایەای از درب خیمه که باز و بسته می‌شود

**لە ئاوی شەو پارێز کردن**: بریتی لە پاکی و نەکردنی تاوان و کاری خراپ. *(هێندە مرۆڤێکی پاکە لە ئاوی شەو پارێز دەکا.)* ف کنایه از پرهیز کردن از گناه

**لە باو کەوتن**: ) لە مۆد کەوتن، *(ئەو کراسە ئێتر لە باو کەوتووە.)* ؛ ) پیر بوون و بێتاقەت بوون. *(جاران باوێکی بەس بوو، بەڵام ئێستا لەوەش کەوتووە.)* ف) از مد افتادە؛ ) پیر و بی‌حوصله شده

**لەبلان**: جۆرێک هەڵپەڕینە دەست لەسەر شانی یەکتر دادەنێن و هەڵدەپەڕن.ف نام یک رقص کردی.

**لە بەینی چاڵان و ماڵان**: بریتی لە کەسێک کە هێشتا بۆ لایەک ساغ نەبووبێتەوە، یان کەسێک کە چارەنووسی نادیارە. *(لە بەینی چاڵان و ماڵاندا سەرگەردان ماوەتەوە.)* ف کنایه از بلاتکلیفی

**لە تک و تاس چوونەوە**: بریتی لە بەزین و مات بوون لە شەڕدا، بۆڕ خواردن.ف کنایه از شکست خوردن در جدال

**لە حەرام گەڕان**: خەسار بوون، زایە بوون. *(هیچی بەڵەو نییە هەرکارێ کا لە حەرامی ئەگەڕێ.)* ف ضایع شدن

**لە حەرام گێڕان**: خەسار کردن، زایە کردن. *(دەست بۆ هەر شتێ دەبەم لە حەرامی دەگێڕم.)* ف ضایع کردن

**لە حەوسالان ڕاست بوونەوە**: بریتی لە زۆر چاک خەو لێکەوتن. *(ئبێژی خەوی لێ کەوتبێ؟ ئەرێ لە حەوسالان ڕاست بۆتەوە.)* ف خواب هفت پادشاه را دیدن

**لە دەم تفین**: ) تف لە دەم کردن، بریتی لە فێر کردن و هاندانی کەسێک بۆ قسە یان بۆ کارێک؛ ) دوو کەس کە یەک قسە دەکەن. *(دەڵێی لە دەمی یەک تفیون.)* ف) تحریک کردن کسی برای کاری یا حرفی؛ ) دو نفر که یک حرف می‌زنند

**لە ڕوو چوون**: تەریق بوونەوە، بە شەرمدا کەوتن و دەست لە قسە هەڵگرتن. *(هێندە ڕوو هەڵماڵدراوە بە هیچ شێوەیەک لەڕوو ناچێ.)* ف از رو رفتن

**لە زەرافات کەوتن**: کز و لاواز و بێهێز بوون، ئۆقرە و تاقەت لێبڕان. *(هێندەی خەم خواردووە*

*بەجاریَ لە زەرافات کەوتووە.)* ف زار و نزار و بیقرار شدن

**لە سەر گەڕان:** لە دەور گەڕان، بەقوربان بوون. *(دەک لە سەرت گەڕێم.)* ف قربان و صدقه *(دورت بگردم)*

**لە شەقەی باڵدان:** لەپڕ هەڵفڕین، شەقژنی باڵی هات و هەڵفڕی. *(کەوەکە لە شەقەی باڵی دا و هەڵفڕی.)* ف ناگهان پر کشیدن

**لە قنگ دەرهێنان:** بریتی لە فریو دان و لیَساندنی شتێک. *(تۆ دەتگوت زیرەکم، ئاخری ماڵەکەیان لە قنگ دەرهێنای.)* ف کنایه از فریب دادن و گرفتن چیزی از کسی

**لە کار کردن:** ) مەحتەل کردنی خەڵکی لە کار. *(تۆ خودا برۆ لەوە زیاتر لە کارمان مەکە.)* ؛ ) بەکارهێنانی شت و کەلوپەل. *(دوو پێخوی قورمان لە کار کرد ئەمڕۆ.)* ف ) معطل کردن؛ ) مصرف کردن

**لە کار کەفتن:** ☜ لە کار کەوتن

**لە کار کەوتن:** ) لە کار کەفتن، توانای کار نەمان، *(هێندە ماندوو بووین لە کار کەوتین.)* ؛ ) خراپ بوونی کەرەسە و مەکینەی ماشێن. *(مەکینەکە لە کار کەوت.)* ف ) بیرمق شدن انسان؛ ) از کار افتادن وسیله

**لە کڵ دەرهاتن:** ) بە ساغی هاتنە دەری دیزە و گوزە لە کڵ. *(باش بوو گۆزەکانمان لە کڵ دەرهاتن.)* ؛ ) بریتی لە پوختەبوون و خارانی مرۆڤ، چێشتنی تاڵ و شیرینی ژیان. *(تازە خەمت نەبیَ کوڕەکەت لە کڵ دەرهاتووە.)* ف ) سالم بیرون آمدن کوزه و ظرف سفالی از کوره؛ ) پختەشدن مرد

**لە کەری شەیتان دانەبەزین:** بریتی لە پیَچەقاندن و سوور بوون لەسەر قسەی خۆ. *(برا عەیبە ئیتر لە کەری شەیتان دابەزە بۆ مەبەستت دڵی کەس نییە.)* ف از خر شیطان پیاده شدن

**لە گۆشتا سوور بوون:** بریتی لە زۆر قەڵەو بوون. ف کنایه از چاق شدن

**لە لووتی فیل بەربوونەوە:** بریتی لە پۆز و هەوای زۆر *(هێندە بەپۆزە دەڵێی لە لووتی فیل بەربۆتەوە)* ف کنایه از تکبر زیاد

**لە هەڵڵادان:** ) لەقاودان؛ ) هەرا و گوڕەگوڕ سازکردن. *(پڕ بەو دۆڵە لە هەڵڵای دا و هاواری کردنیَ.)* ف ) افشاکردن راز؛ ) بانگ برآوردن

**لەبرە چوون:** لە کەڵک کەوتن، چەپرەک بوون. *(کەرەسەی کارەکەت بەجاریَ لەبرە چوون.)* ف قرازە شدن وسیلەی کار

**لەبلووک:** جۆلانە، دیلانیَ، هەلۆرک، هێزۆک، دنگلاڤ. ف تاب

**لەبن هێنان:** ) خاشەبڕ کردن، لە ڕەگ و ڕیشەوە دەرهێنان. *(دەستی دا لقی دارەکە و لەبن هێنای.)* ؛ ) ڕووخاندنی حکوومەت و لەناو بردنی. *(خەڵک ڕاپەڕین و حوکوومەتی شایان لەبن هێنا.)* ف ) از بیخ و بن برکشیدن؛ ) سرنگون کردن حکومت

**لەبنەوەبڕ:** کەسێک کە خۆی وەک دۆست نیشان دەدا و بە نهێنی زەبر دەوەشێنیَ.

فەقیرۆکەی ڕق لە زگ. *(ئەوە لە بنەوەبڕێکە وەک مار پێوە دەدا، بەو فەقیرییەی تێ مەکەوە.)* ف ظاهر دوست و باطن دشمن

**لەبنی کوولەکە دان**: دەرخستنی کاکڵی مەبەست و ئاشکرا کردنی کارێک. *(هەتا بۆیان لەبنی کوولەکەکە نەدەی تێناگەن.)* ف فاش کردن

**لەبەر مردن**: بە قوربان بوون. *(جوانە ڕەوت و ڕۆیینت گیانە لەبەر سایەت مرم/ لادە بتبینم لەبەر ئەو بەژن و باڵایەت مرم «حەقیقی».)* ف قربان‌صدقه شدن

**لەبەرچوون**: ) بڕینی ڕێگا *(هۆ کاکی ڕێبوار ڕێم لەبەر ناچێ)* ) ئەنجام دانی کار *(کارەکەمان لەبەر ناچێ)* ف ) پیمودن راه ) پیش‌برد کار

**لەبەریەک چوون**: لێک بڵاوبوون، تەقین و پرژ و بڵاو بوونەوە، *(دۆڵابەکەمان لەدەست کەوتە خوارێ و لەبەریەک چوو.)* ف از هم پاشیدن

**لەپێ دەرچوون**: گوڕرە کردنی هەڵاتن و بە ڕێدا ڕۆیشتن، ملە کردن لە ڕۆیشتندا. *(واهەڵدێ کەس لەپێی دەرناچێ.)* ف به پایش رسیدن

**لەتەر**: (+) تەشی، نەتەرە. ف دوک

**لەتەوچێن**: سواڵکەر، خوازەڵۆک، کەماسا، دەرۆزەکەر. ف گدا

**لەخۆ فشین**: خۆ هەڵتراندن، لەخۆبایی بوون، بافیش لە خۆ کردن. ف غرور و به خود بالیدن

**لەخۆ نووسان**: دەخۆ نووسان، قەوت لەخۆ دان، *(هەرچەندی لەخۆ نووسا قەوەی پێی نەشکا.)* ف کلنجار رفتن

**لەخوم**: هەوسار، لغان، ڕەشمە. ف افسار، لگام، زمام

**لەخووس گرتن**: شتی وشک لە ئاو کردن، لە ئاو نانی شتێک بۆئەوەی بخووسێ. *(خورییە کەمێڵاوییەکانم لەخووس گرتووە.)* ف خیساندن

**لەخووس نان**: ☜ لەخووس گرتن

**لەدین دەرچوون**: بریتی لە تووڕە بوونی زۆر، ڕقهەستان، *(کە چاوی بەو دیمەنە کەوت لە دین دەرچوو.)* ف دهری شدن

**لەرزانەکێش**: دۆشاو، شیلەی میوە. ف مارمالاد

**لەڕکەڵە**: ڕیوەڵە، کز، دالگۆشت مرۆڤی لەڕی وردیلە. ف لاغر

**لەژێر چەکوشی شەیتان دەرپەڕیو**: بریتی لە منداڵی زۆر هار و هاج و بزۆز، *(دەڵێی لەژێر چەکوشی شەیتان دەرپەڕیوە.)* ف کنایە از بچەی بسیار شلوغ

**لەژێڵا هاتن**: لە خوارەوە هاتن بەرەو سەرێ. *(کە لەژێڵا هات زانیم شتێکی بە دەمەوەیە.)* ف از پایین بەطرف بالا آمدن

**لەسەر تەوەر و بستە لابردن**: بریتی لە وەرگێڕان و لابردنی کەسێک لە سەر خوو و خدەی خۆی *(لەوەتا لەگەڵ ئەو کورە دەگەڕێ لە سەر تەوەر و بستەی لابردووە)* ف کنایە از از راه به در کردن کسی

**لەسەر ڕۆیشتن**: (+) لەسەر سەفەر، ڕەوتەنی. ف سفری

**لەعلی قەوز**: پارچەیەکی قەدیمی بوو ژنان دەیانکردە کولۆنجە. ف نام پارچەای قدیمی

**لەقاوەدان**: لە هەڵدان، بڵاو کردنەوەی ڕاز و

نهێنی. *(ناوێری زمانت بگەڕێ خێرا لێت لە قاو دەدا.)* ف افشاکردن راز

**لەقە لە با دان:** لەقە لە ئاسمان دان، بریتی لە زۆر تووڕە بوون. *(وای رق هەستابوو لەقەی لە ـ با ـ دەدا.)* ف کنایە از عصبانی شدن

**لەقە لە ئاسمان دان:** بریتی لە رق هەستانی زۆر، چنگ لە ئاسمان گیر کردن، *(رقی هەستێ لەقە لە ئاسمان دەدا.)* ف کنایە از بسیار عصبانی شدن

**لەقەرەدان:** لەتەرەدان، بن گڵ خستنی بەری بێستان بە برکەکەیەوە بۆئەوەی کەس لێی نەکاتەوە. ف پوشاندن خربزه و هندوانه در جالیز برای اینکه دیده نشود

**لەقەفە:** رکە، تووله، قەفەز. قەڵفەز. ف قفس

**لەگوێی گادا خەوتن:** بریتی لە بێخەبەریی زۆر، *(خەبەری هیچیان نییە هەر دەڵێی لەگوێی گادا خەوتوون.)* ف کنایە از بی‌آگاهی زیاد

**لەگەڵ تڕی بزن بەشەڕ هاتن:** بریتی لە زۆر تووڕە و جینگزی و بە پەڵپ و بیانوو. *(جا ئەوە لەگەڵ تڕی بزن بەشەڕ دێ بۆ ئەوە دەبێ قسەی لەگەڵ بکەی؟)* ف کنایە از آدم عصبانی و بهانەگیر

**لەگەڵ تڕی خۆ بەشەڕ هاتن:** بریتی لە کەسێک کە هەمیشە تووڕەیە و کەس ناوێرێ قسەی لەگەڵ بکا. *(هێندە کەم جیکەڵدانە لەگەڵ تڕی خۆی بەشەڕ دێ.)* ف کنایە از آدم بهانەجو و بی‌حوصله

**لەمپڕ:** ) زگپڕ، ئاوس؛ ) گەنمی کاتی قەفوگوڵ کە هێشتا گوڵەکەی دەر نەهاتووە.ف ) آبستن؛ ) شاخه گندم که هنوز خوشه درنیاورده

**لەمتەز:** تەوەزەل، تەمبەڵ، تەپلۆس، کاهێڵ.ف تنبل

**لەمل کەوتن:** لەکوڵ کەوتن، *(شوکور لە ملمان کەوت خۆ دیقی پێکردین.)* ف نجات یافتن از دست کسی

**لەمە چێتر:** لە ئێمە باشتر، پەری، فریشە. جندۆکە.ف از ما بهتران

**لەنگێزە:** (+) باران بە باوە.ف بارش باران با باد

**لەنیا:** ) پریشکە ئاوی تاڤگە؛ ) کانییەکە لە نزیک شاری قەڵادزێ.ف ) قطرەی آبشار؛ ) چشمەای در نزدیکی شهر قەلادزە

**لەون لێگۆڕان:** خەرەفان، شێت بوون و حاڵ تێکچوون. *(چۆن کاری وا دەکەم خۆ خودا لەونی لێنەگۆڕیوم.)* ف عقل از دست دادن

**لەون لێگۆڕاو:** خەرەفاو، سەفی بوو. *(لێیگەڕێ ئەوە تازە لەونی لێگۆڕاوە.)* ف عقل از دست داده

**لەونج:** مێرگ، چێنک، شوێنی سەوز و چیمەن لە جێگای زۆنگ.ف چمن

**لەوەنتە:** عەتر، گوڵاو.ف گلاب، عطر

**لێبان:** لیمان، ئاوێکی زەرد و لینچقە بە لەشی بێچووی تازە زاوەوە.ف مایع لزجی کە روی بدن بچە تازە متولد شدە است

**لێڕاکێشان:** پاتاڵێک کە لە کاتی زاندا لێنابێتەوە و دەست دەکەن بە زێیدا و بەچکەکەی دەردێنن. *(مانگەکە لێنابێتەوە دەبێ*

*لێی ڕاکێشن.)* ف با دست بیرون آوردن بچه حیوان هنگام زایش

**لیـــروو:** لیــک، ئــاوی دەم. ف آب دهــان کــه ناخودآگاه بیرون می‌ریزد

**لیرووی:** لیکن، کەسێک کە هەمیشە لیک بە دەمیدا دێتە خوارێ. ف کسی کە همیشە آب دهانش می‌ریزد

**لێژاو:** ئاوێ کە لە لێژی دێتە خوارێ، تاڤگە. ف آبشار

**لیژە:** لەسەریەک هەڵچندراوی ڕێک و پێک. بۆ خشت و تەپاڵە بەکار دێ. *(خشتەکان وشک بوونەوە لە لیژەیان دە.)* ف فنر

**لیڤار:** کەنار، قەراغ، لێوار. ف کنار رودخانه

**لیڤەت:** بەرتیل، سمێڵچەورانە. ف رشوه

**لێک ڕەبادان:** نقورچک لە یەک گرتن، *(وا وەرە جوانێ بەرەو من سەردەمێ/ لێک ڕەبا دەین خەم بەبا دەین دەم دەمێ. «ڕاوچی».)* ف نیشگون گرفتن از هم

**لێکاڵانەوە:** لێهاتن، پێکەوتن. *(ئەو بەرگە تازانەی زۆر لێدەکاڵێتەوە، کار جوانی هەر لەخۆی دەکاڵایەوە.)* ف لیاقت

**لێکدان:** (+) زەرب کردن. ف ضرب کردن

**لێڵ بوون:** ڕەنگ تێکچوون لەبەر تووڕەیی، قەڵس بوون. *(هێندە کوڕی چاکە سەد قسەی پێ بڵێی لێڵ نابێ.)* شلوێ بوون. ف عصبانی شدن

**لیمەران:** لیمەڵان، شوێنێک کە ڕمل و لیم دایگرتبێ. قەراغ چۆم کە لمی لێیە. ف ماسەزار

**لیمەڵان:** ☜ لیمەران

**لێنیشکە:** خلیسکێن، خشخشۆکێ. قوونەخلیسکێ. ف سرسرەبازی

**لێوپەڕین:** لەرینەوەی بێئیختیاری لێو. *(ماوەیەکە لێوم دەپەڕێ بڵێی کێ ماچ بکەم.)* ف لرزش ناخودآگاه لب

**لیوی:** فرۆ، خۆراکێکە وەک ماست لە ژەک دروست دەکرێ. ف آغوز



**مابەقی**: پاشماوە. *(مابەقیی پارەکەم بۆ بردەوە.)* ف باقیمانده

**ماتگـە**: لقـی ناسـکی دار، وەچ، سـەرتـوول. ف شاخەی نازک درخت

**ماتماتیـک**: بیرکـاری، ریـازی و حیـساب. ف ریاضی

**ماتۆڵکە**: مەلۆتکە. ف قنداق کردن بچه

**ماچۆ**: لقێکە لە بنزاراوەی گۆران. ف شاخەای از لهجەی گوران

**مار برژێن**: بریتی لە ژنی بێحەیا، ژنی دەمشڕ و جنێوفرۆش. ف زن مکار و حیلەباز و بددهن

**مـار پـێگیـران**: بریتـی لـە قسەبڕکـردن لـەلای کەسێک و رازی کردنی. *(ماری ئەو بێڕەزایە بە کێ دەگیرێ؟)* ف کنایە از رفتن حرف پیش کسی

**مـارجێوە**: مـەیـدانی خـشتپێـژان. ف میـدان خشتزنی

**مارگـە**: جـۆرێ کـاموای باریکـە بـۆ گوڵـدۆزی دەبێ. ف نوعی کاموای باریک برای گلدوزی

**مـارمردگ**: بریتـی لـە مرۆڤـی فـەقیرۆکـەی لەبنەوەبڕ. ف کنایە از آدم بە ظاهر مظلوم و در باطن بیرحم

**مـارمژ**: ) بریتـی لـە مـرۆی کـز و داڵگۆشـت؛ ) بریتی لە ژنی بێحەیا و دەمشڕ، *(ئەو مارمژە دەمی هەڵماڵی دەمانخوا.)* ف ) کنایە از آدم لاغر؛ ) کنایە از زن بیشرم

**مارمژیو**: بریتی لە مرۆڤی کز و لاواز، مارمژ. ف کنایە از آدم ضعیف و لاغر

**مارۆ**: (+) ناوی پارچەیەکی قەدیمی بوو ژنان دەیانکردە کراس. ف نام پارچەای قدیمی زنانە

**مارودوو**: (+) ڕۆیشتن بەشێوەی پێچەڵاوپووچ. *(مارودوو بە شاخەکەدا هەڵگەڕان.)* ف رفتن بە تریقە زیگزاگ

**مارووکە**: مارۆ، پارچەیەکی قەدیمی ژنانەبوو. ف نام پارچەای قدیمی زنانە

**مارەزیلە**: مارەزیو، هەزارپێ، زیلۆو.ف هەزارپا
**مارەقان**: هەلاڵە، گەردەی گوڵ.ف گرد گل
**ماری زەنگی**: ڕەشمار، ماری ڕەش.ف مار سیاه
**ماری کتکی**: جۆرێ ماری بڤە و ژەهراوییە.ف نام یک مار سمی خطرناک
**ماریجە**: مالیجە، چارەسەر کردنی نەخۆشی، دەرمان کردنی برین و نەخۆشی. *(دەردێکی گرتووە بە هیچ حەکێمی ماریجەی نایە.)* ف معالجە
**ماریلە**: (+) ئاوی کەمی چۆم و شیو و کانی *(ئاوی کانییەکە وا کەم بۆتەوە بەحاڵ ماریلە دەکا.)* ف آب اندک رود و چشمە
**مارپێواس**: جۆرێ ڕێواسە وەک ڕێواسی بنبەردی لاسقەکەی پان و سپی و ئاودارە. پێنج جۆر ڕێواس هەیە، باسکلاو، نێرتکە ڕێواس، ڕێواسی بنبەرد، لەقلەقە، مارپێواس.ف نوعی ریواس
**ماز**: (+) سەری کێو، لووتکە، دوند، گاز، ترۆپک. ف قلە، ستیغ کوە
**ماز**: ) بەرانی چوار ساڵە؛ ) زنجیرەکێو.ف ) قوچ چهار سالە؛ ) رشتەکوە
**مازوو**: (+) پشکیل، ئەوشتە خرەی گۆرەبیبازیی پێدەکەن.ف تیلەای کە با آن جوراببازی می‌کنند
**مازووت**: شاپلێتە، مەشغەڵ.ف مشعل
**مازەرا**: ماجەرا، بەسەرهات، ڕووداو.ف ماجرا.
**ماژە**: دەموچاو، ئەدگار، سیما، روخسار، دیم. ف چهرە
**ماست و دۆشاو**: جۆرێک مووررووی دوو ڕەنگە بۆ تەزبێح وەک ماست و دۆشاوی تێکەڵ کراو وایە.ف نوعی مهرە برای تسبیح
**ماستاوی کولکن**: بریتی لە ماستاوی خەست و خۆڵ.ف کنایە از ماست و آب غلیظ
**ماسڵە**: گریس، چەورییەکە بۆ ئاسنەواڵەی ماشێن و دەرگا و ... کەڵکی لێ وەردەگرن.ف گریس
**ماسمێژ**: سیس، ماسمێش، جۆرە مێشێکە لە مێشەنگوین دەچێ.ف نوعی مگس شبیە زنبورعسل
**ماسمێش**: ☜ ماسمێژ
**ماسوولکەژێ**: گۆشتە ڕەگ، ڕەگی گەورەی لەش. ف رگ گوشتی
**ماسییە خەشە**: خەشە ماسی، ماسییە خاتوون، جۆرێک ماسیی پنۆک پنۆکە. ف نوعی ماهی
**ماسییە ڕەشە**: ڕەشە ماسی، جۆرێک ماسیی ڕەشە بە قولاپ ناگیرێ و دەچێتە بن گۆمانەوە. ف نوعی ماهی سیاە رنگ
**ماشک**: (+) چێشتەقولێ، چێشتی منداڵان لە کایەدا.ف توشەی کودکان
**ماشیو**: شیوی چکۆڵە، جۆگەی گەورە.ف جوی بزرگ
**ماق**: (+) واق، سەرسووڕمان.ف متحیر
**ماق بردنەوە**: واق وڕمان، سەرسووڕمان، سەرسام بوون.ف متحیر شدن
**ماق مان**: واق وڕمان، واق بردنەوە.ف متحیر ماندن

**ماکەرتاش:** تاشینی مووی سەر و ڕیش بە تەواوی. تیف تیفەدان. *(ڕیشەکەت وا ماکەرتاش کردووە کێچ بوکسەوادی لێدەکا.)* ف تراشیدن ریش به خوبی

**ماگە:** (+) ڕفێدە، دۆشەکچەیەکە نانی پێ بە تەندوورەوە دەدەن. ف بالشتک نانوایی

**ماڵ:** گاسنێک کە ڕاست دەکرێتەوە و زۆر ناچەقێ. *(گاسنەکەی وا ماڵ کردووە بەحاڵ عەرزەکە دەڕووشێنێ.)* ف میزان کردن گاوآهن برای اینکه زیاد در زمین فرو نرود

**مالار:** خێزانی ماڵ. *(مالارمان لە خەنگ برپاگە.)* یانی خێزانمان له ماڵدا نەماوە. ف افراد خانواده

**ماڵبەند:** (+) تەختایی زین، *(لەسەر ماڵبەندی زینەکە قیت دانیشتبوو)* ف تخت زین

**ماڵخاڵوو:** خاڵخاڵۆکە، جۆرێ قالونچەی چکۆلە و سوور و خرە خاڵی ڕەشی پێوەیە. ف كفشدوزک

**ماڵنوستنان:** کاتی خەوتنی خەڵکی دێ و کووژانەوەی چراکانیان. *(کە دێمە سەر لووتکەی دەنگت، کە هەر دوو پێم دەچەسپێنم لەسەر زنارێکی ئەوێ/ نە ڕەشەبا دەمبزوێنێ، نە کرێوە و تۆفی شەوێ/ ماڵنوستنان هەر دوو باڵم دەکەمەوە؛ لە چوارلاوە زام بانگ دەکەم، بێ بسرەوێ. «عەبدوولّلا پەشێو».)* ف *هنگام خوابيدن مردم درشب.*

**ماڵەزا:** خوشکەزا، خوارزا، منالی خوشک. ف خواهرزاده

**ماڵەکینە:** چوارگۆشە، چوارخانە. ف مربع

**ماڵی کردن:** حەیوانی کێوی گرتن و لە ماڵدا پەروەردە کردن، کەوی کردنی جانەوەری وەحشی، ڕام کردن. ف رام کردن حيوان وحشى

**مالیجە:** ☜ ماریجە

**مام جێژنۆکە:** گیایەکی گوڵ سپییە لەنێو نۆک و شێوەرددا شین دەبێ. ف نام گیاهی است

**مام شەبەقە:** دوورینی دوو تەختە بەرماڵ و جاجم بە یەکەوە. ف دوختن دو تخته سجاده يا جاجم به هم

**مامراوی:** مراویی مێوە، مێوە مراوی. ف مرغابی ماده

**مامەچە:** مامان، قابیلە. ف قابله، ماما

**مانگادۆش:** ) سەتڵ، پەقرەج؛ ) کەسێک کە مانگا دەدۆشێ. ف ) سطل؛ ) کسی کە گاو مادە می‌دوشد

**ماهی:** شقرەی فیل و بەراز. ف عاج

**مایە:** (+) وشتری مێو، مێوە وشتر. ف شتر ماده

**متاوێزە:** ویتامین، ڤیتامین. ف ويتامين

**متوملوو:** ملومۆ، گەڕان و بۆن کردنی سەگ بۆ پەیدا کردن. ف گشتن و بو کردن سگ برای پیدا کردن چیزی

**متەرێز:** مەتەرێز، سەنگەر، خەڵ، مەتەرێس. ف سنگر

**متەق:** بێدەنگ. *(هەرچی قسەم لەگەڵ کرد متەقی نەکرد.)* ف ساکت

**مچرگات:** چەتوون، سەخت. ف دشوار

**محەندەک:** محەننەک، ئەسپی رەسەن. *(خەڵکی بە تالانی دەچێتەوە مەڕە، ماڵە، محەندەکە/ من بە*

*تالانم دەچێتەوە دوو چاوی دەبەڵەکە«حەیران».)* ف اسب اصیل

**مخت:** عەقڵ، ئاوەز، شعوور. ف عقل

**مختدار:** ئەقڵدار، بە ئاوەز، خاوەن شعوور. ف عاقل

**مخول:** مەغەل، پەرچە، مۆڵگەی مەڕ لە سەحرا. ف محل استراحت احشام در صحرا

**مدریک:** زیرەک، وریا، وشیار. ف زرنگ

**مدورماس:** بەچکە ئاسکی چالاک و ئازا، کارمامزی توند و تیژ. ف بچه آهوی تیزپا

**مراوییە رەشە:** جۆرێ مراویی کێوییە سەرپشتی رەشە و بنسکی سپییە. ف اردک چشم طلایی

**مراوییە سپیلکە:** جۆرێ مراویی کێوییە، بۆرە و خاڵخاڵی سپیی پێوەیە. ف اردک مرمری

**مرتە:** ورتە، سرتە، قسە کردن لە بنەوە. *(لە بنەوە هەر مرتەی دێ.)* ف پچ‌پچ

**مرخ:** (+) توانایی ئەنجام دانی کارێک یان هونەرێک، ئیستعداد، لێهاتوویی. ف استعداد

**مردەرێ:** میرات، شتی لەپاش مردوو بەجێماو. ف میراث

**مرق:** (+) جەغەتاو، چەورایی سەر گۆشتاو. ف چربی روی آبگوشت

**مرقاندن:** دەنگی بەران کاتی جووت بوون لەگەڵ مەڕ. (*بەرانەکە دەمرقێنێ*) ف صدای قوچ هنگام جفتگیری

**مرقەمرق:** دەنگی پەیتا پەیتای بەران کاتی جووتبوون لەگەڵ مەڕ.*(بەرانەکە بەمرقەمرق ڕۆیی بۆنێو مەڕەکان.)* ف صدای قوچ هنگام جفتگیری

**مرۆژیانە:** میرووله کردنی لەش. *(ئازای ئەنناممرۆژیانەی دەکرد)* ف مورمور کردن پوست بدن

**مروو:** (+) مۆریانە، مۆریە، مۆرکە، خۆرکەی لیباس و پارچە و ... ف موریانه

**مڕوو:** ئیشتیا، مگیز، تاسە. *(مڕووم بۆ هیچ خۆراکێک ناچێ.)* ف اشتها

**مرووسین:** هەڵمژین، هەڵلووشین. ف بلعیدن

**مڕووشکان:** تاسەشکان. *(با مڕووی بشکێ دەم و لێو و گەرووم/ شاعیرێکی هەردی کوردی بێدەرووم. «ڕاوچی».)* ف *سیر شدن و اشتها نداشتن.*

**مڕووشکێن:** ئیشتیا لابەر، نەوس کوێرکەرەوە، تاسەشکێن. *(بابۆڵەیەکی چەور و مڕووشکێنی پێدام.)* ف اشتهازدا

**مڕووهێن:** ئیشتیا بزوێن، شتێک کە ئیشتیا دەکاتەوە. ف اشتهاآور

**مرۆیانی:** پیاوەتی، چاکەکاری، کاری چاک و مرۆڤ دۆستانە. ف مردانگی

**مرەکەرە:** بەدبەدە، کەڕەواڵە، هەوێردە. ف بلدرچین

**مریکار:** ئارەزوومەند، تاسەبار، تاسەمەند، تامەزرۆ. ف آرزومند

**مزاییک:** خشتی تەنک و چوارگۆشەی دروست کراو بە چیمەنتۆ و خیز کە ڕووکارەکەی بە دەزگا لووس دەکەن. ف مزاییک

**مزگانا:** مزگانی، مزگێنی، شیرینی هەواڵی خۆش.ف مژدگانی

**مزووک:** (+) نەزۆک، ئەستێور، قسر.ف سترون

**مزیانی:** مزگێنی. مزگانی.ف مژده

**مزیج:** ئیشتیا، مگێز، بێزوو، مژدی، مەگیرانی.ف ویار

**مژدی:** مەگیرانی، بێزوو، مگێز.ف ویار

**مژمۆر:** چاو چکۆلە و پرووش، پرووشەچاو، خووتەکە.ف چشم کوچولو

**مژیلانک:** برژۆڵ، بژانگ، برژانگ، مژۆڵ.ف مژه

**مسۆده:** بەلا، ئاپۆر، مسیبەت.ف بلا و مصیبت

**مسۆگەر:** جێ کەوتن، جێ گیر بوون، دامەزران. ف جا افتاده

**مسەبا:** سەبر، مۆڵەت، *(مسەبایەکم لێبگره جارێ کارم زۆره.)* ف صبر

**مشاراو:** ئاودانی رەز لە خاکەلێوە و بانەمەڕدا. ف آب دادن تاکستان در فروردین و اردیبهشت

**مشکیدان:** تەپۆڵکی زبڵ و زاڵ و خۆڵەمێش لێرشتن، زباڵەدان.ف محل ریختن زبل و خاکستر

**مشوار:** خۆراگر، بەرگەگر، پایەدار.ف مقاوم

**مفاڵ:** سەرلێشێواو، سەرگەردان، چەواشە.ف سردرگم

**مفوو:** چلمن، بلقن.ف خلمو

**مقەلک:** ئاغڵەویک، تاوەی چکۆڵە.ف یغلبی

**مکوڵ:** کەمین، بۆسە، ڕەبەت.ف کمین

**مکوڵ گرتن:** بۆسە نانەوە، کەمین دانان.ف کمین کردن

**مکووم:** قایم، لە شکان نەهاتوو.ف مقاوم

**مگۆرت:** یاخی، سەرەڕۆ.ف یاخی

**مل خووس کردن:** مل دانەواندنی بەراز و کەڵ و گا بۆ شەڕ، زیاتر بۆ بەراز دەگوترێ کە ملی دادەنوێنێ و هێرش دەبا.ف آماده شدن گراز برای حمله

**مل لەبەر مل نان:** ئاوقا بوون و بەشەڕ هاتن، ئانگژا بوون، بەگژدا چوون.ف گلاویز شدن

**ملاژگ:** ☜ ملاژی

**ملاژی:** مەلاشوو، ملاشک، مەلاژگ، میچی زار. ف سقف دهان

**ملاسکەملاسک:** ملۆمۆ، بۆ سەگ دەگوترێ. *(سەگەکە بۆنی گۆشتی کردبوو بۆیە ملاسکە ملاسک وەدوامان کەوتبوو.)* ف گشتن و بو کردن سگ

**ملاکۆکە:** کەوچکی چکۆڵە.ف قاشق کوچک.

**ملبادان:** سەربادان، سەرپێچی کردن، جواب نەدانە. *(هەر کارێکی پێدەسپێری مل بادەدا.)* ف سرپیچی کردن

**ملبەند:** ملوەن، ملوانکە، گەردانە، ملوینک.ف گردنبند

**ملخێش ملخێش:** مرخێش مرخێش، هەناسە سواربوون بەهۆی ڕاکێشانی شتێکی قورسەوە. *(ملخێش ملخێش لەولاوە هێنای.)* ف کشان کشان

**ملدەس:** بازنە، خرخاڵ، بازنگ، دەستەوانە.ف النگو

**ملدەسی:** ) کەلەبچە، کەلەمچە، دەستەبەندی دیل؛ ) بازنەی ژنان.ف) دستبند اسیر؛ ) النگو

**ملزەم**: مەرزم، پێمل، ڕازی. *(بە هیچ کەس ملزم نابێ.)* ف راضی

**ملق**: گوڕم، سەر بزواندنی بەرخ کاتێک دایکی دەمژێ. ف سر تکان دادن بره هنگام مکیدن پستان گوسفند

**ملکە**: مل، گەردن، ئەستۆ. ف گردن

**ملۆزم**: (+) مێمڵ، مزاحیم، زاول. ف مزاحم

**ملۆش**: خەریک، سەرگەرم، *(بەکارەوە خۆی ملۆش کردبوو.)* ف مشغول

**ملووم**: شلەتین، شیلەوگەرک، ئاوی نەسارد و نەگەرم. ف آب ولرم

**ملەما لێ بڕین**: کون بڕ کردن، ملەما لێ چنین. ف بریدن منفذ

**ملەما لێ چنین**: ☜ ملەما لێ بڕین

**ملهوڕ**: (+) جۆرێ باڵندەی ڕاوکەرە لەشی باریکە و سەر و ملی ئەستوورە. ف اسکوتر سفید بال

**ملێس**: هێدی، لەسەرەخۆ، ئارام. ف آرام

**منجڕ**: بریتی لە کەسێک کە پێوەت دەنووسێ و لەکوڵ نابێتەوە؛ ) لەوجڕ، زۆروەڕ، چەنەباز، چەنەوەر.) بریتی لە پشیلەی زیانی خورۆ ف ) سمج؛ ) وراج ) گربەای کە بە خوراکی خانە دستبرد میزند.

**منداره مانگ**: مانگی نەخۆش کەوتنی پەز و منداره‌وه بوونیان. ف ماهی کە گوسفندان مریض میشوند و میمیرند

**موانەت**: فرسەت، مۆڵەت، مەودا، *(هێندەی خەڵک ئازار دا بۆیە خودا موانەتی نەدا و کوژرا.)* ف مهلت

**مۆخچنین**: مۆخکێشان، ئازاردان و تووشی چەرمەسەرێ کردن. *(بەکرە شۆڤارە ئەوەی مۆخی چنیم/ زیی مەم و زینان ولاتی لێتەنیم. «هێمن».)* ف کنایه از اذیت و ئازار زیاد

**مۆخەچنین**: ☜ مۆخچنین

**مۆدۆلی**: جۆرێک چەکی قەدیمی بوو. ف نوعی تفنگ قدیمی

**موروو‌ژیان**: مێلوورە کردن، پەڕە مریشکە بوونی لەش لەبەر سەرما و ترس. ف مورمور کردن پوست بدن

**مۆریانە**: مۆرانە، مۆریە، خۆرکە، مۆرکە، خۆرە، مروو. ف موریانه

**مۆری زەواد نەکردن**: دەم بۆ نان و ئاو نەبردن، هیچ نەخواردن، *(باوەڕکە مۆری زەوادم نەکردووە.)* ف لب به غذا نزدن

**مۆریە**: ☜ مۆریانە.

**مۆزرگان**: مۆزەلان، مۆڵ، مۆڵگەی گاڕان لە سەحرا. ف محل استراحت احشام در صحرا

**مۆزگرە**: جۆرێ پووشبەقنگەی بۆر و کلک قوڵە و تیژە کاتێک پەیدا دەبێ دەست دەکا بە مۆز گرتن و سەریان هەڵدەکەنێ ف نوعی سنجاقک که ضد حشرەی کونکاون است

**مۆڤر**: هێمن، هێدی، لەسەرەخۆ، ئارام. ف آرام

**موقوربـاز**: جادووباز، مەکرباز. *(پیرێژنێکی موقوربازە کەس دەرەقەتی نایە.)* ف مکار، جادوگر

**مۆکڵ**: ئاڵ، جنۆکەی ژنی زەیستانکوژ، هاڵە. ف

جن زائوکش

**مۆڵگـه:** (+) شـوێنی حـەسـانەوە و نیـشتەجـێ بوونی قوشوون.ف پایگاه نظامی

**مۆڵین:** مـۆڵ خـواردن، خـەوتـن و حـەوانـەوەی گـاران لـە جـێ مـۆڵ. *(گاڕانـەکـە نیوسـەعاتـە مۆڵیون.)* ف خوابیدن احشام در جای مخصوص خود در صحرا

**مۆنج داگرتن:** تۆران، زیز بوون، زویر بوون، مووش کردن ف رنجیدن

**مونـدا:** ) مونـدی، پـشتێن، پـشتوێند؛ ) شـاڵ، پارچـەی شـاڵی.ف ) شـال کمـر؛ ) پارچـەی مخصوص شال

**موو بە بەیندا نەچوون:** بریتی لە زۆر دۆست، هاوەڵی گیانی گیانی. *(هێندە نێوانیان خۆشە موو بە بەینیاندا ناچێ.)* ف دوست جانی

**مـوو لـە ماسـت دەرکێـشان:** ماسـت و مـوو بـژاردن، بریتـی لـە وردبینـی و بـە ئـەزمـوونیی زۆر. *(هێندە وردبینە موو لە ماست دەردەکێشێ.)* ف کنایه از شخص موشکاف و باتجربه

**موو لێنەدان:** لە یەک چوون بەبێ جیاوازی. *(هیـوا هێنـدە لـە ئـاڕام دەچـێ، مـوو لـێنـادەن.)* ف کنایه از شباهت زیاد

**مـوورووە چۆلـەکـە:** بـەری گیایـەکـە باریـک و لوولـەیـی ژنـان خـشڵی پـێ دەگرنـەوە و وەک ملوانکە لە ملی دەکەن.ف ثمر گیاهی است برای گردنبند استفاده می‌شود

**مـوورووە دەنگیلـە:** مـووروویـەکی خـەیاڵییە لـە هەقایەتی "سووری عەیاردار" قسە دەکا.ف نام مهره‌ای افسانه‌ای که حرف می‌زند

**مـــوورووە قاچـــاخی:** جۆرێــک مـــوورووی سێگۆشەیە ملوانکەی پێ دەهۆننەوە.ف نوعی مهره‌ی زینتی

**مووروووە شیلان:** جۆرێک مووروووە سوورەیە وەک دەنکــە شــیلان دەچــێ ملوانکــەی پــێ دەهۆننەوە.ف نوعی مهره‌ی زینتی

**موورە:** (+) سێسوو، بربەند.ف سوهان

**مـووش کـردن:** مـان کـردن، پـیش‌خواردنـەوە.ف خودخوری کردن

**مووشـەسـی:** شـەمـشەمـەکـوێرە، چـەکچـەکـی، پارچک، چەکچەکیلە.ف خفاش

**مووشـەک:** چـەکـی گـەورەی وڵات کـاولکـەر. *(ڕۆژێ کەرێکیان بار کرد لە تفەنگ/ چووە نێو کـەران بـۆ گاڵتـە و جـەفـەنگ/ پێکـەنـی وتـی مـن بێخـەبـەرم/ مووشـەکیشم بێ هێشتا هـەر کـەرم «خالید راعی».)* ف موشک

**مووقـەڵـێش:** وردبـین، سـەرنجـی زۆر ورد.ف موشکاف

**مـووک:** فرمێسکی بـە درۆ. *(هـاتووە مـووکم بۆ هەڵدەرێژێ پێیوایە باوەڕی پێدەکەم.)* ف اشک دروغین

**موولە:** (+) یەستری چکۆڵە و چەمووش.ف قاطر جثه کوچک و چموش

**موومی:** مەیموون.ف میمون

**مووینە:** گیا مووینە، گیایەکی ورد و تووکتە، پتر لـەنێو وینجـە و مێرگـان شـین دەبێ.ف نام گیاهی است

**مەتەلگ**: پارەیەکی زۆر ناچیز، پووڵێکی کەم.ف مقدار پول کم و بی ارزش.

**مەحموود ئاغایی**: جۆرێ ترێی دەنک گەورەیە. ف نوعی انگور درشت

**مەخس کردن**: مووش کردن، پیش‌خواردنەوە، ڕق هەستان لەبەرخۆوە، مان کردن. *(چەندجار چووم لەدووی مەخسی کردووە و لەگەڵم نایە.)* ف رنجیده و در خود فرورفته

**مەخشی**: مەشی، مێش، مەشە. ف مگس

**مەخلگە**: ئاغەڵ، هۆڵ، تەویلەی مەڕ. ف آغل

**مەدەلایی**: ڕیایی، مەرایی، تەشی‌ڕێسی. ف تزویر

**مەربووکی**: ناوی تیرەیەکە لە هۆزی مامەش. ف نام طایفه‌ای در ایل مامش

**مەرحەمۆک**: جۆرێ خشڵی ژنانەیە. ف نوعی زیورآلات زنانه

**مەرخ**: (+) مێرگ، چیمەن و سەوزەلانی، چێنک. ف مرغزار

**مەڕدۆش**: ) پەقرەج، سەتڵ؛ ) بێری، بێریڤان، کەسێک کە مەڕ دەدۆشێ. ف ) سطل؛ ) کسی که گوسفند می‌دوشد

**مەرزەم**: ملزەم. *(بە هەزار کێشە مەرزەممان کرد بمێنێتەوە.)* ف راضی

**مەرگە مەلە**: لە ئاو کەوتن و چوونە ژێر ئاو و هاتنەوە سەر ئاو و لەهێز کەوتن، وەپەلەقاژێ کەوتن لەنێو ئاودا. ف دست و پا زدن در آب و نزدیک به خفه شدن

**مەرگەسەری**: چەرمەسەری، دەردەسەری، کوێرەوەری. ف دردسر زیاد

**مەرن**: ) مەرخ، مێرگ، چێنک؛ ) زەلکاو، زۆنگ، باتلاخ، زەلاو. ف ) مرغزار؛ ) باتلاق

**مەرەبەکری**: ناوی تیرەیەکە لە هۆزی مامەش. ف نام طایفه‌ای در ایل مامش

**مەرەبێرە**: دانەبێرە، هێنانەوەی مەڕ کاتی نیوەڕۆ بۆ دۆشین. ف آوردن گله هنگام ظهر برای دوشیدن

**مەڕەخێڤە**: نۆبەرە، نخری، هەوەڵبەر. ف نوبر

**مەزاد**: هەراج، هەرزان فرۆش کردنی کاڵا. *(مەزاد مەزاد، هەرچیم هەیە هەمووی مەزاد/ بە پارچەیە پەڕۆی سادە/ هەڵبکرێت و بشنێتەوە/ لەسەر بستێک زەویی ئازاد «عەبدوڵڵا پەشێو».)* ف حراج

**مەزارگە**: گۆڕستان، قەبران. ف گورستان

**مەژگورە**: مۆغەرە، بڕبڕە، بڕبڕاگە. ف ستون‌فقرات

**مەستاو**: پاراو، تێراو، *(زەوییەکە مەستاو بووە.)* ف سیراب

**مەستی**: (+) جۆرێک پێڵاوی پیاوان. ف نوعی کفش مردانه.

**مەسرەت**: مەسلەت، ئاشتبوونەوەی دژمنی خوێنی و ناموسی. ف آشتی

**مەسوولە**: ئامرازێکی مەکینەی خەیاتییە دەزووی بنەوەی لەسەر هەڵدەکرێتەوە و دەچێتە نێو مەکووکەوە. ف ماسوره

**مەسیە**: مەسێ، ئەستوێلک، ئەستێولک. ف میله‌ای که روی آتش می‌نهند

**مەشتاخ**: هەڵخستنی توتن لەبەر خۆرەتاو. ف

پهن کردن توتون زیر آفتاب.

**مەعبەین:** مابەین، نێوان، مەودا.ف میان

**مەکار:** بەیار، زەویی نەکێڵدراو.ف زمین بایر

**مەکاڵ:** بەیار، زەویی نەکڵێدراو، زەوییەک کە نایکێڵن بۆئەوەی بحەسێتەوە بۆ ساڵی داهاتوو. ف زمینی کە یک سال کشت نمی‌شود تا استراحت کند برای سال بعد، بایر.

**مەکۆر:** جێگەی خۆ لێ مەڵاسدان، بۆسە، ڕەبەت.ف کمین

**مەکووک:** (+) ئامرازێکی مەکینەی خەیاتییە مەسووڵە لەنێویدا دەگەڕێ، قابلەمە.ف ماکوک

**مەگرپێچەنی:** مقەس، دوارد، دوێردک، مقەست. ف قیچی

**مەلاژگ:** بەزەیی، ڕەحم.ف ترحم

**مەڵحەکە:** ڕشقن، کەسێک کە دەبێتە گاڵتەجاڕی دەستی خەڵک.ف مضحکە

**مەڵلایەتی:** ئەو کەسەی لەسەرو هەموانەوەیە. ف اولویت

**مەڵۆشێوێن:** ) گیایەکە لەنێو گەنمدا ناهێڵێ سواڵە و مەڵۆ پێکەوە بنووسێ؛ ) بریتی لە کارتێکدەر، گێرەشێوێن.ف ) نام گیاهی است؛ ) کنایە از فضول و دوبەهم بەزن

**مەلەزکەتان:** ناوی جۆرە کراسێکی ژنانەیە.ف نام نوعی پیراهن زنانە

**مەلەسە:** گوێنەبیس، ناحاڵی، خێشەسەر.ف خیرەسر

**مەڵەغانگێر:** کەسێک کە بە مەڵەغان گیا و وێنجە و ... دەدووڕێ.ف دروگر با داس بزرگ

**مەلەگە:** جێی مەلە کردن، حەوزی مەلە کردن. ف استخر شنا

**مەلیلە:** جۆرێک زەنگیانەی درێژۆکەیە ژنان ئۆییەی پێ دەگرنەوە بۆ قەراغی دەسماڵ.ف نوعی منجوق

**مەماڵ:** شیردار، ئەو گیاندارانەی مەمکیان هەیە و شیر دەدەن بە بێچووەکانیان.ف پستانداران

**مەمکە کیژە:** گوڵێکی سپی بێگەڵایە و کورتەباڵا پایزان دەڕوێ.ف نسترن پاییزی

**مەنتۆ:** ناوی پارچەیەکی قەدیمی ژنانە بوو بۆ کراس. *(ناپلۆنە گیان ناپلۆنە، ناپلۆن نییە و مەنتۆیە/ خەڵک مەستی شەرابە، ئەو دڵەی من مەستی تۆیە «گۆرانی».)* ف پارچەای قدیمی برای پیراهن زنانە

**مەنجەڵکسێ:** یارییەکی منداڵانەیە چەند کەس دەستی یەکتر دەگرن و جەغزێک دروست دەکەن و هەڵدەسووڕێن.ف نام یک بازی کودکانە

**مەند:** (+) کاریتە، ڕاژە، خەسارە.ف تیرک چوبی بزرگ

**مەنقەڕ:** بنکە، جێی سەرباز.ف مقر

**مەنگۆز:** (+) سپڵە، پێنەزان، بێئەمەگ.ف بی چشم و رو

**مەنگۆڵە:** گوڵێکە وەک شلێرە وایە گوڵەکانی شۆڕ دەبنەوە.ف نام گلی است

**مەهتووک:** خوێڕی و بێکارە، سووک و چرووک، بێبایەخ، بێقەدر. *(زۆر بە چاوێکی مەهتووکانەوە سەیریان کردین.)* ف بی‌ارزش،

هەرزە و لاقید.

**مەهل**: قاتی و قڕی، گرانی. ف قحطی

**مەهی**: مەڕ، پەز. ف گوسفند

**مەیتەبا**: هەڵەپەزە، پەسپەسەکێویلە. ف رتیل

**مەیدانکێش**: ئاسنێکی دەمپانە وەک درمەغ دەسکی هەیە گڵ و خۆڵی مەیدانی خشتپێژانی پێ پاک دەکەنەوە. ف وسیلەای در کار خشتزنی

**مەیل سارد بوونەوە**: بریتی لە روحم سارد بوونەوە و بێوەفایی. *(بەینێکە مەیلەکەت سارد بۆتەوە.)* ف کنایه از بیوفایی و بیمهری

**مەیل**: (+) ماین، یەکسمی مێ. ف مادیان

**مەیلنان**: لەبیر بردنەوە، ئارەزوو کردن. *(تازە مەیلی ناوە و دڵنیا بووە.)* ف از یاد بردن

**مەیلە**: لۆرک و پەنیری تێکەڵ کراو. ف لور و پنیر آمیخته باهم

**میجێز**: ) میجاز، قەول، بەڵێن، پەیمان؛ ) بەهانە، ورک، بیانوو، *(دەک نەمێنم چەند پایزێکی لەمن بەمیجێزە.«فولکلور».)* ف بهانه

**مێخسکە**: گوڵمێخ، سنگەبزمار. ف میخ طویله.

**مێرازایی**: مەردازایی، پیاوەتی، مرۆیانی. ف مردانگی

**میرتفاق**: میرئاخوڕ، کەسێک کە بەسەر کا و وێنجەی خان و میراندا ڕادەگا. ف مسئول علف در خانەی خان و فئودالها

**مێردمنداڵ**: ☜ مێرمنداڵ

**مێرگەپان**: (+) دەشتی پان و بەرین و پڕ لە گژوگیا. ف دشت وسیع و سرسبز

**مێرمناڵ**: ☜ مێرمنداڵ

**مێرمنداڵ**: گەنج، تازەلاو. ف نوجوان

**مێرووژانە**: ژانی کەم و جارجار و بە ئاستەم، چڵ دانی لەش. ف درد خفیف

**میرووله عەجەمانە**: جۆرێک میروولەی گەورەیە لە جیاتی دانەوێڵە جڕ و جانەوەری مردوو دەخوا. ف نوعی مورچەی بزرگ کە بەجای دانه حشرات مرده را میخورد.

**میزوو**: کیرەوڵ، چەرمی شۆڕی ژێر سکی جوانەگا کە کیری لێوە دێتە دەرێ. ف جایی که آلت تناسلی گاو نر از آن بیرون میآید

**میزەگایلە**: خەتی خوار و خێچ و قیلە و قانج، پێچەلاوپووچ. ف زیگزاگ

**مێشگرە**: مۆزگرە، جۆرێ پووشبەقوونەی بۆر و کلک قوڵەیە دوژمنی مۆز و مێشانە. ف حشرەای مانند سنجاقک مگس شکار میکند

**مێشە خانمانە**: جۆرێک مێشی سەوزە لە مێشیتر گەورەترە. ف نوعی مگس سبز رنگ

**مێلکدان**: کلدان، کلتوور، سورمەدان. ف سرمەدان

**مێلۆ**: لانکە، بێشکە. ف گهواره

**مێمل**: ) (+) ملۆزم، مزاحیم؛ ) سپڵ، گورگ نەخۆرە. ف ) مزاحم؛ ) طحال

**مینگەیی**: بەو پیتانە دەگوترێ کە لە کەپۆدا دەگوترێن. م، ن، گ وەک ژەنگ، ڕەنگ. ف حرفهایی که در بینی تلفظ میشوند

**مێوخۆرکە**: ئالینکێکە لە دار مێو دەهاڵێ وەک ماڵۆنچە وایە و مێوەکە وشک دەکا. ف آفت

گیاهی تاک

**مێـوره:** سـاقەتـەی داره مێـو. لاسـقی ڕەز.[ف] ساقەی تاک

**مێوژۆرد:** گیایـەکـه گـەڵای ورده و گـوڵی شـین دەر دەکا.[ف] نام گیاهی است

**مێوەت:** خزمەت، راژە.[ف] خدمت

**مـێوەجـاخی:** ژن و مێردێـک کـه هـەر کچیـان دەبێ.[ف] زن و شوهری که تنها دختر دارند

**مێهـرەجـان:** کـۆڕ و کـۆ بوونـەوەی ئـەدەبـی، فستیواڵ.[ف] جشنواره

**میەسڵ:** جندۆکه، ئەوانگەل، لەمەچێتر.[ف] جن، از ما بهتران.



**ناتۆر**: (+) کێشکچی، قەرەوڵ.[ف] نگهبان

**ناحاڵی**: لا، پندرحاڵی، بەدگووز.[ف] ناحالی

**ناخاڵە**: نەزان، بێئەقڵ، ناهیر.[ف] نادان

**نادایە**: باوەژن، زڕدایک.[ف] نامادری، زنبابا

**ناراڤ**: تورت و پتەو، ناوپڕ و قایم.[ف] محکم و توپر

**نارک**: ڕوومەت، گۆنا، کولمە.[ف] گونه، صورت

**نازۆ**: خاوەن شانازی، قەدرگیراو *(بەو ڕێز و حورمەتە زۆرە نازۆتان کردووم)* [ف] مفتخر

**ناسرگە**: فەڕغوون، فارگوون.[ف] فرغون

**ناسـووس**: ) ترومپای با لە تەگەر کردن؛ ) ناسووسی چراتۆڕ و پریمز.[ف] ) تلمبەای کە برای پنچرگیری چرخ استفاده میشود؛ ) تلمبەی چراغ زنبوری و ...

**ناقرە**: قورقوراچکە، قورووق، تینتینۆکە، قورگ، [ف] حلقوم.

**نان به ساجەوە سووتان**: بریتی لە پەک کەوتن و ناهومێد بوون. *(ابۆ ئاوا سەرت لە خۆت شێواندووە خۆ نانت بە ساجەوە نەسووتاوە.)* [ف] کنایه از ناامید شدن

**نـان بـە سێڵەوە سـووتان**: ☜ نـان بـە سـاجەوە سووتان.

**نانانە**: ئەو بەراتەی کە لەباتی نانی ژەمەکان دەدرێ بە ڕەنجبەر و ئیتر لە ماڵی خۆی نان دەخوا.[ف] مبلغی کە بەجای نان سە وعدە بە رنجبر دادە میشود

**نانجە**: دەلاقە، دەربیجەی چکۆڵە. *(ژوورەکە نانجەیەکی چکۆلەی تێکرابوو.)* [ف] دریچەی کوچک

**نانۆخگیر**: نینۆخگیر، نووخانبڕ.[ف] ناخنگیر

**نانودۆبڕ**: کەسێک کە شووم و پێ ڕەشە و هەمیشە ناشکوری دەکا.[ف] کنایە از آدم نحس

**نـانی پـووە**: نانی جۆ و بەڕوو، تێکەڵکراوی ئاردی جۆ و بەڕوو کە دەکرێ بە نان.[ف] نان بلوط و جو

**نانی سەگ پێدان**: بریتی لە زۆر بە ناڕەحەتی و کەم و کووڕییەوە بەخێو کردن.[ف] کنایە از دادن خوراکی بە کسی آنهم با ناراحتی و سختی

**ناوجیکار**: نێوبژیکەر، کەسێک کە ناوبژیی دوو

کەس دەکا.ف میانجی‌گر

**ناوجیگەری:** نێوبژی کردن.ف میانجی‌گری

**ناوچاو تاڵ:** ڕووتاڵ، گرژ و مۆن، تووڕە، خوێن‌تاڵ.ف ترشروی

**ناوچاوان تاڵ:** ) ڕووگرژ، ڕووتاڵ؛ ) بەدبەخت، بەدیەغباڵ. *(ناوچاوانم هێندە تاڵە بچمە سەر سیروان وشک دەبێ.)* ف ) اخمو؛ ) بدبخت

**ناوڕاسگ:** ناوەڕاست، نێوان.ف وسط

**ناوکار:** (+) وشەی زیادی لە شێعردا بۆ پڕ کردنەوەی کێش. *(دەردی دووری زۆر گرانە دڵبەرا هیجران بەسە/ دڵ وەکوو پەروانە سووتا، (چاوەکەم) سووتان بەسە «حەقیقی».)* ف کلمەای اضافی در شعر برای پر کردن وزن

**ناوماڵ:** ) تەختایی سێ‌گۆشەی دەسماڵی ژنان؛ ) تەختایی زین، ناوماڵی زین.ف ) وسط دستمال زنانە؛ ) تخت زین

**ناووگ:** نێوان، بەین، مابەین. مەعبەین.ف میان

**ناوونووچگ:** ناونیتکە، ناوونرکە، قسەی سووک وەدووی کەسێک خستن.ف تهمت

**ناوە:** (+) خەتی نێوان دوو زەوی. *(ناوە لە زەوییەکە بدەن و هەرکام بەشی خۆتان دیاری بکەن.)* ف مرز زمین کشاورزی

**ناوەدان:** دیاری کردنی مەرزی زەوی، سنوورکێشانی نێوان دوو پەڵە زەوی.ف کشیدن مرز میان دو قطعه زمین

**ناوەزیلە:** ناوەزۆڵ، نێوەزۆڵ، ناڤزێڵ، ناوەڕاستی شووتی.ف مغز هندوانە

**ناوەقە:** ناوچە، مەڵبەند.ف منطقە

**ناوەکێشان:** مەرز دانان، دیاری کردنی سنوور ☜ ناوەدان

**ناوی گەورە و شاری وێران:** بریتی لە کەسێک یان ناوەندێک کە نێوبانگی گەورەی هەیە و بەڵام لە نزیکەوە وا نییە.ف کنایە از کسی یا ادارەای کە شهرت زیاد دارد اما در حقیقت اینطور نیست

**ناهیر:** نەفام، گەوج، بێئاوەز.ف ابلە

**نپنگ:** نەوی، نزم، میچەکە نپنگە.ف کم ارتفاع، سقف کوتاە

**نژیار کردن:** ئاهەنگ‌گێڕان و شادی کردن بە بۆنەی دەست پێ‌کردن یان تەواو بوونی کارێکەوە.ف سور و شادی بەعلت تمام کردن یا شروع کردن کاری

**نسرین:** گریان و هەنیسک، کوڵی گریان.ف گریە و سکسکە

**نفڵین:** گلۆر بوون، کەوتن بە عەرزدا.ف افتادن.

**نککێنە:** جۆرێ باڵداری لاق درێژە دەندووکی بۆلای سەرێ خوار بۆتەوە و لەگوێ ئاوان دەژێ.ف آوست

**نکوول:** (+) شارەزا، لێزان، بەڵەد. *(نکوولە لە هەمی کارێکی)* ف ماهر

**نگریس:** گوجەستەک، نەگبەت.ف شوم

**نۆ مانگی:** جۆرێ گرکەی شوێن شوێنە پێستێکی ڕەقی هەیە ئەگەر نۆ مانگ داینێن هیچی لێ‌نایە.ف نوعی خربزە.

**نوپێچکە:** بریتی لە منداڵی تازە پێرەوکە بوو.ف کنایە از بچەای کە تازە پا گرفتە

**نۆڕسکێن**: یارییەکە وەک دامە وایە هەرکام لە یاریکەرەکان یەکی نۆ داشیان پێیە.[ف] اسم یک بازی مانند داما

**نۆژەن**: چاک کردنەوە.[ف] تعمیر

**نۆکۆم**: ناکاو، کتووپڕ.[ف] ناگهان

**نۆکە چەرمەڵە**: نۆکە سپیلکە، نۆکە سپی.[ف] نخود سفید

**نۆکە سوورە**: ئەو نۆکەی دەکرێتە لەپە. نۆک.[ف] نخود

**نۆکە قەزوێن**: جۆرێ نۆکی دەنگ گەورەیە.[ف] نوعی نخود

**نۆکە کێویلە**: ناوی گیایەکی خۆڕسکە لە نۆک دەچێ.[ف] نام گیاهی است

**نۆکەرباب**: بابنۆکەر، گەورە نۆکەری ئاغا و خانان.[ف] سەرنۆکەر

**نۆکەڵ**: (+) بەرکەڵ، نگوینکی سێ ساڵە کە کاتی کەڵ گرتنی هاتبێ.[ف] گاو مادە سە سالە کە آمادەی جفتگیری باشد

**نۆکیسە**: (+) ڕژد، سەقیل، رەزیل، قرنیس.[ف] خسیس

**نۆلەکە**: ناوی گیایەکە.[ف] نام گیاهی است

**نومبەچۆ**: نێفەک، نافەک.[ف] خشتک شلوار

**نومهەد**: سەرحەد، کەوشەن، سنوور، تخووب. *(ئەڕای مە نومهەد مەلووم کەیگ.)* [ف] مرز

**نووپژی**: نیسک، نژی.[ف] عدس

**نووچاندن**: قووچاندن، نووقاندن، چووقاندن، [ف] برهم آوردن پلک چشم

**نووخانبڕ**: نانۆخگیر، نینۆخگیر.[ف] ناخنگیر

**نوورونەشەمە**: سەر و نەشەمە، پێوقەدەم، نوورونێوچاوان، . *(نوور و نەشەمەی تۆ چاکە بەردیش ناباری.)* [ف] یمن

**نووزاندن**: (+) دەنگی سەگ کاتێک خاوەنەکەی دەبینێ و دەچێ بۆلای.[ف] صدای سگ وقتی کە بە صاحبش نزدیک میشود

**نووزە نووز**: دەنگی سەگ لەلای خاوەنەکەی.[ف] صدای سگ پیش صاحبش

**نووزەڵ**: نووکن، گرینۆک، کەسێک کە زوو دەست دەکا بە گریان، دڵناسک.[ف] کسی کە زود گریە میکند، نازکدل

**نووس**: کیر، سیرەت.[ف] آلت تناسلی نر

**نووکوسۆ**: سەرەوقوڵە، کایەیەکی کچانەیە بە دەرزیلە دەیکەن.[ف] اسم یک بازی

**نۆوەی**: نۆک، نخە، نۆخۆ.[ف] نخود

**نویلک**: گووڤەک، سەرانگوێلک، سەلوێنک.[ف] سرگینگاه، شولە

**نەبین**: شووشەی مات و برگە برگە.[ف] شیشەی مات

**نەختاڵ**: تۆزەقاڵ، نەختۆک، بڕ، تۆسقاڵ.[ف] اندک

**نەخووس**: گڵمتکی ڕەق کە لە قوڕدا ناخووسێ. [ف] کلوخ سفت کە در گل خیس نمیشود

**نەرمەبەدۆ**: دڕوولە، وەستا مستەفا، گیا دۆکولێویکە دڕووی پێوەیە.[ف] نوعی گیاە خاردار برای آش دوغ

**نەرمەهەلۆ**: نەرمەغار، غاری لەسەرەخۆی ئەسپ.[ف] دویدن آرام اسب

**نەڕۆک**: ڕاوەستاو، چەقبەستوو، بێجووڵە.[ف]

ساکن

**نەشونما:** گەورە بوون و گەشانەوە، بەخۆدا هاتوو.[ف] رشد یافته

**نەغمە:** (+) سەر وەشاندنی بەران، لێدانی بەران بە سەر. *(بەرانەکە نەغمەیەکی لێدام خەریک‌بوو ملم بشکێ.)* [ف] کله زدن قوچ

**نەفاچڵ:** بڵح، حیز، خونک، ئاکار ناشیرین.[ف] فاحشه

**نەڵاتە:** نارەتە، نەعرەتە، نەڕڕە.[ف] نعره

**نەمام:** (+) دووزمان، قسەبەر، شۆڤار.[ف] خبرچین

**نەمرچ:** مڕومۆچ، ڕوونەخۆش، تووڕە و بوغزاوی.[ف] اخمو

**نەمرنەژی:** بژیمەمر. *(نەمرنەژێ ڕۆژگار دەبەینە سەر.)* ژیان بە سەختی و دەستتەنگی. [ف] بخورنمیر

**نەنێ:** ) نەنک، دایەگەورە، نەنە؛ ) بانگ کردنی دایەگەورە.[ف] ) مادربزرگ؛ ) صدا زدن مادربزرگ

**نەنێر نەمێ:** ☜ نەنێر نەمێو

**نەنێر نەمێو:** نێرەمووک، نێرمۆک، نەنێر نەمێ. [ف] نه نر نه ماده.

**نەواون:** نەوان، نەبان، مەڕی لە بیچوو بێزراو. [ف] حیوان متنفر از بچه خویش

**نەوڕ:** نەپسێن، داموسکی قایم.[ف] نخ محکم

**نەورایی:** تەختان، دەشت، گۆڕایی. *(لە شاخەکە هاتبوونە خوار و گەیشتبوونە نەورایی.)* [ف] دشت

**نەورم:** نەور، ناوگەڕ، دەشتایی، *(هاتە نەورم و گوێ ڕێیان/ بۆ تەماشای پووز و پێیان «ڕاوچی».)* [ف] دشت.

**نەوس وەبەر پێ کەوتن:** دۆعایەکە واتە لەبەر نەوس گیانت دەرچێ. *(نەوست وەبەر پێیت کەوێ ڕۆڵە دەڵێی هیچی نەخواردووە.)* [ف] نفرین به کسی که زیاد اشتها دارد و بهانه می‌گیرد

**نەوندە:** بارانڕست، گەنم و جۆی بە باران شین بوو.[ف] گندم و جویی که بوسیله‌ی بارش باران می‌روید

**نەوو:** لباد، لمەد.[ف] نمد

**نەوەژن:** نگوونک، نینگوون، بەرکەڵ، گوێرەکەی مێوی سێ ساڵە.[ف] گوساله سه ساله

**نەوەکام:** کاڵ، نەگەیشتوو، میوەی نەوەکام.[ف] میوه‌ی کال

**نەهامەت:** ) نەگبەت، نگریس، گوجەستەک؛ ) بەڵا، نەهاتی، چۆرتم، ئاپۆر.[ف] ) شوم؛ ) بلا و مصیبت

**نەهشین:** حۆل، وڕ، گەلحۆ، گەمشۆ، خول، گەوج، گەمژە.[ف] ابله

**نەهەنگ:** جەفەنگ، گاڵتە و ڕابواردن. *(بەو ڕۆژگارە خەریکی کەیف و نەهەنگن.)* [ف] کیف و حال

**نەیرەڤان:** ئاگادار. وشیار.[ف] آگاه

**نیازگا:** زیارەتگا. *(سینگی جێی تەواف هەم نیازگایە «بەیتی عەزیز و کوبرا».)* [ف] معبد، زیارتگاه

**نیچک:** (+) چەکەرەی گیای تازە ڕسکاو، گیای تازە ڕواو.[ف] گیاه تازه سر از زمین برآورده

**نیخن**: کەسێک کە هەمیشە هەناسەی سوارە و نیخە نیخی سنگی دێ.ف کسی کە خس خس سینە دارد

**نیخە نیخ**: سیخە سیخ، هەناسەسوار بوون و دەنگ لێ هاتنی سینگ.ف صدای خس‌خس سینە

**نێر بوون**: گوڵ کردنی گەنم و جۆ و گیا و گژ. *(گەنم نێر بووە.)* ف بە گل نشستن گندم و جو .

**نێرمایی**: جنسییەت.ف جنسیت

**نێرە پێخەسوو**: دابێکی قەدیم بوو پیاوێکی خزمی بووک لەگەڵی دەچوو بۆ ماڵی زاوا. *(بووک و پێخەسوو لە ژوورێن، نێرە پێخەسوویەکیشیان لەگەڵە.)* ف مردی کە همراه عروس بە خانە داماد می‌رفت

**نێرە وەجاخی**: کەسێک کە هەر کوڕی دەبێ.ف کسی کە تنها پسر دارد

**نێرەنوغە**: گیایەکە وەکوو پرپرە وایە بە زەویدا پان دەبێتەوە.ف نام گیاهی است

**نێزەک**: ئەستێرەی ڕاخوشیو، پێور.ف شهاب

**نیڤۆ**: پزوو، ئەو شوێنەی پاتۆڵ کە بەنەخوێنی تێ‌هەڵدەکێشن.ف نیفە.

**نیکال**: سووچ: قوژبن، قونیچک، قولینچک.ف گوشە

**نێکێ**: نەنک، دایەگەورە، داپیرە، نەنێ.ف مادربزرگ

**نێگەتیڤ**: مەنفی، سەلبی.ف منفی

**نێڵ**: مەڵغە، برازە، نوێڵ، لۆسە، لەوازە، دەلەم. ف اهرم

**نیمناز**: ناز و عیشوە، ناز کردنی ئافرەت. *(بە ناز و نیمناز دێت و ڕادەبرێ.)* ف ناز و عشوە

**نینۆخ**: نینۆک، نووخان.ف ناخن

**نینوخ وشک**: بریتی لە مرۆڤی سەقیل و ڕژد و مستقووچاو، چرووک، قڕنیس.ف خسیس

**نینۆخ ڕەق**: ☜ نینوخ وشک

**نینۆکڕەق**: ☜ نینوخ وشک

**نینۆکوشک**: ☜ نینوخ وشک

**نینۆکە شەیتان**: شەیتانۆکە.ف حلزون

**نێو پارە**: نێو جەرگە، ناو پارە، نێو ئاوایی. *(ماڵەکەیان نێو پارەیە.)* ف وسط آبادی

**نیوال**: دۆڵ، نهال، نوهال، شیو، دەرە.ف درە

**نێوان تێکچوون**: بەین ناخۆشی، قسە نەکردن دەگەڵ یەکتر.ف قهر کردن با یکدیگر

**نێوان خۆشی**: دۆستایەتی، بەین خۆشی.ف میانە داشتن

**نێوان ناخۆشی**: نەیاری، دوژمنایەتی.ف دشمنی

**نێوبڕەک**: تیغەی بە تەختە کراو لەنێو یەغدان و دۆلابدا. *(دولابەکە چوار نێوبڕەکی هەیە.)* طبقەی کمد و صندوق

**نێوبژیوان**: نێوبژیکەر. لێک کردنەوەی دوو کەس کە بە شەڕ دێن.ف میانجیگر

**نێوبژیوانی**: نێوبژی کردن.ف میانجیگری

**نێوبوێر**: نێوبەنێو، بەین بەین هەڵاواردن، جارناجارێک. *(هیچکەس نێوبوێر مەکە بەشی هەموویان بدە.)* ف یک در میان

**نێوچاو تاڵ**: ☜ ناوچاو تاڵ

**نێوچاو تێکنان**: نێوچاوان بە یەکدا دان. *(نێوچاوی تێک دەنێ دەڵێی میرخەزەوە.)* ف اخم

کردن

**نێوچاوان بە یەکدا دان:** نێوچاوان تێکنان، ڕووگرژ کردن، ڕووتاڵ کردن.ف اخم کردن

**نێوچاوان تاڵ:** ☜ ناوچاوان تاڵ

**نێوچاوان ڕەش:** بەدبەخت، چارەڕەش، بەختڕەش.ف سیاەبخت

**نێودەلانە:** ☜ نێودەڵە

**نێودەڵە:** دەلانە، پلەی نێردیوان، پلەی پەیژە.ف پلەی نردبان

**نێوشکێن:** دووریني دوو کوتە پارچە بە یەکەوە و نووشتاندنەوەی قەراغی کوتە پارچەکان لە دیوی ناوەوە هەرکام بەلایەکدا. *(ئەگەر ڕیزەکەت لێدا بەوتوو نێوشکێنی کە.)* ف تا کردن کنار پارچەی دوختە شدە از داخل

**نێوقەد:** پشتێنە، پشتوێنە، پشتێندە.ف کمر

**نێوکە ڕەشە:** نێوەڕاستی پشتی یەکسم کە کورتان دەکەوێتە سەری و کاتێک بریندار دەبێ درەنگ چاک دەبێتەوە.ف وسط پشت الاغ کە پالان روی آن قرار میگیرد و وقتی کە زخمی میشود دیر التیام مییابد

**نیوەسەڵتە:** لاوێک کە ژنی مارە کردبێ و هێشتا نەیگوێستبێتەوە.ف جوانی کە عقد کردە، اما هنور عروسی نکردەاست

**نێوەکی:** ناوەکی، دەروونی.ف هەستەای.



**واتایی**: مانایی، مەعنەوی، *(شەڕابی ئاڵی واتایی بدە دەستم فەلەک بادە/ تەپوتۆزی خەیاڵات و خەفەتباریم وەبەر بادە «حەسەن سەلاح سۆران».)* ف معنوی

**وارک**: باڕۆکە، جووچکە مریشکی دوو ساڵە.ف جوجه مرغ دو ساله

**واڕگ**: پرمەی گریان، قوڵپەی گریان، هاوار. *(لەبەر ژان جەسەی واڕگ لێ هەڵسا.)* ف هق‌هق گریه، داد زدن

**وارید**: بەڵەد، شارەزا، بەڵەو.ف بلد

**واریقات**: بەسەرهات و قسەوباس، مەسەلە و ڕووداو. *(واریقاتەکەم لە سیر تا پیواز بۆ گێڕایەوە.)* ف سرگذشت و رویداد

**وارینش**: پرشنگدار، درەوشاوە، بەبریقە.ف درخشان

**وازەنی**: هەتوان، مەڵحەم.ف مرهم

**واژین**: نووسراوە، ئینشا.ف انشاء، نثر

**واق**: (+) باڵدارێکە بەقەد کەو دەبێ ڕەنگی بۆرە. ف بوتیمار

**واق بردنەوە**: واق ورمان، حەپەسان، سەرسام بوون*(لێی سواری کەر بووبەکەشیدەوە/کەڵەبابی دیی واقی بردەوە.«ڕەشاد شەمسەدینی.»)* ف متحیر شدن

**واقواقکەرە**: تاقتاقکەرە، تووتەک.ف بوتیمار

**واڵە**: (+) لەقین و خوار سووڕانی تەگەری ماشێن و ... لە کاتی ڕۆیشتندا. *(تەگەری ئەو ماشێنە واڵە دەکا دەرنەپەڕێ باشە.)* ف چرخیدن *نامیزان تایر اتومبیل و...*

**وامێلانە**: گێژەڵووکە، گەردەبل، سایکلۆن، گەڕەپێچ.ف گردباد

**واوڵڵە**: ماسین، پەنەمین، *(چاوی واوڵڵە گرتگە.)* ف آماسیدن

**واهوفە**: بارینی بەفر بە باوە، باڕووشک، بادەوە.ف بارش برف با وزش باد

**وایلۆک**: گۆرانیی خەماوی، ئیلێگی، شینگێڕی بە دەنگی بەرز بۆ مردوو.ف مرثیه

**وربه**: کەپەنک، قاپووت.[ف] بالاپووش نمدی

**ورچـەکـە بـوون**: بریتـی لـە داکشان و گـەورە بوونەوەی سێبەری ڕەوەز و بەرد. *(سێبەری گا بەردەکە ورچەکە بووە.)* [ف] بزرگ شدن سایە سنگ و سخرە در بعدازظهر

**وردەپێ**: بریتـی لـە مـاڵاتی چکۆڵـە وەک مـەڕ و بزن.[ف] کنایە از گوسفند و بز

**وردەکـــوت**: گێــرە کــردن بـــە وردی، *(خـەرمانـەکـەمـان وردەکـوت کـرد.)* [ف] کوبیـدن خرمن

**ورژن**: ئەژنۆ، چۆک.[ف] زانو

**ورسگ**: برسی، نێز.[ف] گرسنە

**ورکن**: بیانووگر، پەڵپگر، بە بیانوو.[ف] بهانەگیر

**ورکەبەرد**: بەردیورد، خڕەبەرد.[ف] سنگریزە

**ورکەخۆر**: بەردەماو خۆر، پاشـەرۆک خۆر.[ف] کنایە از نوکر مطیع

**ورکـەنـان**: نـانی ورد، ورتکـەنـان، ڕیـزەوڵ، ڕیزەنان.[ف] نان خرد

**ورگە پۆست**: نـەخۆشـییەکی ماڵاتـە بـن سـکی هەڵدەماسێ، قۆر.[ف] فتق

**ورمزە**: گۆزروان، گازوانکە.[ف] گل گاوزبان

**ورووژم بـردن**: پـەلامـار دان، هـەڵکوتانـە سـەر شوێنێک.[ف] هجوم بردن

**ورووژم کردن**: ☜ ورووژم بردن

**وروێرکە**: ) فەرمانبەر و کارەکەری ڕوحسووک و گوێڕایەڵ، بەردەست، شاگرد؛ ) منداڵی تازە پێ گرتووە، پێڕەوکە.[ف] ) وردست، شاگرد؛ ) بچەی تازە پا گرفتە

**وڕەبـەلـەک**: هـوڕەبـەلـەک، گیایـەکـە تاڵـە وەک مێکووک وایە گەڵاکەی سپیواشە، ماڵات نایخوا .[ف] نام گیاهی تلخ

**وریچە**: بریقە، تررووسکە، وریشە.[ف] درخشش

**وژاشـارکێ**: قـەراقـەرا، حـەشـارکۆ، خۆشـارکێ، قەرێ قەرێ.[ف] قایموشک

**وژن کردن**: بژار کردن.[ف] وجین کردن

**وژن**: بـژار، هـەڵکـەنـدنی گیـای هـەرزە لـەنێـو بێستان و زەرحات.[ف] وجین

**وژنکەر**: ئالاکەر، بژارچی، بژارکەر.[ف] کسی کە وجین میکند

**وژنـە**: قایـشی پێکـەوە لکانـدنی نیـرو ئـاموور، گاینجە.[ف] تسمەی کلفتی کە دارخیش و یوغ را بە هم وصل میکند

**وژە**: (+) بـست، بنگوسـت، لـە سـەری قامکـە گەورەوە تـا سـەری قامکە تیتۆلـە بـە بڵاوی.[ف] وجب

**وسنە**: برسی، نێز.[ف] گرسنە

**وسـیک**: (+) چۆلـەکـەیـەکی بۆری چکۆڵـەیـە لـە پاساری چکۆڵەترە.[ف] نام پرندەای کوچک

**وشا**: (+) گوشاد، فرەوان، فش و فۆڵ.[ف] گشاد

**وشـتر بـەداس**: گـەمـەیـەکی لاوانـی گوندنشینە، کەسێک داسێک بەدەستەوە دەگرێ جاجمێکی بـەسـەردا دەدەن و دەمـی داسـەکـە بـە جاجمەکەوە بە پەتێک دەپێچن. بەشێوەیەک کە وەک دەنـدووکی لـێدێ و بـە هـەڵترووشکانەوە دڕوا و شـەوانـە بـە ماڵانـدا دەگـەڕێ و چـەنـد کەس لەگەڵی دەگەڕێن و گۆرانی دەڵێن و قـەند

و کشمیش و هێلکه و ... وەردەگرن.ف نام یک بازی جوانان روستایی

**وشکه خۆتەن:** جۆرێ چناری خوار و خێچ که ڕاست هەڵناچێ و باڵا بەرز نییە.ف نوعی درخت چنار

**وشکه دایەن:** دایەنێ که شیر نادا به منداڵ و تەنیا تەڕ و وشکی دەکاتەوە و ژیری دەکا.ف دایەای که به بچه شیر نمی‌دهد، فقط به او رسیدگی می‌کند

**وشکه دۆ:** کۆن دۆ، ئیشکه دۆ، مانگایەک که نەشزاوە بەڵام شیری تێدایە.ف گاوی که بچه نیاورده ولی شیر می‌دهد

**وشکه شایی:** ☜ هیشکه شایی

**وشکه قۆخه:** ☜ وشکه کۆخه

**وشکه کۆخه:** وشکه قۆخە، کۆخەی وشک و بێبەڵغەم که سینگ و گەروو زۆر ئازار دەدا. ف سرفه یابس

**وشکه هەڵوا:** ئیشکه هەڵوا، هەڵوای ئارد و دۆشاو که توند دروستی دەکەن بۆ سەفەر.ف حلوای خشکی که برای سفر درست می‌کنند

**وشکەخڕ:** وشکه شیو، خڕێک که زوو ئاوەکەی وشک دەبێ.ف درەای که آب آن به زودی می‌خشکد

**وشکەکەند:** ئیشکەکەند، وشکەکێڵ، شیوەردێک که به وشکی کێڵدرابێ.ف شخم زدن زمینی که آبیاری نشده‌باشد

**وڵنگه:** (+) زایەڵە، دەنگدانەوە.ف پژواک

**وڵوڵه:** دەڵەمە، هێلکه مریشکی بێ توێکڵ که بەر لە بوونە هێلکه مریشک دایدەنێ.ف تخم‌مرغ که قبل از سفت شدن پوسته گذاشته می‌شود

**وڵێنی:** قومری، یاکەریم.ف قمری

**ونەوشک:** قەزوان، قەسقەوان، قەزخوان.ف چاتلانقوش

**وەتەک:** کەت، قەتێ، کوڕکوڕ.ف کوکر

**وەجه:** چەپک، دەستە، باقه گیا.ف توده گیاه

**وەدوو هاتن:** وەقسە هاتن، ف به حرف آمدن

**وەدوو هێنان:** وەقسە هێنان، قسە پێکردن.ف بەحرف آمدن

**وەدەنگ هاتن:** ) وەقسە هاتن، بێدەنگی شکاندن. ) بەدژی زوڵم و زۆر ڕاپەڕین وەقسە هاتن و ناڕەزایەتی دەربڕین. *(کەی دەبڕێتەوە بیانووی زۆرداران/ کێیە وەدەنگ بێ لەسەر هەژاران؟ «هەژار».)* ف ) به سخن درآمدن؛ ) به جان آمدن و بەپا خاستن علیه ظلم و ستم

**وەرتە و بەرە:** گێرە و کێشە، بێنەوبەرە، چەرمەسەرێ، گیر و گرفت.ف گرفتاری

**وەردێنەچی:** تیری لێدەر، ئەو کەسەی لە نانەواخانە وەردێنە لێدەدا.ف وردنەگر

**وەرزگار:** وەرزێڕ، جووتیار، جووتێر، جووتبەندە ف دهقان

**وەرزوولا:** مشتوماڵ، وەرژوو، شێلان و دەست پێدا ماڵین.ف ماساژ

**وەرژۆن:** بەرەژان، ژانی پێش منداڵ بوونی ژن. ف درد قبل از زایمان

**وەرکەمەر:** ناوی گیایەکی بۆنخۆشی کوێستانییە.ف نام گیاهی است

**وەرگەوەران:** دوژمنی گیانی یەکتری. *(بوونە وەرگەوەرانی یەکتری.)* ف دشمن جان یکدیگر

**وەرماس:** ئاسک، مامز، مامبز. ف آهو

**وەڕوودادانـــەوە:** بـــەڕوودادانـــەوە، وەبیـــر هێنانـــەوەی کـــارێکی ڕابـــردوو. *(کارێکـــە و کردییەسـی تـازە وەڕوویدا مـەدەرۆ.)* ف بـەیاد انداختن گذشته

**وەڕووی خۆ نەهێنان:** خۆ شلوێ نەکردن. *(هەر وەڕووی خۆشـــی نـــەهێنـــا.)* ف بـــەروی خـــود نیاوردن

**وەرهاتن:** تێ‌ڕۆهـاتن و ڕامـاڵین. *(لـە حاڵێکدا، لە سەرەوە لە لووتکەکان، تۆف و زریان لـە دەوەن و داران وەردێـن/ لـە بنـەوە، لـە دۆڵـەکان، گیـای نەوخیزە و گۆپکە دەردێن «عەبدوولّلا پەشێو».)* ف تاراج

**وەرەم:** (+) دەردەباریکە، ئازارە باریکە. ف سل

**وەرەمەمکی:** بەرمەمکان، منداڵی شیرەخۆرە. ف بچه شیرخواره

**وەڕێ هاتن:** هاتنەڕێ، تووش بوون، *(هەرکارێک بکەی وەڕێت دێتەوە.)* ف دچار شدن

**وەڕێ:** بەڕە، لەی. ف گلیم

**وەزگ دان:** دیق کردن، *(ئەوکارەم بۆ جێبەجێ نەبێ وەزگ دەدەم.)* ف دق کردن

**وەزگ کەوتن:** زگپڕ بوون. *(ئێتر وەزگ کەوتووە هەموو ساڵێک منداڵێکی دەبێ.)* ف حامله شدن

**وەژنکار:** تاوانبار، گوناحکار. ف گناهکار

**وەژەن:** گونـاح، سـووچ، پیـازە، تـاوان، باڵبـەز. ف گناه

**وەستا مستەفا:** ☜ نەرمەبەدۆ

**وەستەک:** یەکسمێک کە زۆر ماندوو دەبێ و لـە ڕۆیین دەکەوێ. ف اسب و الاغی که زود خسته می‌شود

**وەســـتەگ:** ئـەســـپێک کــە ســـواری ناشـــی و بێ‌ئـەزمـوون گرتبێتـی و تـەمبـەڵ و چـەمـووش بارهاتبێ. ف اسبی که توسط سواری بی‌تجربه رام شده‌باشد

**وەسەر کردن:** ) بریتی لە قسە کردنی زۆر *(کە وەسـەری کـرد بڕینـەوەی نییـە.)* ؛ ) کردنـە سـەر *(ئاش چۆڵـە گـەنمـەکـەت بێنـە وەسـەری کـە.)* ف ) کنایه از وراجی زیاد؛ ) ریختن گندم در آسیاب

**وەســەر کـەوتـن:** ) لـە هـەوراز چوونـە سـەر؛ ) دەوڵەمەند بوون، مامەڵە بەدەستەوە هـاتن *(مـام بـایز لـە مامـەڵـەکـەیـدا سـەر کـەوت.)* هـەڵبـڕین و وەدواکـەوت، *(ئـەمسـەر ئـەوسـەری دێ وەسـەری کەوت نەیگرتەوە.)* ) وە دوا کەوتن ف ) بالا رفتن از سـربالایی؛ ) ثروتمنـد شـدن. ) دنبـال کـردن کسی.

**وەشڵێ:** وەشڵە، جوانکیلە، دەلال، شەپال. ف زیبا

**وەڤد:** کـۆڕی نێـردراو بـۆ شـوێنێک. *(کـە وڤـدێ دەچێتـە شـوێنێ/ بـۆ سـەر گـۆڕی سـەربـازی ون تاجـەگوڵینـەیـەک دێنـی «عـەبدووڵڵا پەشێو».)* ف هیئت

**وەفە:** جـۆرێ نـەخۆشـیی یـەکسمە شـەل دەبێ، باخە. ف مرضی که اسب را لنگ می‌کند

**وەکار خستن:** ) هەڵکردنی ماتۆڕ و دەزگا و ... ؛ ) کـار کـردن بـە کـەسێک، کـار پـێ‌کـردن. ف )

روشن کردن؛ ) بەکار انداختن

**وەکار کەفتن:** ☜ وەکار کەوتن

**وەکار کەوتن:** ) دەست کردن بە کار، دەست بەکار بوون؛ ) هەڵبوونی ماتۆڕ و ماشێن و ..ف ) شروع کردن کار؛ ) روشن شدن موتور و ...

**وەکار هاتن:** بە کەڵک هاتن.ف بەدرد خوردن

**وەکار هاوردن:** وەکار هێنان، کەڵک لێوەگرتن.ف بەکار بردن

**وەکار هێنان:** ☜ وەکار هاوردن

**وەگێڕ:** کەسێک کە هەقایەت یا باسێک دەگێڕێتەوە.ف راوی

**وەل:** (+) زەلکاو، باتڵاخ، زۆنگ.ف باتلاق

**وەڵاشم:** پرژ و بڵاو، شیکراوە، هنجراو.ف حلاجی شده و پراکنده

**وەلحاسڵ:** خۆلاسە، لەسەریەک.ف خلاصە

**وەلیل:** نەخۆش و کەلەلا، پەک کەوتوو.ف علیل

**وەناوکەوتوو:** بەساڵاچوو، گەڕاوە، بە تەمەن.ف سالخوردە

**وەنۆشک:** قەزوان، قەسقەوان.ف چاتلانقوش

**وەنەن:** پردی بزۆک، پردی بە دار و تەناف ساز کراو.ف پل متحرک

**وەور:** بەفر، ویەر.ف برف

**وەیشت:** تەوژم، گوشار، جەخت.ف فشار

**وەیەکا چوون:** ) تێکپەڕین، لە یەکتر هەڵچەقین، تێکڕاچوون؛ ) تێک هەڵچوون، شەڕ کردن لەگەڵ یەکتری.ف ) درهم فرورفتن؛ ) گلاویز شدن

**وێرە درێژ:** چەنە درێژ، زۆربڵێ، چەنەوەر، دەمەوەر، چەنەوێرغە.ف وراج

**ویزرک:** ئەسپەندەر، ئەسپەننەر.ف اسپند

**وێزەنگ:** ) ئاوزەنگی، ڕکێف، زەنگۆ؛ ) وەنەوز، وێژنگ، خەونووچکە؛ ) پەلاماری پەنامەکی، هەڵمەت بردن بەدزییەوە *) خۆیان مات کرد و لەپڕ وێزنگیان دان.)* ف ) رکاب زین؛ ) چرت زدن؛ ) عملیات سری

**وێژامە:** پەخشان.ف نثر

**ویژن:** بێژنگ.ف غربال

**ویشکاو هاتن:** (+) ) چۆرە لێبڕان، *(کانییەکە وشکاوی هات.)* ؛ ) بریتی لە پیاوێک کە تۆماوی نەمابێ، لە پیاوەتی کەوتوو. *(برا من تازە ژنم بۆچییە وشکاوم هاتووە.)* ف ) خشکیدن چشمە و استخر و ... ؛ ) کنایە از عقیم شدن مرد.

**ویشکە سوێ:** زەویی وشک و بێئاو و قەڵشت قەڵشت.ف زمین خشک و ترکخوردە

**ویشکەپەڕ:** ڕەحەت بوون بە خۆ پێوەنان و دەستبازی.ف انزال بە وسیلەی دستبازی

**وێغر:** بەرەڵلا، بەرهەڵدا. *(ئەسپەکەی وێغری نێو وێنجەکە کرد.)* ف رها

**ویڵغار:** وێرغە، جۆرێ ڕەوتی وڵاغی سواری.ف نوعی دویدن اسب

**وێنجە خەشە:** خەشە وێنجە، جۆرێک وێنجەیە گوڵی پەمەیی دەر دەکا ماڵات بای پێ ناکا.ف نوعی یونجە

**وێنجە ڕەشە:** باشترین وێنجە کە ماڵات بە تەڕی و بە وشکی چاکی دەخوا، گەڵاکەی سێ پەڕەیە و ساڵی سێ بەری دەدوورنەوە.ف

نوعی یونجه

**وێنجه ڕەشە**: ڕەشە وێنجە، جۆرێک وێنجەیە وەرزێران زۆری دادەچێنن.ف نوعی یونجه

**وێنجه کێویلە**: وێنجەی خۆڕسک کە لە کێو و شاخ دەڕوێ.ف یونجه کوهی

**وێنجه مارانە**: گیایەکە لە وێنجە بەرزترە گەڵاکەی وەک وێنجە دەچێ، ساقەتی ئەستوورترە و گوڵێکی زەرد دەر دەکا.ف اسم گیاهی است شبیه یونجه

**وینگە**: دەنگی خولانەوەی مەرزەق، دەنگی هاویشتنی بەرد.ف صدای چرخش سنگ در هوا

**وێوڵ**: دارێکی جەنگەڵییە بەری نییە.ف یک درخت بی‌ثمر جنگلی

**ویەر**: بەفر، وەور.ف برف

**ویەراو**: بەفراو.ف برف‌آب



**هاتنــه کلکــان:** ) پاشــگەز بوونــەوە، پــەژیــوان بوونــەوە. *(ئیتــر هاتوومــە کلکــان قــەت کــاری وا ناکــەم.)* ؛ ) کۆتــایی، ئــاخر. *(کــارەکــەمــان هاتۆتــە کلکان ئیتر خەمم نییە.)* ف ) پشیمان شدن؛ ) به پایان رسیدن

**هاتنەکەوان:** ڕێک کەوتن و سازان، سازگاری. *(هێندە نابار و خیشەسەرە بە هیچ کلۆجێ نایەتە کەوان.)* ، *(ئەگەر مەیلت لە سەرمە بەڕاستی وەرە کەوان/ دەنا بەو نەحلەتەی بی کە خودا کردی لە شەیتان «گۆرانی».)* ف سازش

**هاچەر:** ☜ ئاچەر

**هاچـەرفـەڕانسە:** ) ئاچـەرفـەڕانسە، ئـامرازێکی کردنـەوە و بـەسـتنەوەی پـێچ و مـۆرەیـە، بـە ڕەزمە توند و شل دەکرێتەوە. گەورە و چکۆلە دەکرێتەوە و بۆ هـەموو پێچێک دەبێ؛ ) بریتی لـە کـەسـێک کـە هـەمـوو کارێـک دەزانـێ.ف ) آچارفرانسه؛ ) کنایه از کسی که همه کار بلد است

**هارووژان:** ورووژان، تووڕە بوونی بە کۆمەڵ. ف به هیجان آمدن گروهی

**هارووژانـدن:** ) تـووڕە کـردن و شـڵەژانـدنی خەڵک. *(بێدەنگ دانیشتوون مەیان هارووژێنە.)* ؛ ) ورووژانـدنی زەرگـەتـە و ژنگـەسـوورە کـە تێکدەهـاڵێن و هێرش دەبـەن.ف ) بـەهـم زدن مردم؛ ) برانگیختن زنبور

**هارووژاو:** ورووژاو، تووڕە کراو.ف بـه هیجان آمده

**هارەکڕ:** دەستاڕ، بەردی دانـەوێڵـە لـێ کردن.ف دستاس

**هاسـکە هاسـک:** هـەناسـە سـوار بـوونی دوای هەڵاتن، هانکە هانک.ف نفس نفس زدن بعد از دویدن

**هاشاوڵ:** شاتاوڵ، پەلامار، شاڵاو.ف حمله

**هاشە و پاشە:** خەونی تێکە و لێکە و ترسناک،

خەوی ناخۆش. *(خەونێکی هاشە و پاشەم دی.)* ف کابوس

**هاڤەن**: ئامانج، ئاوات. ف هدف

**هاڤی**: خوناوە، ئاوی بارانە لەسەر گەڵا و گوڵ. ف قطره باران روی برگ

**هاکەزایی**: هەوەنتە، گۆترە، کویزەرکوت. ف کنایه از کار نسنجیده

**هاڵ**: (+) تەپک، تەپی لم، تەپکی ڕمل. ف تپەی شنی

**هاڵۆزکان**: ئاڵۆزان، تێکهاڵان، ئاڵۆسکان. ف سردرگم شدن

**هاڵۆزکاو**: ئاڵۆزاو، ئاڵۆسکاو، تێکهاڵاو، ئاڵۆزکاو. ف سردرگم

**هاڵۆسکان**: ☜ هاڵۆزکان

**هاڵۆسکاو**: ☜ هاڵۆزکاو

**هاماج**: نێوان، مەودا، مەعبەین. ف میان

**هانا و بانا**: دیار و شاراوە، ئاشکرا و بزر. ف نهان و آشکار

**هانە**: (+) ئەنگێزە، دنەی ناوەکیی مرۆڤ. ف انگیزه

**هانە ڕەنگینە**: کۆلکەزێڕینە، کەسکاسۆر، پەلکەڕەنگینە ف رنگین کمان.

**هاوان**: شەونم، ئاونگ، خوناو. ف شبنم

**هاوپرسەکێ**: وتوویژ لەگەڵ دوو کەس، پرسیار کردن لە دوو کەس. ف مصاحبه با دو نفر

**هاوپەرە**: هاوبەرە، دوو کەس کە لە بەرێک بن. ف همجوار

**هاوکێشە کردن**: سەنگ و سووک کردنی دوو شت. هەڵسەنگاندن. ف معادله

**هاوکێشە**: دوو کەس کە گرفتارییەکیان هەبێ. *(هەر دووکمان هاوکێشەین.)* ف دو نفر که یک گرفتاری داشته باشند

**هاومێژ**: هاوچاخ، هاوچەرخ. ف هم‌عصر

**هاونشین**: هاودەم، هامدەم. *(شەوانە هاونشینی جام و بادەم/ بە بادە با پەژارە و خەم بە بادەم/ کە دەستی ڕۆژگار بایدا سەری من/ سەری شووشەی شەراب وا چاکە بادەم «هێمن».)* ف مونس، همدم

**هاووەوو**: هاوبووک، دوو بووکی ماڵێک کە خوشک بن. ف دوو خواهر که عروس یک خانواده باشند

**هاووەوی**: هەوێ، دووژنی پیاوێک. ف هوو

**هایلۆک**: کیفۆک، پیفۆک، پیفەڵۆک. ف گیاهی است با پیازەچەی خوردنی

**هرنگ**: وزە، تاقەت، توانا، هێز. ف رمق و توان

**هروو**: خوو، خدە، عادەت. ف عادت

**هریشت**: هێرش، پەلامار، شالاو، هەڵمەت. *(وەیەک هەریشت دەوری شارەکە گردن.)* ف حمله

**هلیت**: گیایەکە لەنێو گەرمەشانیدا دەڕوێ ئەگەر حەیوان بیخوا پێی دەمرێ، گاگلێنە. ف نام گیاهی است سمی که هر حیوانی بخورد می‌میرد

**هۆپدانەوە**: بادانەوە، گەڕانەوە، وەرسووڕان. ف برگشتن

**هوتاڤ**: تریفەی مانگ، شۆقی مانگ. ف مهتاب

**هۆڕاندن**: دەنگی ڕەشەوڵاخ. *(مانگاکان دەستیان*

*کرد بە هۆڕاندن.)* ف صدای گاو

**هۆڕژن:** دەنگی گریان، شەپۆر، *(لە هۆڕژنی گریانی دا.)* ف صدای بلند گریه

**هۆرمزە:** ورمزە، گۆزروان. ف گل گاوزبان

**هورمیس:** فرمێسک، ڕۆندک، ئەسرین، هێسر، ئەسر، ئەشک. ف سرشک

**هورووژم هێنان:** ورووژم هێنان، بە پۆل هەڵاتنە سەر شتێک. *(منداڵ هورووژمیان هێنا بۆ سەر سفرەکە.)* ف هجوم آوردن

**هۆرە گورگی:** گورگەزێ، باران و خۆرەتاو پێکەوە. ف باریدن باران به هنگام آفتاب

**هۆڕە:** دەنگی ڕشەوڵاخ. *(مانگا زەرد هەر هۆڕەی دێ.)* ف صدای گاو

**هورەبەلە:** ورەبەلەک، گیایەکی تاڵە لە مێکووک دەچێ بەڵام ئەم ڕەنگی سپیواشە. ف نام گیاهی تلخ

**هورەبەلەک:** ☜ هورەبەلە

**هورەتۆو:** خۆرەتاو، بەرڕۆژ، دژی نسێ. ف آفتابگیر

**هۆزی:** ) گایدەبە، گای یەختە نەکراو. *(وەک هۆزی ملی هەڵدێنێ و دەکەوێتە نێو گاران.)* ؛ ) بریتی لە پیاوی ڕووهەڵماڵدراو و تۆڵاز کە دایمە بەدوای ژنانەوەیە. ف ) گاو اخته نشده؛ ) مرد هیز و بی‌شرم

**هۆکەڵ:** بلیمەت، هەڵکەوتە. ف نابغه

**هۆگان:** (+) ئەو شوێنەی کە گایەکان یان تەراکتۆر دەگەڕێتەوە سەر خەت، ئەمسەر و ئەوسەری کووز، شوێنی هۆدانەوە لە جووتدا. ف محل دوباره برگشتن در شخم زدن

**هۆلاسەری:** ناوی کایەیەکی منداڵانەیە. ف نام یک بازی کودکان

**هۆلێن:** گۆلێن، تۆپێن، گەمەی بە تۆپ، یاریی تۆپی پێ. ف فوتبال

**هۆمەن:** هێرش، هەڵمەت، پەلامار، شاڵاو. ف یورش، حمله

**هوور:** (+) بیر، فکر، خەیاڵ. *(هووری کەس و کاری خوەی کێگ.)* ف یاد

**هوورنقیس:** مەرەکەب، جەوهەر. ف دوات

**هوورنقیسدان:** جەوهەردان. ف شیشه دوات

**هووڕووش:** گەنمی بە دەستاڕ لێکراو بۆ ساوەر. ف گندم خرد شده برای آش حلیم

**هووسەمل:** پیازە خووگانە، پیووازە خووگانە، گیایەکە بنەکەی وەک پیواز وایە. ف نام گیاهی است

**هووشاندن:** دەنگی مار کاتی توورە بوون. *(داری بە کونی مارەکەدا کرد هاتە دەرێ و دەستی کرد بە هووشاندن.)* ف صدای مار هنگامی که اذیت می‌شود

**هووشە:** دەنگی مار. *(مارەکە هەر هووشەی دەهات.)* ف صدای مار

**هووفە:** درۆی زل، زۆر گەورە نیشان دانی شتێک. ف اغراق

**هووک:** (+) شێت، دەلوو، لێوە، دین. ف دیوانه

**هووکدار:** ☜ هووکڵدار

**هووکڵ:** جندۆکە، ئەجندە، جنۆکە. *(هووکڵ خۆیان داگە نیشانی بۆیە هەوک بووگە.)* ف جن

**هووکڵدار**: شێت، کەسێک کە جندۆکەی لەگەڵە. ف دیوانە، جن‌زدە

**هووکن**: ☜ هووکدار

**هووڵە**: مڵە، جۆبرەک.ف آبدزدک

**هۆوی**: مالۆس، مێچکە بەراز، بەرازی مێو.ف گراز مادە

**هەباشە**: مەکینەیەکە گەنم و جۆ لە کایەکەی جیا دەکاتەوە.ف خرمنکوب.

**هەپلەگون**: بێ‌مێشک، کەم‌ئاوەز، ئەقڵ‌سووک.ف ابلە

**هەپلی‌هەپۆ**: بریتی لە مرۆی کاس و وڕ و تێنەگەیشتوو.ف کنایە از آدم بی‌ارادە و نفهم

**هەپوولک**: ئاڵەکۆک، هەپڵۆک، هەلاکۆک.ف گیاهی از تیرە شنگ

**هەتەل**: تەڵە، داو.ف دام تلە

**هەچان گرتن**: وچان دان، وچان گرتن.ف ایستادن برای خستگی درکردن

**هەچان**: وچان، حەسانەوە، ڕاوەستان. *(زۆر شەکەت بووین هەچانێ بەین خاسە.)* ف ایستادن و خستگی درکردن

**هەچی**: (+) دەزوو، مکارە.ف نخ

**هەدار هەدار**: ناوی کایەیەکی مندالانەیە.ف نام یک بازی کودکانە

**هەراڵ**: بەرەڵلا، خوێڕی و بێکارە. *(ڕاستە دەڵێن تێر و پڕی/ هەراڵیی پێوەیە و دڕی/ لاڕێ بڕۆی تۆ هەراڵی/ دوچاری تەڵەی خەیاڵی. «ڕاوچی».)* ف بیکارە و بی‌بند و بار

**هەردەپان**: گۆڕەپان، مەیان.ف میدان

**هەردیا**: حەزیا، هەژدیها.ف اژدها

**هەرزەدڕ**: چەنەوەر، چەقەسرۆ، هەڵەوەڕ، زۆربڵێ.ف وراج

**هەرشین**: ڕووخان، ڕمان.ف فرو ریختن آوار

**هەرمێ ڕەشە**: جۆرێک هەرمێی دەنک گەورەی پاییزییە.ف نوعی گلابی

**هەرمێ هەڵوا**: جۆرێک هەرمێیە تێخوڵەکەی سەوزە کاتێک دەگا ناوەوەی قاوەیی دەبێ وەک هەڵوا. ف نوعی گلابی

**هەرمێز**: شێواز.ف اسلوب

**هەرۆڵشە**: کەروێشک، خەروی، هەروێشە.ف خرگوش

**هەرۆنن**: زەڕاندنی گوێدرێژ، دەنگی کەر، زەڕە. ف عرعر خر

**هەرە**: خشتی لە سەریەک هەڵچندراوی کوورەخانە، فەنەر.ف فنر آجر

**هەرەژ**: هار، نەخۆشیی سەگ. *(سەگەکە هەرەژ بووە.)* ف هاری

**هەرەش**: ☜ هەرەژ

**هەرەمک**: نەزۆک، نەزا، *(مخابن ئەو ژنە باشە هەرەمکە.)* ف نازا

**هەرەمەکی**: هەوەنتە، لە گوترە خۆ پێدا کردن و بەپەلە چوونە پێشێ. *(هەروا هەرەمەکی درۆنە بەرەوە.)* ف الکی

**هەرەنگ**: هێز، وزە، قەوەت، ورە. *(هەرەنگ لە دڵم نەما.)* ف توان، نا

**هەرێ**: (+) هەمیشە، دایمە، یەڤا.ف همیشە

**هەریل**: جاو، خام، پارچەیەکە لە پەمۆ دەیتەنن.

ف پارچەی پنبەای.

**هەریل ئاوا:** گوندێک بووە لە هەورامان ئێستا نەماوە و دێیەکی دیکە بەناوی گۆشخان لە نزیکی دروست کراوە.ف نام روستایی ویران شده در اورامان

**هەرین:** ئەستێرە، هەسارە، ستێر.ف ستاره

**هەزار و دوولایی:** هەزار و یەکلایە، هاتووچۆی پێچەڵاوپووچ، پێچپێچ ڕۆیشتن. *(هەڵاتنەکەی زۆر سەیرە هەزار و دوولایی دەکا.)* ف دویدن بەطور زیگزاگ

**هەزوێ:** جاترە، نەعنای کێوی، هەزوە.ف آویشن

**هەژەندەر:** هەژێنەر، تەکاندەر، بزوێنەر.ف تکان‌دهنده

**هەستە دەمار:** ڕەگی ئەعساب.ف رگ اعصاب

**هەستێرۆک:** ئەستێرەی چکۆلە.ف ستاره کوچک

**هەسوونە زێڕینە:** کوڵکە زێڕینە، پەلکە ڕەنگینە، کەسکاسۆر، هانەڕەنگینە.ف رنگین‌کمان

**هەسیل:** حەسیر، هەسیرە.ف بوریا

**هەسێلبرە:** مڵە، جۆبرەک، ف آبدوزک

**هەسێنەزێڕینە:** هەسوونەزێڕینە، کەسکاسۆر، کۆڵکەزێڕینە.ف رنگین‌کمان

**هەسیو:** ئاوس، وەزگ کەوتن.ف باردار

**هەشار کیشایش:** ڕاکشان، تخێڵ بوون.ف دراز کشیدن

**هەشت گوڵ:** بە تەواوی گوڵ دانی گەنم. *(گەنمەکە جێی وایە گوڵی نەداوە، بەڵام جێی وایە هەشت گوڵ بووە.)* ف تمام خوشه شدن گندم

**هەشەنگ:** ☜ هەرەنگ

**هەشێنۆک:** کەوتوویی، گرانەتا، نۆبەتێ، کەفتەیی.ف تب شدید

**هەڤاڤ:** هێمن، لەسەرەخۆ، ئەهوەن، هێدی.ف آرام

**هەفتۆوە:** ئەفتاوە، لوولێنە.ف آفتابە

**هەڤەرە:** ڕۆژ، خۆر، هەتاو.ف خورشید

**هەڤەک:** ڕستە، دێر، خەت. *(نامەیەکا چار هەڤەکی ژبۆ هەڤالا خۆ نڤیسی.)* ف خط

**هەقدەس:** ☜ هەقدەست

**هەقدەست:** کرێ، مزە، هەقدەس.ف کارمزد

**هەقە پەڵە:** پەڵە باران لە نێوەڕاست مانگی پایزدا.ف باران در آبان ماه

**هەکڵ مەکڵ:** ناوی یارییەکی منداڵانەیە بەدەوری یەکەوە دادەنیشن و لاقیان ڕادەکێشن و لاقیان تێکەڵ دەکەن بە نۆرە قامک لەسەر هەموو لاقەکان دادەنێن و وەک بژاردن دەڵێن *(هەکڵ مەکڵ، کڵکافۆکێ/ زەرد و سوور و شەمامۆکێ/ مێخم کوتی مێخ هەڵبەزی/ تێکەی چەپم لەوەی گەزی.)* لەسەر لاقی هەرکەس شێعرەکە تەواو بێ نقورچکێکی توندی لێدەگرێ و دەبێ ئەو لاقەی هەڵکێشێتەوە.ف اسم یک بازی کودکانه

**هەگلە:** گابەرد، بەردی زل.ف سنگ بزرگ

**هەگەر:** (+) هۆ، بنۆس، ئەگەر، عیللەت.ف سبب

**هەڵئاوساو:** هەڵماساو، پەنەماو، هەڵماسیو.ف آماسیده

**هەڵاتنەوە:** شکانی دەسکی گۆزە و کتری و

کیتەڵە و ... *(دەسکی کترییەکە هەڵاتوتەوە.)* ف شکستن دستەی کتری و کوزە و ...

**هەڵاژان:** هەڵاژیان، ڕاکشان، ڕازان، تخێڵ بوون، ڕەهێڵ بوون، درێژ بوون. ف دراز کشیدن

**هەڵاڵەبرایمە:** هەڵاڵەبەرمە، شلێرە. ف لالە واژگون

**هەڵاڵەپرژێ:** هەڵاڵەپرژاندنی گوڵ. ف گردافشانی گل

**هەڵامات:** هەڵمەت، هۆمەن، هێرش. *(هەڵامات بردن و قوڵبەس کردنیان.)* ف حمله

**هەڵاویل:** جانەوەرێکە وەک سمۆرە دەچێ کلکی وەک کەوچک وایە، کاتێک هەست بە مەترسی دەکا و دوژمن لێی نزیک دەبێتەوە میز دەکاتە کلکییەوە و فڕێی دەدا. لە هەرکەس کەوێ دەیکوژێ ڕەنگە ژەهری هەلاهەل و هەلاهیل و هەلایل هەر ئەوە بێ. ف نام جانوری سمی است

**هەڵبڕدابڕ:** هەڵبڕهەڵبڕ، هەڵبڕین و ماندوو کردن و لێک هەڵاواردن، ڕەپێ کەوتن و هەڵسووڕاندن. *(هەڵبڕدابڕیان بە جاشەکان خستبوو.)* ف دنبال کردن و خسته کردن و از هم جدا کردن

**هەڵبڕینەوە:** تیژ کردنەوەی ددانی مشار. *(مشارەکە کول بووە بیبە بۆ وەستا با بۆمان هەڵبڕێتەوە.)* ف دوباره تیز کردن دندانەی اره

**هەڵبەجوون:** ناوی یارییەکی منداڵانەیە بە حەلوا کردن دەڕۆن. ف نام بازی کودکان

**هەڵپرووقان:** هەڵپرووکان، ژاکان و هەڵوەرین. ف پژمردن

**هەڵپرووقاو:** ژاکاو، هەڵپرووکاو. ف پژمرده

**هەڵپزان:** با کردن و ماسین. زگ هەستان. *(هەر دەخۆن و هەڵدەپزێن.)* ف باد کردن

**هەڵپلان:** تێکوەردان، ئاوێتە کردن. ف آمیختە کردن

**هەڵترۆپاندن:** تۆپاندن. ف کشتن حیوان حرام گوشت

**هەڵترۆپاو:** تۆپیو، تۆپاو. ف مردن حیوان حرام گوشت

**هەڵترۆپین:** تۆپین، تۆپان، مردنی گیانلەبەری حەرام گۆشت. ف مردن حیوان حرام گوشت

**هەڵتۆزانەوە:** کزانەوە، چووزانەوەی برین. ف سوزش زخم

**هەڵچۆڕ:** لاراو، دژاو، زەوییەک کە ئاو ڕاناگرێ و کاتێک ئاوی لێ ئاژین دەکەن، دڕدڕ دەبێ و ئاوەکە هەڵنامژێ. ف زمینی کە ناهموار است و آب نمی‌خورد

**هەڵچوو پاچوو:** ناڕێک و بێسەرەوبەرە. *(هەڵچوو پاچوو کارەگە کردی.)* ف بی نظمی در کار

**هەڵخوشان:** ☜ هەڵخوشین

**هەڵخوشین:** داماڵکان، داماڵدران، *(هەرچی بەنەکەی تێدەهاڵێنم هەر هەڵدەخوشێ.)* ف سر خوردن نخ روی چوب

**هەڵخە:** (+) جۆرێک هەڵپەڕکێی کوردییە هەر لە جێوە هەڵدەخەنەوە. ف نوعی رقص کردی

**هەڵزەپەتان:** هەڵزیپان، پەنەمین، با کردن، ماسین. ف آماسیدن

**هەڵزەقانەوە**: هەڵزەقینەوە، هەڵبەزینەوە لە ترس و لە نەکاو.ف یکه خوردن

**هەڵژڤین**: داچڵەکین، داترووسکان، ڕاچەنین.ف یکه خوردن

**هەڵژێنین**: تیٚهەڵکێشان. *(قەندەکەی لە چایی هەڵدەژێنیٚ.)* ف آب کشیدن

**هەڵسلەماندنەوە**: سڵەماندنەوە، ڕەو پیٚکردن.ف رم دادن

**هەڵسلەمینەوە**: سڵەمینەوە، ڕەو کردن.ف رم کردن

**هەڵسووکەوت**: هەستان و دانیشتن. *(لەگەڵ چاک و خراپ هەڵسووکەوت دەکا.)* ف نشست و برخاست

**هەلک**: هەناسە، پشوو. (هەلکی بڕیا.) ف نفس

**هەلک بڕیان**: هەناسە لیٚبڕان، بریتی لە ماندوو بوونی زۆر.ف از نفس افتادن

**هەڵکردنەوە**: ) هەڵوێزانن، ماشەرە بەن هەڵکرنەوە و کردنی بە گوڵوڵە. *(ئەو ماشەرە بەنەم بۆ هەڵکەوە.)* ؛ ) دیسان هەڵکردنەوەی چرا و ... *(چراکە هەڵکەوە تاریکە.)* ف) گلوله کردن نخ؛ ) دوباره روشن کردن چراغ و ...

**هەڵلاجۆ**: جۆلانیٚ، هەلۆرتک، دیلانیٚ، دنگلاڤ.ف تاب

**هەڵم**: تاقەت، توانا، زیاتر بۆ تاژی دەگوتریٚ. *(تاژییەکەمان لە ڕاودا زۆر بە هەڵمە.)* ف رمق، توانایی

**هەڵمەقووت**: ) قووتدانی خۆراک بە گەرمی، حەپەنۆش. *(نەیهێشت سارد بێتەوە و هەر بە گەرمی هەڵمەقووتی کرد.)* ؛ ) کنایە لە خواردنی شتی حەرام بە ئاسانی. *(حەرام و حەڵاڵ نازانیٚ وەک گەزۆ و مازوو هەڵمەقووتی کرد.)* ف هورت کشیدن غذای گرم باعجله؛ ) خوردن مال حرام بدون مهابا

**هەڵوارتە**: هەڵبژێردراو، هەڵبژاردە.ف استثناء

**هەڵۆک**: لانکە، بێشکە.ف گهواره

**هەڵۆڵگ**: ☜ هەڵۆک

**هەلومەرج**: بارودۆخ.ف موقعیت

**هەڵون**: هەڵووکێن، حەڵلو، چۆحەڵین.ف الکدولک

**هەڵەپڕووکیٚ**: پەلە و عەجەلە لە کاردا. *(کارەکەیان بە هەڵەپڕووکیٚ تەواو کرد.)* ف عجله کردن در کار

**هەڵەپڵە**: پەلە و عەجەلە، لەز، تاڵووکە. *(وە هەڵەپڵە لەولاوە هاتەوە.)* ف عجله

**هەڵەکە سەما**: (+) سەما کردن و شادی و هەڵبەزدابەز لە خۆشیانا. *(لە خۆشیانا کەوتبوونە هەڵەکە سەما.)* ف رقص و پایکوبی و شادی

**هەڵێک مەڵێک**: هیچ و پووچ، سووکوچرووک، سەڵیتەی بەرەڵڵا و بەدەست هەمووکەسەوە. *(پیرێژنەکەی هەڵێک مەڵێک / هەر دوو لینگانت دەگرم پێک/ هەر دوو کونانت دەکەم بە یێک/ میری بەبە سەلامەڵێک «عەلی بەردەشانی».)* ف روسپی هرجایی

**هەڵەوپەڵە**: هەڵە و چەوتی لە نووسین و کاردا *(پێم خۆشە هەڵەوپەڵەم بۆ ڕاست کەنەوە)* .ف غلط، اشتباه

**هەماس**: لەسەرەخۆ، هێمن، هێدی.ف آرام

**هەمبیەر**: شەریک.ف شریک

**هەمتەر**: هەمتی، دیسان، هەمیسان، سەرلەنوێ. ف دوباره

**هەمدا**: هاوتەمەن، هاوساڵ.ف همسال

**هەمدەس**: هەرەوەز، کار کردنی چەند کەس پێکەوە بۆ تەواو کردنی کارێک. *(چوار ماڵین دەبینە هەمدەس و دروێنەی هەر چوار ماڵەکە تەواو دەکەین.)* ف همکاری کردن چند کس برای زود پایان دادن کارها

**هەمریش**: ئاوەڵزاوا، هاوزاوا.ف باجناق

**هەمزاغایی**: ناوی تیرەیەک لە هۆزی مامەش.ف نام طایفه‌ای از ایل مامش

**هەمکوڕ**: دەستەبرا، هەڤاڵ، ڕەفیق، هاوڕێ.ف دوست، رفیق

**هەمڵ**: فەرز، گریمان، دانان بە گومان. *(وا هەمڵ کەین هەر نەبووگە.)* ف فرضیه

**هەمن**: قەمتەرە، پەتێکە ڕەشماڵی لە چوار لاوە پێ قایم دەکرێ. *(سەری هەمنەکان بەو هەیانەوە ببەستە.)* ف طناب چادر و خیمه

**هەمەکی**: گشتی.ف کلی

**هەنارۆک**: نارنجەک، قۆمبەلە.ف نارنجک

**هەنارەس**: بە هاناوە چوون، فریارەس، فریای کەسێک کەوتن.ف فریادرس

**هەناسە کوڕی**: هەناسەبڕکێ، هاسکە هاسک.ف نفس‌تنگی

**هەناسەڕەش**: بەغیل، نەفس‌پیس، حەسوود، چاوپیس.ف حسود، بدنفوس

**هەنتن**: کوتان، دەرزی وەشاندن.ف تزریق کردن

**هەنجراو**: شیکراوە، ڕیشاڵ ڕیشاڵ کراو.ف پارچه ریش ریش شده

**هەندەر**: (+) ) حاند، حاست، پەنا ) هەنتەش، حوزوور *(نەهەنراوە دەسی شیعرم لە هەندەرتا گلەی ناوێ/ سروشتی شاعیری وایە دەبێ هەستی نەهەنرابێ «راوچی»)* .ف ) در برابر، نزدیک ) حضور

**هەندەران**: (+) دەرەتان، ڕێی دەرباز بوون لە سەختی و خەفەت. *(لە تاوانا هەندەرانی نەبوو.)* حەجمان، ئارا و قارا.ف طاقت، راه گریز

**هەندەکی**: لانیکەم.ف جزئی

**هەنران**: هەدادان، سرەوتن، *(نەهەنراوە دەسی شێعرم لە هەندەرتا گلەی ناوێ/ سروشتی شاعیری وایە دەبێ دەستی نەهەنرا بێ. «راوچی».)* ف آرام گرفتن

**هەنگژان**: ) تێهاڵان، تێورووکان؛ ) هارووژان، وروژان. *(مناڵەیل لە مەیانەکە هەنگژان.)* ؛ف ) دور چیزی گرفتن. ) به هیجان آمدن

**هەنگە ڕەشە**: جۆرێک هەنگی باریک و درێژە ڕەنگی ڕەشە، شەمەتریکە.ف زنبورسیاه

**هەنگەژاڵە**: (+) زەرگەتە، زەردەواڵە.ف موسه

**هەنگەمە**: هەرا و هۆریا، زەنازەنا، هەڵڵاوبگر. *(بوو بە هەنگەمەیەک سەگ ساحەبی خۆی نەدەناسی.)* ف جنجال و سروصدا

**هەنگێز**: قەوە، هێز، وزە.ف نیرو

**هەنگێزدان**: قەوە لێدان، هێز لێدان. *(هەنگێزی*

*قۆڵیانـدا و بـەدوای خۆیانـدا ڕایانکێشا.)* ف قـوت زدن

**هەنوودان**: تیف تیفەدان، ساف و سووف کردن. *(ڕیشی وا هەنوو داوە کێچ بووکسەواتی لێدەکا.)* ف کنایه از تراشیدن ریش و آرایش زیاد

**هەنیهـەنی**: هـەلاهـەلا، داوەشـاو. ف لە و از هـم پاشیده

**هەنییەکۆڵە**: شووتیی چکۆڵە و بێ ئاو، شووتیی دێمەکار. ف هندوانەی دیمی

**هـەواکێش**: خـەفـەنگ، دەربیجـە یـان کولاوکـەی چکۆڵـە لـە ماڵـدا بۆئـەوەی هـەوای پێـدا بێتـە ژووری. ف هواکش

**هـەواڵنێـر**: خـەبـەرنێـر، کـەسـێک کـە هـەواڵ و خەبـەر بۆ گۆڤار و ڕۆژنامـە و رادیۆ و تـیڤی کۆ دەکاتەوە و بەڕێی دەکا. ف خبرنگار

**هەوروهێڵ**: هەور و هەڵا. ف ابری

**هەوروساو**: جۆرێک لـەچکەی ژنانـە *(شنـەی با کاتێ لەچکەی هـەوروساوی لادەدا، دەرژێ/ لـە تاسەی هەڵمژینـی بۆی وەنـەوشـەی پـەرچـەمـی ئـەشـکم «ئـەمـین گـەردیگلانـی»)* . ف روسـری ابروباد

**هـەورین**: برینـگ، مـەقـەسـتی مـەڕ بڕینـەوە. ف دوکارد

**هەوکە**: هەنووکە، نهۆ، هێشتا. ف هنوز

**هەوەجە**: حەوجە، نیاز، ئاتاج، حەوج، ف احتیاج

**هـەوەنتـە**: (+) بـەلاش، خـۆڕایی، مفتـە. ف مفت، رایگان

**هەوەنتەخۆر**: مفتەخۆر. ف مفتخور

**هـەوهـەوە**: نـاوی مـەلێکـە. *(هاتـەوە، هاتـەوە، تـەیـرەکـەی لـە گـەرمێنـێ، بـەو تـەیـرەم دەڵـێن هـەوهـەوە/ تیژباڵی خۆی لێکدەداوە/ نیشت لـە مەزراکەی یەکشەوە/ باز و پۆڕ پۆلیان بەستووە/ سـەر سـەوزێکیان پێشرەوە «فولکلۆر».)* ف نـام پرندەای است

**هـەوێژ**: هـاودەنـگ، هـاواڵ، هـاودەم. ف مـونس، همدم

**هەوێق**: حەوێق، تەشق، پەڕپەڕۆچکە، بەرزایی ئاسمان. ف اوج

**هەوێڵ**: لەبەرچاو، لەبەردەست، *(دەستم گیرابوو بە کارەوە، کەسیش لە هەوێڵدا نەبوو بینێرم بە دواتدا.)* ف دسترسی

**هەوێنی نۆ مـەنجـەڵ شـیر**: بریتی لـە زۆرزان و فێڵـەبـاز، کـەسـێک کـە نـاتوانی سـەر لـە کـاری دەرهێنی. ف کنایه از آدم مرموز

**هەیشت**: کەڵەگا، سەربزێو، یاخی، شەقی. *(مێندە دانە دەمیەو هەیشت بووگە.)* ف یاغی

**هەیقی**: (+) حەزیا، هەژدیها، هەردیا. ف اژدها

**هـەیکـەڵ**: نـاوی خـەریتـەیـەکی فـەرشـە. ف نـام نقشەی قالی است

**هــەیــە**: (+) ســینگی دارینــی خێــوەت، ســینگی ڕەشماڵ. *(خێوەتێکیان هـەڵداوە چل هـەیەی بۆ داکوتراوە.)* ف میخ چوبی

**هیال هیال**: دەربەدەر، ئاوارە، ئاراگێڵ، وێڵوێڵ. ف سرگردان

**هێدم گرتن**: سـەرسـام بـوون، حـەپـەسـان، واق وڕمان. *(چاوی بەو دیمەنە کەوت هـەتا ماوەیەک*

هێدم گرتی.) ف متحیر شدن

**هیـرز:** فریـزوو، فـرووزوو، فـرس، گیایـەکـی هەرزەیە ڕیشەکەی زۆر درێژە و لەنێو بێستان و وێنجە و ... دا دەڕوێ و وشکی دەکا.ف گیاه هرز

**هێرەق و نێڵـە:** یـەرەق و نێڵـە، هێڵـە قوونێرە.ف خیش و یوغ

**هیـزار:** شـتێکی دەسـت درووی وەک کۆچکـە و لـەچکـەیـە ژنـان لـە ملـی دەکـەن، زیـاتر لـەنێـو عەشیرەتی مـەنگوڕ بۆ جوانی لە ملی دەکەن. *سەیری کوردستانی چۆڵ کەم، یا تەمی کوێستانی دڵ/ داخی دووریی تۆ بچێژم، یا خـەمـی هیزار لـە مل؟ «هێدی».)* ف نوعی لچک دستباف

**هیـستۆک:** داگیـر کـراو، زەوت کـراو، دەسـت بـەسـەردا گیـراو. *(ئیرلـەنـد لـەلایـەن بریتانیـاوە هیستۆک کرابوو.)* ف مستعمره

**هێسی:** ئاسۆ، سوێ، سۆ.ف افق

**هێشخان:** پەسیو، خەڵوەتی، کولێن.ف پستو

**هیشک بوون:** ) لەبەر ترس جووڵە لێبڕان، *(لە هێوەتـا لـەجـای خـۆمم هیـشک بـیم.)* ؛ ) وشـک هـەڵگـەڕان، ژاکـان.ف ) از تـرس خـشک زدن؛ ) خشکیدن

**هیشک و برینگ:** وشک و برینگ، تـەواو وشک. ف تمام خشک

**هیشکە:** ) بریتی لە ئاژەڵێک کە نـەزابێت و شیر بدا، ویشکە، کۆنـدۆ؛ ) پارەی خەوتوو لە ماڵدا، *(چەندەت هیشکە لەو سندووقە ناوە.)* ف ) حیوانی کە بچە نیاوردە، ولـی شـیر مـی‌دهـد؛ ) پول نقد در خانه

**هیشک هەڵاتن:** ) وشک بـوونی گیـا و گژ و دار و گوڵ. *(دارەکان لەخۆڕا هیشک هـەڵاتـن.)* ؛ ) کز بـوون لـەبـەر خـەم و کـەسـەر، لاواز بـوون. *(هێنـدەی خـەم خـواردووە هیـشک هـەڵاتـووە.)* ف ) پژمرده شدن؛ ) لاغر و نحیف شدن

**هیـشک هـەڵگـەڕان:** ویـشک هـەڵاتـن، ویـشک بوونەوە، ☜ هیشک هەڵاتن

**هیشک هەڵێنان:** ) وشک کردن؛ ) خەمبار کردنی کەسێک و لاواز بـوونی بـەو هۆیـەوە. *(هێنـدەی خەم پێداوە هیشکی هـەڵێنـاوە.)* ف ) خشکاندن؛ ) اندوهگین کردن کسی

**هیشکاتی:** وشکانی، ئیشکانی.ف خشکی

**هیشکارۆ:** بیابانی بێ ئاو، بێروون.ف کویر

**هیشکاو:** وشـکاو، ئیشکاو. *(جۆگـەکـە هیـشکاوی هات.)* ف خشکیدن

**هیشکاوز:** تۆوی بـە وشـکییەوە کـراو بـەهیـوای باران، خەفتان.ف کاشتن قبل از باران

**هیشکاوس:** ☜ هیشکاوز

**هیشکەبار:** میـوەی وشـک و کـراو وەک گـوێز و بادام و قەیسییە وشکە و مێوژ و کشمیش و ... ف خشکبار

**هیشکە بەرد:** وشکەچن، وشکە کەڵەک، دیـواری بە بەرد هەڵچندراوی بێ قوڕ.ف دیوار سنگی.

**هیـشکە بیـر:** وشـکە بیـر، چاڵاوێـک کـە تـەنیـا بـەهـاران ئـاوی تێدایـە و زوو وشـک دەکـات.ف چاهی کە تنها در فصل بهار آب دارد

**هیشکە بیرۆ:** وشکە بیرۆ، نەخۆشـییەکی پێستە

به تۆقەن وشک دەبێ و تویخ هەڵدەدا.ف قارچ پوستی

**هیشکه پڵاو**: برنجێ که ڕۆنی تێنەکرابێ، چلاو. ف چلو

**هیشکەچن**: ☜ هیشکه بەرد

**هیشکه خڕ**: ☜ هیشکه شیو

**هیشکه داوه ت**: هەڵپەرکێ که ژنی تێدا نەبێ، هەڵپەرکێی بێ دۆ.ف رقص گروهی مردانه

**هیشکه دۆ**: ☜ ویشکه دۆ

**هیشکەڕن**: ) ڕنینەوەی موو لە کەوڵی ئاژەڵ بێئەوەی هەڵاڵی لێدرابێ؛ ) گاڵتەجاڕی و گەمەی تەنافباز.ف) چیدن کرک از پوست حیوان؛ ) دلقکبازی و سیرک

**هیشکەڕۆ**: ) یەکسمی فێره ڕەوت نەکراو، یەکسمی نەگیراو. *(جوانووەکەیان هیشکەڕۆیه هێشتا نەگیراوه.)* ؛ ) چۆمێک که هاوینان وشک دەکا.ف) کرەی تعلیم ندیده؛ ) رودخانەای که در تابستان میخشکد

**هیشکەڕێ**: ڕێگای هەڵەموت و سەخت و بەردەڵان. راه سنگلاخ و ناهموار

**هیشکه ساڵ**: ساڵی کەم باران، وشکەساڵ.ف خشک سال

**هیشکەسۆ**: ویشکەسوێ، زەویی قەڵشت قەڵشت و تینوو.ف زمین خشک ترکخورده.

**هیشکه سۆفی**: خودا خوازی هیچ نەزان. وشکه سۆفی.ف زاهد ابله

**هیشکه سەرما**: سەرمای سەختی بێ بەفر و باران.ف سرمای شدید بدون بارش

**هیشکه شیو**: دۆڵ و شیوی بێ ئاو، ویشکه شیو، ویشکه خڕ.ف دەری بی آب

**هیشکه کەڵەک**: ☜ هیشکەچن

**هیشکەڵ**: چڕ و چیلکە، لق و چڵی وشک بۆ سووتاندن، ئاوردوو، هێزنگ، ئێزنگ.ف هیزم، هیمه

**هیشکەمز**: کرێی نەغد بۆ کرێکار و ڕەنجبەر و شوان بێئەوەی نان و خۆراکی پێبدرێ. *(بە هیشکەمز شوانی گرتووه ژەمەکان دەچێتەوه ماڵی خۆی.)* ف کارگر یا چوپانی که تنها مزد خود را میگیرد و در خانه خود غذا میخورد

**هیشکه وەرد**: هیشکاوز، هیشکاوس، وشکه وەرد، وشکه کەند، ویشکه کێل، خەفتان.ف کاشتن قبل از باران

**هیشکه هەڵوا**: ☜ ویشکه هەڵوا

**هیڤرزه**: قەرەباڵغ، پڕایی خەڵک و هەرا هەرا. قەرەبارغ.ف جنجال و هیاهو

**هێقه**: یەخه، یێخه، پێسیر.ف یقه.

**هێلانه له چاودا کردن**: لەبەرچاو لانەچوون و زۆر بۆ هێنان، بریتی لە مزاحیم بوونی زۆر. *(ئەو هەتیوه بەینێکه هێلانەی له چاودا کردووین.)* ف کنایه از مزاحمت زیاد

**هێلکۆکه**: تۆوی ژن.ف تخمک زن

**هێلکه دۆڕین**: مریشکێک که له کولانەکەی خۆیدا هێلکه ناکا و لەملا و ئەولا هێلکەکەی دەکا و خاوەنەکەی نایبینێتەوه.ف مرغی که در لانەی خود تخم نمیگذارد

**هێلکه گون**: ☜ یەلکه گون

**هیلکەکەر**: ڕیاییباز، ماستاوکەر، تەشیڕێس.ف متملق

**هێلوون**: (+) قوولکەی چاو.ف حدقه

**هیلوین**: هێلوون، هێلانە.ف آشیان

**هێڵە**: (+) نێڵە، کڵپەی ئاور.ف زبانەی آتش

**هیلەت**: حیله، فێڵ، دەهۆ.ف حیله، مکر

**هیلەتباز**: فێڵەباز، تەڵەکەباز.ف حیلەگر

**هێلەک**: پەستەک، جلیسقە.ف جلیقه

**هێلەکە**: پەستەک، فەرەنجی، هێلەگ.ف جلیقه نمدی

**هێڵی کەمەری**: کەمەربەندی ناوەڕاستی گۆی زەوی.ف خط استوا

**هێلێنک**: هێلانە، لانە.ف آشیان

**هێلینگە**: داشقە، عارەبانە.ف گاری

**هێمێ**: (+) نێوان، مەودا، بەین.ف میان، فاصله

**هێنان**: بۆ نرخ دەگوترێ، شیان، ژیان. *(ئەو ماشێنە چەند ملوێن دەهێنێ.)* ، *(ئەو ماشێنە چەند ملوێن دەژێ.)* ف ارزش

**هیوا بەخۆ**: کەسێک کە بەخۆی دەنازێ و پێیوایە هەموو کارێکی لەدەست دێ.ف کسی که بەخود میبالد

**هیوابڕاو**: ناهومێد بوو، ناهمێ. *(لپەڕی زەردەی هومێدی ڕاپەڕ و هیوابڕاوم من/ مەلی ئەستۆ شکاوی جێ شکارم یا ڕەسوولەڵڵا «ڕاوچی».)* ف نومید

**هیوابڕین**: (+) ناهۆمێد کردن.ف نومید کردن

**هێوران**: دامەزران، سرەوتن، ئۆقرە گرتن. *(ئەوەندە بزۆزن لە هیچ کوێیەک ناهێورێن.)* ف آرام گرفتن

**هێورزە**: ) دەم ویشک بوون لەبەر تینوێتیی زۆر، سیوشکە. *(خەریکم لە تینووانا هێورزە دەبم.)* ؛ ) قەرەباڵغ، حەشامەتی زۆر.ف ) عطش؛ ) جمعیت زیاد

**هێوەت**: حەیبەت، سام، ترس.ف هیبت



**یارسان**: مەزهەبی ئەهلی هەق. ف مذهب اهل حق

**یازوق**: یازوخ، حەیف، مخابن. ف دریغ

**یاکەند**: یاقووت، بەردێکی بە نرخە. ف یاقوت

**یانجوون**: ☜ خۆشهەڵکێشە

**یاندووز**: گیایەکە لە تاڵوو دەچێ. ف نام گیاهی است

**یانیگر**: سەگی دڕ، سەگێک کە پەلاماری مرۆڤ دەدا و گازی لێدەگرێ، بێگانەگر. ف سگ گازگیر

**یاهی**: ئاکام، کۆتایی. ف پایان

**یونجە**: هاڕیە، کەلووەسمە، کرمێکی سەوزە نۆک دەخوا. ف کرم آفت نخود

**یەخانگیر**: یەخەگیر، دەست بە یەخە. *(لەسەر پردەکە یەخانگیر بوون و بە کەس لێک نەدەبوونەوە.)* ف گریبانگیر

**یەرخرمە**: باقە، باغە، باوەشە گیای بەستراو. ف بستە گیاە

**یەزنە**: جێژن، جەژن. ف جشن

**یەستر**: ئێستر، هێستر، قانتر. ف قاطر

**یەسقان**: ئێسقان، یەسک، سۆقان، پێشە، هەستی، هەستوو، ئێسک. ف استخوان

**یەسیر**: (+) سێوی، منداڵی دایک مردوو. ف بچە مادر مردە

**یەشوو**: هێشوو، زەنگەتە، بۆڵ، تلۆوتەک. ف خوشەی انگور

**یەغنە**: یەغنی، تایە گیا و گەنم، گیشە، قۆری، قەڵاتە. ف تودەی انباشتە شدەی علف و گندم درو شدە

**یەڤا**: هەمیشە، هەرێ، دایمە. ف همیشە

**یەڤە**: کات، وەخت. ف هنگام

**یەڤەن**: جوان، دەلال، بەدەو. ف زیبا

**یەکاندەردوو**: یەکەونەردوو، کتوپڕ، دەمودەست، لەڕێوە. ف فوری

**یەکانگیر**: یەکدیگر، پێکەوە نووساو، تێکەڵ یەک بوون. *(لەو شوێنەی هەر دوو چۆمەکە یەکانگیر دەبن، ئەو جووتە پێکەوە یەکانگیر بوون.)* ف بەهم پیوستن

**یەکدیگر:** ☜ یەکانگیر

**یەکڕوو بوونەوە:** ددان سپی بوونەوە، شەرم و شکۆ و حورمەت لەنێواندا نەمان و شەڕە قسە کردن لەگەڵ یەکتر. *(تازە وا یەکڕوو بوونەوە شەرم لە یەکتر ناکەن.)* ف در میان نماندن احترام و دوستی

**یەکرەویلکە:** باریکەڵە، لەڕ و لاواز، داڵگۆشت، بەلە باریکە، *(پیاوێکی یەکرەویلکەیە لووتی بگری گیانی دەردەچێ.)* ف لاغر

**یەکمل:** سەرسەخت، کەللەڕەق، خیشەسەر. ف سرسخت، خیرەسر

**یەکملی:** کەللەڕەقی، سەرسەختی، خیشەسەری. ف خیرە سری، سرسختی

**یەکەڵە گوان:** پەز یان بزنێک کە تەنیا گوانێکی هەیە. ف بز یا گوسفندی کە یک پستان دارد

**یەکەڵە گون:** جوانەگایەک کە تەنیا هێلکە گونێکی هەیە. ف گاو نری کە یک خایە دارد

**یەکەونەدوو:** یەکەونەردوو، دەمودەست، خێرا، یەکاندەردوو. ف فوری

**یەکەونەردوو:** ☜ یەکاندەردوو

**یەکیەتی:** ناوی هەڵپەڕکێیەکی کوردییە. ف نام یک رقص کردی.

**یەڵخی یەڵخی:** وێڵوێڵ، هیال هیال، سەڵت و سپادە سووڕانەوە. ف یلە و سرگردان گشتن

**یەلکە:** هێلکە، هێک، خا. ف تخم پرندە

**یەلکەکەر:** مەرایی‌کەر، ریاییباز، تەشیڕێس، ماستاوکەر. ف متملق

**یەلکە گون:** دوو خڕەکەی نێو گوندێنی نێرینە، خا. ف خایە

**یەوەرە:** داڵگۆشت، لەڕ، کز، ڕیوەڵە، لاواز. ف لاغر

**ییختیار:** بە ساڵاچوو، ئیختیار، زورهان، پیرەپیاو. *(حاجی پیاوێکی ییختیارە و زۆر بە ئەزموونە.)* ف سالخوردە، مسن

بەرهەمە بڵاوکراوەکانی نووسەر:

١. "**تاپۆی وەرزێکی سەوز**"، شیعر ١٩٩٧ تەورێز
٢. "**شەوەژانی ئەستێرەیەک**"، شیعر، ٢٠٠٠ تاران
٣. "**مەرگەخەون**"، شیعر، ٢٠٠٣ تاران
٤. "**دیسان لەو شەقامانەوە**"، چیرۆکی بیژەن نەجدی (وەرگێڕان) ٢٠٠٥ هەولێر
٥. "**تەپڵی ئاور**"، چیرۆکی بیانی (وەرگێڕان) ٢٠٠٥ هەولێر
٦."**جێگای بەتاڵی سلووچ**"، ڕۆمانی مەحموود دەوڵەت ئابادی (وەرگێڕان) ، ٢٠٠٦ هەولیر
٧. **خۆرولاولاو** ، شیعری منداڵان ٢٠٠٦ بۆکان
٨. **یەکگرتن** ، چیرۆکی منداڵان « قودسی قازی نوور» (وەرگێڕان) ، ٢٠٠٦ هەولێر
٩. "**برایانی کارامازۆف**"، ڕۆمانی فیودۆر داستاییفسکی، (وەرگێڕان) ٢٠٠٧ هەولێر

ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:
١. "**نارنجی فڕین**" کۆچیرۆک
٢. "**خولیای نووسین**" کۆمەڵە وتار (وەرگێڕان)
**٣. "تازیەبارانی بەیەل"** ڕۆمانی غوڵامحوسێن ساعیدی، (وەرگێڕان)

..........................................................................

سپاس بۆ کاک ***محەممەدئەمین شاسەنەم*** و ***مریەم شاسەنەم*** کە بۆ پیتچنی و ڕێکوپێک کردنی ئەم فەرهەنگە زۆریان زەحمەت کێشا، دڵنیام ئەگەر دڵ گەورەیی و ڕۆحسووکیی ئەوان نەبوایە ئەم بەرهەمە ڕووناکیی نەدەدی.
ئەمین گەردیگلانی